

شێخ سەعید شاکەلی

# ژیلەمۆی گەرمیان

## بیرەوەریی پارتیزانەکانی پاش ئەنفال

پێداچوونەوەی

لاوان ئەحمەد


منتدى إقرأ الثقافي

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٦٤٩)



شێخ سەعید شاکەلی

# ژیلەمۆی گەرمیان

## بیرەوەریی پارتیزانەکانی پاش ئەنفال

پێداچوونەوەی
**لاوان ئەحمەد**

**بەرگی پێنجەم**

سلێمانی- ٢٠٠٩

# ژیلەمۆی گەرمیان (بەرگی پێنجەم )

بابەت : بیرەوەریی پارتیزانەکانی پاش ئەنفال

نووسەر : شێخ سەعید شاکەلی

پێداچوونەوە: لاوان ئەحمەد

تایپ و هەڵەچن : لاوان ئەحمەد

نەخشەسازی: مەهدی ئەحمەد

دیزانی بەرگ : لاوان ئەحمەد

سەرپەرشتیاری چاپ: کەنعان خەلیل

تیراژ: ٧٥٠ دانە

ژمارەی سپاردن (١١٥٧) ساڵی (٢٠٠٩) وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

چاپ: چاپی یەکەم – سلێمانی ٢٠٠٩ – چاپخانەی شڤان

ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی- گردی ئەندازیاران، ١٠٥ کۆڵانی، ٣٤ ژمارەی خانوو، ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

((نەتەوەیەك كە زمانی خۆی بەباشی بزانێ و ئەگەر رۆژێكیش بێت و دیلی نەتەوەیەكی تربێ ، وەك ئەسیرێك وایە كە شاكلیلی بەندیخانەكەی لەگیرفان دا بێ و هەركات دەتوانێ لە بەندیخانەكە بێتە دەر ))

**ئەلفۆنس دودە**

## ئەم کتێبە پێشکەشە بە

هەموو ئەوانەی داری ئازادیان چاند ، و

لەرێگەی ئەودا گیانیان بەخشی .

## پێشەکی :

# گەڕان بەدوای پێشەکییەکدا

حەز دەکەم لە پێشەکی ئەم بەرگەشدا ( بەرگی پێنجەم) ئەوە بێنمەوە یاد، کە برای بەڕێزم شێخ سەعید شاکەلی ،سەرەتا شیعری دەنووسی ، و جاربەجار کۆپلە شیعرێکی بە نووسین ، یا بە خوێندنەوە دەخستە ڕوو. داوای دەکرد پێی بڵێم کەمن چەند شیعرییەت لەو شیعرەدا بەدی دەکەم و ئایا شیعرێکی سەرکەوتووە ؟. یا کۆمەڵێ وشەیەو نەبووە بە شیعر ...

دوای چەندین ئەزموونی لەم جۆرە ، هەستم کرد ئەزموونە شیعرییەکانی هاوچەرخانە نییە،و هانم دا بیرەوەرییەکانی خۆی بنووسێ ،وئیتر پێشنیارەکەمی پەسەند کردو کەوتە نووسینی بیرەوەرییەکانی .

شێخ سەعید توانی لەو بەشانەی دی بیرەوەرییەکانیدا هەموو چرکە ساتە تفت و شیرینەکانی بازنەی گەرمیان بە کامێرای وشە بەرجەستە بکات. ڕەنگە ئەوانەی کە هاوچەرخی شێخ سەعید شاکەلین و کارەکتەرێکی زیندووی ئەو کارەساتانەن کە بەسەر ناوچەکەدا تێپەڕیوە بڵێن ئێمە خۆمان لەناو و لەتەك ئەم بیرەوەرییانەدا ژیاوین و بەگوێرەی پێویست سەرنجیان ڕانەکێشێ ،بەڵام بایەخی ئەم جۆرە بیرەوەرییانە لەناو هەموو میللەتێکدا لە داهاتوودا دەردەکەوێ و پەرەدەسێنێ و لێکۆڵینەوەی جۆر بەجۆری لەسەر دەکرێ ، و بە سەرگەرمییەوە دەخوێنرێتەوە چونکە بیرەوەری بەشێکی ڕاستەوخۆیە لە پانتای نەتەوایەتی و سیاسی و مێژوویی و ئاینی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و کلتووری ...تاد . نەتەوە دەکرێ لەسەر جوگرافیای ئەو بیرەورییانە هۆکاری بنەڕەتی هەموو سەرکەوتن و تێکشانێکی نەتەوە خاڵ بەخاڵ دەست نیشان بکرێ.

ئێمە کاتێ ئەزموون و بیرەوەری ژیانی تاکە کەسێك دەخوێنینەوە، ئەوە ئەزموون وژیانی بەشێکی زۆری نەتەوە دەخوێنینەوە، وئەگەر وەکو ( هێرمان هیسە) ش بڵێن : مرۆڤ گیانلەبەرێکی تەنیایە .. ناتوانین بڵێن ژیاننامەو بیرەوەری و ئەزموونی تەمەنی کەسێك کە لە ناو کۆمەڵگادا ژیابێ و بژیێ .. ئەزموونی خۆیەتی و بەس بەڵکو ئەزموونی خۆی و ئەو ناوچەو کەسانەیە کە لەگەڵیاندا ژیاوە، و دەژیێ و ئەم بیرەوەرییانەش بیرەوەری هەموو ئەو جێگاو ناوچانەی گەرمیانە کە شێخ سەعید شاکەلی تیایدا ژیاوە .بەو بەندیخانانەشەوە کە لێرەو لەوێ کوناوکونیان پێکردووە ورۆژەجوانەکانی تەمەنیان لێ دزیوە .

شاکەلی لەم بەشەی بیرەوەرییەکانیدا ، باس ئازایی و خۆڕاگری و چوست و چالاکی کۆمەڵێ پێشمەرگە دەکات ، کە لەدەشتی گەرمیاندا لەدوای ئەنفالکارییە بەدناوەکان بنکەو قەڵای خەبات و بەرگری و خۆڕاگرییان دامەزراند و سوێندیان خوارد کە خاکی کوردستان لە ژێر پێی دوژمناندا بکەن بە بوومە لەرزەو ئاڵای نەبەزین و تێکۆشان و تۆڵەکردنەوە و پێشمەرگایەتی بەرز بکەنەوە، و یا کورستان یانەمان بکەن بە دروشمی ژیانی سەخت و دژواری خۆیان ، و بەبرسێتی و شەونخوونی و تینوێتی و راکە راکەی ئێرەو ئەوێ خوێنی خۆیان بچۆڕێننە چرای شەوەوە.

بەراستی ئەم گروپە پێشمەرگەیە کە گەرمیانیان کرد بە بنکە،و لەشاری کفری و دەورووبەری ئەم دەڤەرەوە بەهاریکاری کەسانێکی دڵسۆزی ئەو شارە توێشە بەرەیەکی نەبڕی و نەبمرەیان پێدەگەیشت ، ژیانێك ژیان و ئازایەتیەکیان نواندووە لە ژیان و ئازایەتی پاڵەوانی ئەفسانەی گوێ ئاگردانی کوردەواری و ئەو کەسایەتیە بەجەرگانە دەکات کە لەشانامەی فیردەوسی و ئۆدیەو ئەلیازەدا ناویان هاتووە .

بەراستی ئەم گروپە پێشمەرگەیە ئەو قارەمانە ئەفسانەییەن، کە سوێندیان خوارد کوانوی پێشمەرگایەتی نەکوژێتەوە و ئاگرستانی تێکۆشان و تۆڵە کردنەوە لە دوژمن هەربڵێسەی بەرز بێ .

دەخوازم ئەم جۆرە پێشمەرگە بەجەرگ و بوێرانە ئیتر هیچ جۆرێکی گەندەڵی پەسەند نەکەن و راپەرینی دژ بە هەموو جۆرەکانی گەندەڵی بەرپابکەن .. چونکە ئەگەر ئەم لێشاوی گەندەڵیەی کە لەهەموو بوارە رەسمی و کۆمەلآیەتی و ئابووری و رۆشنبیری و چی و چی دیدا تەشنەی کردووە ، ئەگەر بەری لێنەگیرێ ، جاوازییەك نامێنێتەوە لە نێوان شۆڕشگێڕی و چەتە گەریدا ، و کە واشی لیهات کاکڵەی ماناو بەهاجوانەکان کەروو هەڵدێنێ و کرم مۆریان تێدەدات و رەنجی دەیان ساڵ و سەدان ساڵی دڵسۆزی رەشە با دەیبات ، وکشتەکی موتمانەکردن دەپوێ ملوانکەی مرواری ئومێددەبچرێتەوە... ئیتر سلاو و رێز ودروود بۆ ئەوانەی رۆژە جوانەکانیان دروستکردو رۆژانی جوانتر دروست دەکەن.

ئەم کارەی شێخ سەعید شاکەلش شایستەی دەست لێخۆشیکەرییە ، چونکە ئەمە هەر بیرەوەری نووسین نییە ، بەڵکو تۆمارکردنی لایەنێکی گرنگی مێژووی خۆڕاگری و کۆڵنەدانی نەتەوەی کوردە ، کە سەدەیەك زیاترە دەیەوێ ولآتە دابەشکراوەکەی کۆبکاتەوەو تاج و ئەورەنگی سەربەستی لەسەر بکات ...

لەتیف هەڵمەت

٢٠٠٨/٩/٩

# وتەی ژیلەمۆی گەرمیان :

ئێرە گەرمیانە و ئێمەش گەرمیانیین ، هەر کە چاومان کردوەتەوە گوێمان ئاشنای کپی و خامۆشی بووە .بەتایبەتی کپی نیوە شەوی پایزی ساردو وشکە سەرمای دوور و درێژی بێ کۆتایی کپی شەو گاری مانگی ئابیش زۆرجار وەڕەسی ئەکردین ، ئەوەی لەئازاری بێزاری و وەڕەسی کەم ئەکردینەوە هەڵکردنی شنەبایەك بوو .

هیچ کاتێك ئەوەندەی ئەمجارەیان گوێ لە کپی ناگرین ، بەتایبەتی دوای نیوە شەو ، ئەمانەوێ گوێ بۆ کپی خامۆشی ڕادێرین چونکە زۆر تامەزرۆی گوێ بیستی کپی و بێ دەنگین ، هەر هەمووومان : شوان ،جووتیار ، منداڵ ، گەنج ، پیر ، ژن و پیاو ، رۆشنبیرو نەخوێندەوار . هەر هەمووومان تامەزرۆین .

ڕەنگە بەلای خەڵکانێکەوە کپی شتێك نەبێ جێی بایەخ و سەرسوڕمان بێت ، بەلام بەلای ئێمەی گەرمیانییەوە مانایەکی تر ئەبەخشێت . چی لە کپی و بێدەنگی خۆشترە ! کاتێ لەنێو ئەو خامۆشییەدا گوێت لە دەنگی ئاوە لە ئامێزی کەناردار گوێت لە چرپەی شەماڵە کە لەگەڵ گەلای دار گەزەکانی گەرمیاندا سەما ئەکا ، دەنگی ئەو سەمفۆنیایە تەنیا گەرمیانییەکان پێی ئاشنان.

بەلام ئەم کپی و بێدەنگییە هەمیشە و لە دێر زەمانەوە گەردەلوولەکان شێواندیانە ، ئەو گەردەلوولانەی پێ لە زەوی توند ئەکەن و سەر لەئاسمان و بەهەموو هێزیان چنگ ئەخەنە هەناوی خاکە هەمیشە تینوەکەیەوە ،و هەرچی هەیە لەگەڵ خۆیانە ڕای ئەماڵن ، ئەم ولاتە لە دێر زەمانەوە ئاشنایە بەم ئالۆزییە و ، ڕێ نادەن چێژ لەو کپی و ئارامییە وەربگرین ، و جوانیەکانی بەدی بکەین و هەست بە ئاسودەیی بکەین .

لەدێر زەمانەوە ئەو گەردەلوولانە لە بیابانە پان و بەرینەکانەوە هاتوون و چنگیان لە سنگی ئەم گەرمیانە ڕووتەڵەیە داگیر کردووە و هەرچی بەردەست کەوتووە و

بەرشالآوی کەوتووە و ڕایمالیوە و هەڵی لوشیوە . وێرانکاری و تێك و پێك دان ونەهامەتی بۆ هێناوە .

ئەم وڵاتە خۆڕاگرو نەبەزیوە تاچاو برکا هەردوو دەشتەلە هەرلایەکەوە لە بەرزاییەکانی کوێستان و گەرمیانەوە تەماشای بکەین سنووری بەرین و بەربلآوی بەدی ناکەیت ، هەرجارەی لە لایەکەوە کەوتووەتە بەرشالآوی گەردەلول ودەستی ئالۆزی وێرانکاری گەیشتووەتە هەموو لایەکی . بەلآم دوای هەموو وێرانکاریەك سەرلەنوێ ئاوادان کراوەتەوە و ، بەڕاست خەڵکەکەی خۆڕاگرو ماندوو نەناسن و خاوەن ئەزموونن لە ژیاندنەوە و زیندووکردنەوەو نوێکردنەوەی لایەنەکانی ژیانیان چونکە ئەمان خەڵکانێکن کە ئەستەمە سەردانەوێنن و کۆڵ بدەن و بەئاسانی واز لە ئامانجەکانیان بێنن ، ئەمەش پەیوەستە بەو کەلتوور شارستانیەت و ڕەسەنایەتیەی کە لە سەری پەروەردە بوون .

وەرە لە ( ئاش داخەوە ) بەچەمی (ئاوەسپیدا) دەگەڕێ .. لە زستانێکدا سەری بکات بەماڵی گوندنشینێکدا بزانە چۆن سەرو ماڵیان لە خزمەتدا دادەنێنن و لای سەروی ماڵەکەیانەوە لە پاڵ ئاگردانە کەیاندا جێگەت بۆ ڕائەخەن ئەی حکایەتی سەرقافڵەی چیانی کوێستانتان نەبیستووە ، چۆن باسی ئەمەکی ماڵە لادێ یەکانی (ئاوەسپی) و( ئاش داخ ) و( خۆرنەوازان ) و (خان) و شوێنەکانی تر ئەگێڕنەوە ، گەر پشت و پەنات ئەوێ لە لێقەوماندا خۆت فرێدە ماڵێکی کەناری سیروان .

ناو ناوبانگی دیوەخانەکەی موحسین ئاغا لە کفری ...خان و قەیسەرییەکەی جێ پەنجەی شارستانیەتێکی دێرینیان پێوە دیارە .لەیادت نەچێ لە (بەردەلاوێژەکە) کڕنووش بەرە ئەوە مەزاری ڕۆحی پڕ حورمەتی پۆڵێ تێکۆشەرە ... ملازم عەبدوڵلآو هاوەڵەکانی شێخ ئیسماعیل و عەبەی ئامەو عەریف حەمیدت لەیاد نەچێ سەری ڕێزیان بۆدانەوێنە، زێدی برایم خان و سەنگەرەکانی بەسەرکەرەوە

.کەشکۆڵەکەت دێڕێکی سوور نووسکە (سەید محەمەد) و هاوەڵە تێکۆشەرەکانی بیرو باوەڕی ئەوان بوو ، ڕۆژی دەبابە قڕانی ( سەرقەلا )دوژمانی کوردیان بەزاند .

لەسەرقەلا لە ماڵی (خەلیفە مەحمود) لابدە تا لە دیوەخانەکەیدا گوێ بیستی داستانی گەڕانەوەی شێخی نەمر بیت کەچۆن لە دیوەخانەکەی (موحسین ئاغا) دا ، بیرۆکەو بڕیاری مەملەکەتی کوردستانیان دا . لەم گەرمیانەدا بۆ یەکەمجار ئەو بڕیارە دراو نەخشەی بۆ کێشرا .لە ( گورگەنی و قوشیلان ) مەتارەکەت پڕ کە لەئاوی نەمران ، شاعیرەکەی دەشتی گەرمیانت لە بیر نەچێ سەیری سیمای ماتی کە چەند بەداخە بۆ دابەشکردنی خاکی کوردستان و زەلیلی کوردان بەدەست دوژمنانەوە .

بۆحەسانەوە لە کۆشکە سەربەرزەکەی شیروانەدا پشویەك بدە و گوێ شل بکە بۆ هۆرەو سیاچەمانە ، ئەمە جێگەی عوشرەتی میری کوردانە ، مێژووی پڕ لە سەروەری ئەم ولاتەیە ، لە عەروسیدا گوێ بیستی ڕاو تەکبیرو ئێش و ئازارەکان بە ، بەئخلاسەوە ئاوەکەی سیروان ئەتلاوێنێ میرانی کورد هێندەی لە توانا دا بووبێ دریغیان نەکردووە، کەشکۆڵەت بخوێنەرەوە ئینجا ئەزانی ئیرەی گەرمیان و ئێمەی گەرمیانی بۆچی هێندە شەیدای ئارامین ؛ لەپێناوی ئەوەی ئارامی فەراهەم بکەین زۆرمان بەخت کرد تاڕادەی کاولبوون و ویرانی لە ریشەکەندنی هەرچی پیرۆزی هەیە، ئێمە لەگەڵ خودادا لەسەر شوشەو ڕەز زۆرانبازیمان نەکرد ، بەڵکو لە حزوریا کڕنوشمان بردو سکالامان کرد : ئەی خودایە ئاگات لەو هەموو بۆ کڕوزی و جەرگ سووتانە نەبوو ؟ ئەی ئاگات لەو هەموو قافلانە نەبوو ، کە بۆ بیابەنەکانی عەرعەر و نوگرەسەلمان بران و نەگەڕانەوە؟ ئەی ئاگات لە ئەتکردنی ئاینی ئیسلام و پیرۆزییەکانی مرۆڤایەتی نەبوو ؟ ئەی بۆ گەردەلوولی رق و قینت هەڵی نەکرد؟ و تەخت و بەختی ئەو دڕندانەت هەڵنە تەکان ؟.

پاشان دوای وێرانکاری و کاولکردن، ئەوانەی مانەوە، ئەوانەی بەهەزار کولە مەرگی ڕزگاریان بوو، لە ئۆردوگای زۆرە ملێ دا جێگیر کران، ژیانیان لە نێوان مان و نەماندا ئەگوزەراند. سەرێ بدە لەماڵەکەی( پورە حەلاو) و گوێ ڕاگرە بۆ چیرۆکی خەم و ئازارەکانی ..( پورە حەلاو ) کە بە تەنیا ژیان بەسەر ئەبات ، باسی چیت بۆبکات ؟ باسی مێردەکەی کە نازانێ چی بەسەر هاتووە ، سەری خۆی هەلگرتووە بۆ ئەو دیو سنوور یان بەر لافاوەکە کەوتووە ؟ منالەکانی ( حەمەو خولەو قالە ) کە بە بەرچاوی خۆیەوە خرانە ناو ئیڤاکانەوە . خاوەروگەلاوێژ کە هەر بەپرچ پەلکێش کران و لەگەڵ ژنەگەنجەکاندا جیاکرانەوە،مەگەر هەرخوا خۆی بزانێ چۆن ونکران و بۆ کوێ بران ؟...

پورە حەلاو هەموو ڕۆژێ لەسپێدەی بەیانەوە تائێوارە تاریك دا دێت لە بەر دەرگای ماڵەکەیدا دادەنیشێت و چاوەڕوانە بێ ئۆقرەیە ، شەوانە لەژوورە تاریکەکەیدا بەدەستووری جارانی لادێ نوێنەکان ڕائەخا، تا چاوەکانی قورس ئەبن و ئاو لە کانی چاوی ئەبڕێ ، بەدیار یادەوەرییەکانیەوە بێدارە و خەو لەچاوی ناکەوێ .. ئەگەر خەویشی لێ بکەوێ ڕائەچلەکێ و پەلاماری نوێنەکان ئەدا .. قالە گیان .. گەلاوێژ گیان لە دەنگی شیوەن و گریانی ماڵە دراوسێکان بێدار ئەبنەوە.

زۆربەی ناوی ئەو ئۆردوگایەی ناوی لێنراوە (صمود ) شەوگارو ڕۆژگاریان بەم حاڵەوە بەسەر ئەبەن .. کەسێ نییە ئێواران دەمەو مەغریب کە خۆر ماڵئاوایی ئەکا خۆی بکا بە حەوشەو ماڵی چۆلا و ئاوە دانییەك قەرەباڵغیەك دروست بکات..کەسێ نیە عەلاگەیە میوەو پێویستی ماڵیان بۆ بێنێتەوە .. کەسێ نییە دەردە دڵی خۆیانی بۆ باس بکەن و پرچی خەم و ئازارەکانیان شانەکات .

چۆن دڵ ناتوێتەوەو دیدە نابێتە سەیلی سروشك و ناجۆشێ بۆ ئەم برسێتی و ئاوارەیی و بێ دەرەتانییە بۆ کرۆزی ئەم هەموو خەم و ئازارو نەهامەتییە ... ئەوەی تروسکەی ئەوا بەم تریکستانە لەنێو ئەم کاول کاری و ماڵ وێرانیەدا کورە

ئازاكـــانی گـــەرمیان بـــوون .. بـــەجلی چـــڵكن و شـــڕۆڵەوە، بەڕیشـــی درێـــژ و تۆزاییەوە،بەچاوی پڕ لە رق و قین و خـەم و ئـازارەوە ... بـەدەروونی پـڕ لـە كڵپـەی ئاگرەوە، بە كوڵە پشتەكانیانەوە ، بەفیشەك و كلاشینكۆفەكانیانەوە... هـەر چـەند كەسێكیان لە ئەشكەوت و بن كاچێكدا .. یان لە نێو كۆمـەڵێ زەل و لێـوار چـەمێكدا خۆیان حەشار ئەداو پرۆژەو پلانی بەرگری و نەبەزینیان دائەڕشت .

ئەمجارەش وەكو هەموو جارەكانی دیكـە نـابێ گـەردەلوول ریشـەمان دەربێنـێ ، نابێ چـۆك دادەیـن ، هەرچـەندە بارودۆخەكـە سـەخت و دژوار بـوو ، ولاَت وێـران و هەردو دشت چۆڵ بوو ، چاوی دوژمـنیش كـونی دەرزی بـەدی ئـەكرد ،لـەبن هـەموو بەردێ لە سێبەری هەموو دارێ لەسوچ و قوژبنی هـەموو وێرانەیەكدا، دڕاندانـە لـە ئامادە باشیدابوو تەنیاو تەنیا شەوە زنگ و تاریكی دۆستمان بوو .

لەجەرگـەی تـاریكی و خامۆشـی شـەوە زەنگـەكان جموجـۆڵی پێشـمەرگە .. لـە جاسمـەوە بـۆ خـەلیل ، لەمـەلا ئەحمـەدەوە بـۆ عوسمـانی حـاجی مـەجمود لـە حیسامەوە بۆ شوكر ، لەمەلا رەحیمەوە بۆ ... بۆ .. لەنەبـەردەوە بـۆ بورهـان لـە سۆرانەوە بۆ هەموو جیهان ، ئێمـە چـەند پێشـمەرگەیەكین پـاش شـالاَوی دڕندانـەی ئەنفال ئەو شالاَوەی بەبەرچـاوی هـەموو جیهانـەوە دەرحـەق بـە میللەتەكـەمان كـرا كەسیش ئاوڕێكی لێنەدابنەوە ، بەناوی ئیسلام و لە ژێر ئالاَكەیدا واخەرێكـە گـەلێكی موسڵمان و بێ دەرەتان لە ناو ئەبرێ .

بۆیە ئێمە لەم پێ دەشت و هەردانەدا رێگەی مردن و هات و نەهات هەلدەبژێرین و مردنمان لە ژیانی ژێر دەستەیی زۆر لاباشترە ، بەردەوام ئەبین لە خەبات و خۆمان بەدەستەوە نادەین و دوژمنیش ناتوانێ لە میللەتەكـەمانمان دابـڕێ . ئـەم كاروانـە لە هەردەكانی گەرمیان و پێ دەشتەكانیەوە بەرەو هەموو كوردستان بەڕێ ئەكـەوێ ، هەروەكو چۆن شێخی نەمر لـە دیوەخانەكـەی موحسـین ئاغـا دا لـە ناوچەرگـەی گەرمیاندا بانگهێشتی مەملەكەتی كوردستانی دا . هەر ئاوا ئێمەش بەهەموو جیهـان

و بەستەم کاران و دوژمنانی مرۆڤایەتی ئەڵێن ئێمە بانگهێشتی هەموو ئازادیخوازان ئەکەین که هاو کارمان بن و لەگەڵمان بن .

.... ژیلەمۆی گەرمیان ئەمجارە لە بەشی پێنجەمدا چیرۆك و بەسەرهاتی ئەو پارتیزانانەیە کە ڕێگای هاتوو نەهاتیان هەڵبژارد لە پاش ئەنفال و نەهامەتیەکان ، پەیمانیان بە خاك و میللەت دا کە تا مردن بەربەرەکانی ئەکەن .. ژیلەمۆ چیرۆك و بەسەرهاتی هەندێ لەو قارەمانانەی کە لە ڕێگای مردنی محەقەقیان هەڵبژاردبوو لەدوو توێ لاپەرەکانی دا تۆمار دەکات .. هەڵبەت کەدەڵێم هەندێ لەوانە چوون ڕەنگە شتی تر و خەڵکی تر هەبوون من نەمتوانیبێ دیداریان کەم پەیوەندییان لە گەڵ بکەم بەڵام بەگشتی بۆ کەسێ هەیە یەك تۆزقاڵ شعوری لابێ لەبەردەم ئەو کردەوانەدا کڕنووش نەبات و لەقسوورم بەرانبەر بەو کەسانەی نەم توانیوە پێیان بگەم ببوورن و داوای لێبوردن دەکەم .

بەوانەش دەڵێم کە دەرباز بوون لەو مەرگە موحەقەقە .. ئەو بەهایە زۆر گەورەیە شایانی کڕنووشە و بە قوربانی هیچی نەکەن ئەو سەروەرییە مێژووییە زۆر پڕ بەهایە بەهیچ ناگۆڕێتەوە.. ئەم ژیانە نارەحەتی و خۆش گوزەرانی تێدایە وریابن مرۆڤ خوا وای دروست کردووە هەر زوو نارەحەتی لە یاد ئەکات ، بەڵام ئەمەی ئێوە کردوتانە بەهیچ ناگۆڕێتەوە دەخیل و ئەمان ، گەرمیانی وەتەنی ئەمان سەد ئامان دەخیلە کوڕ گەل ئێوە پەیامتان بانگهێشتان ئەوەتان سەلماند بۆ هاوڕێکانتان کە شۆرش بەردەوامە کە (پ .م ) لەم گەرمیانە لەبەربەرەکانی و بەرگریدان وەرنەوە خەباتی ئەمجارە ڕاستە زۆر سەختە و کوڕی خۆی دەوێ وەرن چاو لەو کوڕە گەرمیانیانە بکەن چۆن بەگژی مردندا ئەچنەوە ئازارەکانی پورە حەلاو و گەلاوێژ.. و کێ و کێی تر ... ئەمە وڵاتی بەربەرەکانی و خۆ بەدەستەوەنەدانە ، تەختی زۆر ستەم کاری هەرەس پێ هێنا .. کەس خۆی لە

قۆڵەکانی نەدا باشە ستەم لەکەس قبولٚ ناکات ئەگەر ماوەیەکیش لێ بێ دەنگ بی لە تۆڵەدا بەسەبرە ...

ئەگەر مافەکەیشی بخورێ لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی دا ماوەیەك بێ دەنگ ئەبێ ..بەڵام پاشان زۆر بەزەبر ئەبێ ، ئێوە نەمانتان کردە مان و ئێوە چۆڵەوانیتان ئاوەدان کردەوە ئێوە بە بوونتان چۆکتان بە نەبوونی هێنا لێرەشەوە شۆڕشی نوێ بەردەوام بووەوە هەرچەند باجەکەی زۆر زۆر بوو. ئێوە ئەفسانە بوون دەخیلەو ئامان ئەرکەکەتان گرانە و رێگاتان زۆر لەبەر ماوە گەرمیانەکەتان زۆر بریندارە ، ئەو رۆژگارەتان بەقوربانی هیچ مەکەن جگە لەسارێژ کردنی برینەکان .کۆشك و تەلارو خۆشگوزەرانی و دەسەلات ئەو سەروەرییە گەورەیەتان پێ نەدۆڕێنێ

- دەخیلە دەخیل
- ئامان سەد ئامان

**سەعید شاکەلی**

**گەرمیان .سەعداوە**

## کارەساتی ئەشکەوتی داری خلە
## ((ئەو ساتەی جوانییەکان وون بوون .. کۆترەکانیش تار بوون))

عەسرێکی درنگ لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا رێگا سەختەکانمان گرتەبەر، هەموومان بەجلی خاکی و کۆڵەپشتەوە چەکەکانمان لە ئامادە باشیدا بوو . خۆشمان وەکو نێچیر زۆر بەئاگابووین، ئەوەی لەپێشەوەبوو ئاگای لە هەموومان بوو ، کەسی دواوەش جگە لە ئاگابوون زۆر بەوریایش شوێن پێکانمانی ئەسڕییەوە ، بەدەم رێگاوە هەندێ جار قسەی خۆشمان ئەکرد ، بەڵام هەر بەئاگابووین ... ئەو رێگایەی پێدا رۆیشتین رێچکەرێگایەك بوو، لەبەرئەوەی ماوەیەکە ئاوەدانی لەم ناوچەیەدا نەماوە ، رێگاکە بەرەو کوێر بوونەوە ئەچێ ، بەڵام شارەزایی کۆنمان وای لێ ئەکردین لێمان تێك نەچێ ، چەم و کۆردەرەو هەندێ جار شاخیش زۆر سەخت ئەهاتنە بەرچاومان .

خۆر بەرەو ئاوا بوون ئەچوو ، سروشت بۆ خۆی نیگارێکی جوانی دروست کردبوو ، ئێمەش سەروسیمامان شپرزە و دوور لەشارستانیەت ، بەڵام ورەو باوەڕێکی زیاد لە سنوور لە ئێمەدا ئامادەگی هەبوو ، کە ئەوەش بۆ ئەو چەشنە ژیانەی ئێمە زۆر بەکەڵك بوو ، ئێمە هەموومان لە تەمەنێکی پڕ چۆش و خرۆشدا بووین ئەوەندە بیرمان لای بیر و باوەڕ بوو بە پێچەوانەوە ئەوەندە بیرمان لە دوژمنی بەرامبەر نەدەکردەوە ، بەڕاستی ئەمە خەسڵەتێکی جوان بوو .

کەبەلای لادێ رووخاوەکاندا گوزەرمان ئەکرد ئەوجا زیاتر راستی و دڕندەیی ئەو رژێمەمان بەدی ئەکرد و دەرك پێ ئەکرد، ئەو دیمەنانە ئەی هەژاندین تووشی نارەحەتیەکی گەورەی ئەکردین ، " ئاخۆ میللەتەکەم توانای ئەم هەموو ئازارەی پێ ماوە ، باوەڕ بەوە ئەکەن ئێمە ماوین و لەخەباتداین و چۆکمان دانەداوە و زۆریش

گـەش بیــنین بەرامبــەر بــە پاشــەڕۆی میللەتەکــەمان .. تــۆبڵێی گاڵتــەیان بەبۆچوونەکانمان نەیەت ، ڕاستە ئەوان ئێمەیان لە ناخەوە خـۆش ئـەوێی ..... ؟ "

ئەم گفتو گۆیەم لەگەڵ خۆمدا ئەکرد . لە پڕ ئاگاداریان کردین برادەرانی کونە کۆتر لـەم دۆڵـەدا چـاوەڕوانمانن وریـابن ، زۆری نـەبرد چـەند تارماییـەك لـە ئاسـۆوە دەرکەوت، بانگیان لێ کردین .. خۆمانیین میـوان . پـاش ئـەوەی یـەکمان لـە ئـامێز گرت هەندێ گفتو گۆ کرا بەقەد پاڵەکەدا سەرکەوتین بەدوای یەکدا ڕێچکە ڕێکاکەمان گرت و کەوتینە ڕێ .

لە ڕێو ڕۆشتنمان تەنها ئاسمان و ئەستێرەکان بەدی ئـەکرا . لـەڕێگادا گەیشـتینە کانی ئاوێك کە چـوار دەوری زەل و قـەڕەم و دار ژاڵـەی لێـی بـوو تیونیـەتی خۆمـان شکان ، زۆر بەوریایی بەرێ کەوتین پێمان لەسەر بەردەکان دائەنا نـەوەك جـێ پێـی ڕێوەڕۆشتنەکەمان بەدیار بکەوێت ، شەویش تا دەهات بەرەو شەوە زەنگی و تارکی ئەچوو ، بەشێوەیەك زۆر جار ئەوەی لە دۆڵەکـەدا بـوو لەبـەر چـاومان ون ئـەبوون ، دۆڵەکە تەواو تەسك بووەوەو هاتە یەك ، جگە لە لوتکە و ئاسمان و ئەستێرە هیچـی تر دیار نەما .

تاوەکو گەیشتینە ئەشکەوت و لەوێ برادەران لە پێشوازی ئێمـەدا بـوون .. بیرمـە چرایەك لە تەنگـەی ئەشـکەوتەکەدا دانرابـوو ، ڕۆشـنایەکەی زۆر بەئەسـتەم ئەگاتـە بەری دەرگاکە ، هەریەکە بۆ خۆی جێگاکەی ڕاخستبوو ، تفاق و کەلوپەل و خواردن لە سوچێکی ئەشکەوتەکەدا دانرابوو ، بەڵام بەشـی حەوانـەوەو نووسـتن لـە قـوڵایی ئەشکەوتەکە بوو ، هەریەکەو پێخەفی خۆی هـەبوو ، دەنگـی رادیـۆ ئـەهات و کتێـب دانرابوو ، بەچوونی ئێمەو گەیشتنمان بەئەشکەوت قەرەباڵغی و پێکەنین پەیـدابوو ، هـەر بیرمـان لەدەرەوەیـەو زۆرێـك لـە ئێمـە بەتاقمەکانمانـەوە ماینـەوە . ئـەوانیش هەروەها هەست ئەکرا وریاو بەئاگان ،چوون دیار بوو ئەدیداسەکانیان لە پێدا بوو ،

شێوازی ڕێکخستن لە ژیانی ئەواندا بەجوانی دەبینرا چاو و نانی شەویان ئامادەبوو تێر نان مان خوارد ، هەر پێشمەرگەیەك قاپێ شلە و قاپێ برنج.

دیار بوو خۆیان ئەوانەی نێو ئەشکەوتەکە بۆ خۆیان نانەکەیان دروست کردبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا وەستایی پێوە دیار بوو ، من بۆ خۆم زۆرم برسی بوو ماوەیك بوو دوو چێشتم نەخواردبوو ! دیارە لای ئەم برادەرانە جۆرە ئارامییەك هەیە ؛ سودیان وەرگرتبوو لە کەل و پەلە بەجێماوەکانی لادێکان ، ئەوشەوە نانی باشمان خوارد ... لەیادم نییە چۆن دەم و دەست و چاوم شۆشت ؛ ئیتر چووینە شوێنی تایبەت بە حەوانەوە لەبیرمە تیشکە چراکە بەجوانی ئەو بەشی روناك کردبووەوە ؛ جێگایان بۆ دابین کردین ، بەتەنیشت یەکەوە گفتو گۆ دەستی پێکرد ، رادیۆش کرایەوە پاکەتیش بوو دیاربوو پاکەتی دوکانە بەجێی ماوەکانی لادێ بوو، جیهازەکەش بۆ کاتی پەیوەندی ئەبرایە دەرەوە ئەوەی لە سوچێ ڕاکشابوو کاك بوورهان بوو خەریکی خوێندنەوە بوو، ئەو دیمەنەی کاك بورهانم زۆر پێ جوان و لەلا خۆش بوو .

– لێم پرسی دیارە کتێبت دەست کەوتووە ؟

– ئەوە دوو بەرمیل کتێبە هاورێ ئەگەر هەوەست هەیە بیخوێنیتەوە ،زۆرم پێ خۆش بوو، مزگێنیەکی زۆر خۆش بوو .

– هیلاکم ئەگەر کات بوو سوودی لێوەر ئەگرم .

برادەران لە هاتوو چۆکۆکردندا بوون دیاربوو ئاو ئەهێنن و کارەکانی رۆژ ئەکەن ، چونکە ئەوەی ئێستا ئەکرێ بەرۆژ ناکرێ ئاشکراشە مرۆڤ کە کەوتە ئیسراحەتەوە ئیتر بازی خەیاڵی ئەفرێ و باش تاو ئەدا بەلاّم خەیاڵی ئێمە جگە لە پێشمەرگایەتی هیچی تر نەبوو ئەوەندە بازی خەیاڵمان ئەفرێ تۆبڵێی بەیانی چی روو بدات ؟ ئەو رێنماییانەی کە بۆ ئێمە ئەهات هەر ئەوەندە بوو (( خۆتان لە هەموو ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دوژمن بەدوور بگرن ، ئێوە بوونتان زۆر زۆر پێویستە،

بوونتان سەرلێشێوانە لە دوژمن هەر کارێکی وا بکەن تووشی سەر سوڕمانیان بکەن )) ئەو گوێ درێژەی لەوێدا بەسترابوو دەنگی پێی ئەهات دیاربوو هاورێیان دەرچوونیان هەیە ، ئازووقەو خواردن کە لە لادێکان بەجێماوەسوودی لێ وەرئەگرن جار نەجاری بوومە بوومی کۆترەکان ئەهات ئەم شوێنە پێی ئەڵێن "کونە کۆتر " واتا ( هێلانەکۆتری کێویی )، بە رێگا دا بۆم دەرکەوت کە ناوەندی گوندەکانی زاوت بەلای باشوورەیەوە ، ترشەکە خۆر هەڵات حمەی سورە خورئاو ئیمام محەمەد و مراوە لای باکورەوە لە دارەکەی خلەوە رەنگە ٧٠٠ – ٩٠٠ م دوور بێ پیادە رێگایەك لە گوندی مراوە و تورکە وە بەتەنیشت داری خلە شۆڕ ئەبێ ؛ ئەوە ئەم قەڵبەزە دیارە کەش و ئاو و هەواکەی گۆڕیوە ، لە ئەندێشەی خۆمدا شوێنی قەڵبەزەکەم دیاری کرد خۆر هەڵات و خۆر ئاوام دیاری کرد .

ئێمە ئێستا لە مانگی ١٩٨٨/١٠ داین ، دنیا پایزە وەرزە ساڵ بەرەو پایز خۆی پێچاوەتەوە کاك عەدنان و مەفرەزەکەی لێرەن ، هەربەڕاستی ئەم شوێنە دوورە لە چاودێری و هیچ گومانی لەسەر نییە . لەبەرئەوە شوێنەکە قامیشە لان و ژاڵە لە چەمەکەدایەو بە گشتی شوێنێکی لەبارە بۆ ژیان ، نازانم چۆن خەوم لێ کەوت بەیانی زوو لە خەو هەستاین و خۆمان ئامادەکرد بەلام بێ دەرچوون .

پاش چەند رۆژێك خراینە سەر ئەو دەستەیەی کاك مەلاو کاك سەید سەرپەرشتیان ئەکردلە جێگایەك لەو دەورەو بەرەوە تاوەکو قولایی گەرمیان ئەو دەستەیە پێك هاتبووین لە کاك سەید و کاك مەلا و خۆم ( حمە سۆران ) مام حەمید ، پۆلا ؛ نەوزاد ، مامۆستا حسێن .

پاش ماوەیەك کاك عەدنان و مەفرەزەکەی بۆ پشوو تەنگەکەیان بە جێهێلا بوو ، ئێمە ئەم تەنگەیەمان دەست کاری کرد بە قوڵنگەو خاکە ناز و بێڵ... وەکو دووبەشی لێهات قولایەکەی ١٥م –٢٠م ئەبوو هەمووی چەو خۆڵ بوو، هەڵمان دایەوە لە بەشێکی دەرگای تەنگەکەدا کۆمان کردەوە ، وەکو دیوارێکی لێهات ؛

ئەم کارەمان سودێکی چاکی هەبوو بۆ کاتی سەرماش ئاگری نان و چێشت هەستی پێ ناکرێ . مام حەمید زۆر گرنگی پێئەدا لە رووی جوانکارییەوە کاك مەلا قەرەویلەکەی کە جێگەکەی لەسەر ڕاخستبوو زۆر جار سەرقاڵی خوێندنەوە بوو ! !دوای ئەو دەستکاریە تەنگەکە وەك ئەشکەوتی لێهات ؛ بەلاَم ئەشکەوتێکی دەست کرد بەخۆڵ و چەو کە ئەمەش جیاوازە لە ئەشکەوتی چیاو تاوێرەکان .

زۆربەی کاتەکان جگە لە چاودێرەکە لە ئەشکەوتەکەدا ژیانمان بە خەوتن و خوێندنەوە بەسەر ئەبرد ، شەوان زۆرجار یەکێکمان کتێبی ئەخوێندنەوە بۆ ئەوانی دیکە یەك لەو کتێبانەی کتێبەکەی حەمە دۆگ ...تد . شەترەنجیش هەبوو ، ئەو شوێنە وای لێکرابوو بتوانین لە سەخترین کاتدا تێدا بژین لە رووی پێویستیەکانی رۆژانەوە نارەحەتیمان نەبوو .

دیارە لە وەها ژیانێکدا هەموو رۆژێ دەم و چاوەکان پێکەوەن و زۆربەی حکایەتەکان کۆتایی دیّو رەنگە دووبارەش ببنەوە ، زۆر جاریش قسەی خۆش و بەسەرهاتی خۆش روو ئەدات جگە لە تورە بوون و شتی تریش ، لەو ژیانەشدا زۆر گرنگیمان ئەدا بە پاك و خاوێنی و بۆ ئەو مەبەستەش سابوون و تایتمان پێ بوو ، لە ناو جەنجاڵی دار ژاڵەکاندا وەك گەرماو خۆمان ئەشۆرد بەلاَم لەبەر سەرما کەمتر خۆمان ئەشۆرد .

پاسەوانی و چاودێری بەردەوام بوو ، ئەو رێچکە رێگایەی لە داری خلەو زاوتەوە دێت بە تەنیشتیدا تێ ئەپەڕێ ؛ ئەگەر کەسێك شارەزا نەبێت مەحاڵە بزانێت لەوێدا تەنگەو شوێنی خۆشاردنەوە هەیە لەو شوێنەدا .

هەموو رۆژێ لە کاتژمێر (٥بۆ ٥:٣٠) خولەك پەیوەندیمان دەستی پێکرد بە بێ سیمەکان هەواڵەکانی سەرەوەی خۆمان و بنکەکانی خۆمان ئەزانین ، لەو ماوەیەدا هەوڵ ئەدرا پەیوەندی پەیدا ببێ بە نێو شارو پەیداکردنی کەسانی شایستە لەو ڕووەوە .بەیانی زوو بوو رۆژی ١٩٨٩/٢/١٥ پاسەوانەکە خۆی کردە

ئەشکەوتەکەدا و وتی خۆتان ئامادەکەن دیارە کێو ماڵە کۆپتەر بەسەرمانەوەیە .
سەربازی زۆر دائەبەزی لە گەڵ جاشدا، بە پەلە خۆمان ئامادەکرد ، خۆمان بەست

مەلا بە دووربینەوە لە نێو بنە ژاڵەکانەوە دەستی کردە چاودێری ، پیاوانی رژێم و جاشە بەکرێ گیراوەکان بە هەردەکانی دەورو بەردا بلاّو بوونەوە . حەسەی حەمە و رۆسەی شامار بازنەیە بەدەورماندا پاش گفتو گۆکردنمان بریار درا تا نەگەنە سەرمان هیچ جۆرە کاردانەوەیك نەکەین ، بە کاچەکانی تەنگەکەدا دابەش بووین ، لە نێوان دار ژاڵەو بن کاچەکاندا، نان و ئاومان لابوو دوژمن و کۆپتەرەکانی زۆر بەنزمی بەئاسمانی سەرماندا ئەسوڕانەوە هەربە راستی کێومالّکردن بوو ، ئێمەش خۆمان بۆ رووبەڕووبوونەوە ئامادە کردبوو ، ئێمە ئەوکاتە زۆر پێشبینی ئەوەمان ئەکرد لەو رێچکە رێگایەوە لە داری خلەوە دابەزنە خوارەوە و بێن بەسەرماندا و ئاشکرا ببین .

کاك سەید زۆر ورەی بەرز بوو

– کوڕینە ئێمە بۆ مردن هاتووین ئەوەندەی بۆتان ئەکرێ خۆتان لەشەڕ بەدوور بگرن کە روویشیدا دەست مەپارێزن تاوەکو شەهید بوو ئەمە وتەی کاك سەید بوو کە تائێستاش لەبیرمە .

ئێمە زۆر بە ئاسایی ئەوانمان ئەبینی لە دۆڵەکەی بەردەم تەنگەکەدا هاتوو چۆیان ئەکرد ، ئەوەی گرنگ بوو بەنیسبەت ئێمەوە ئەوە بوو کە هیچ ئاسەوارێکمان لە خۆمان بە جێنەهێشتبوو ، ئەوەندە لەیەکتر نزیك بووینەوە تەنانەت گوێمان لە دەمە تەقێی ئەوان بوو بەدرێژایی کات هیچ جوڵەیەکمان نەکرد .

ئەو رۆژە تا دونیا بەرەو تاریکی هەنگاوی زیاتری ئەنا رەوش و مەعنەویاتی ئێمە چاکتر ئەبوو کەس نەیدەزانی کە ئەم تەنگە هەیە کۆترەکانیش زۆر ئارام و لەسەر

خۆ بوون که تاریك داهات شوێنمان گۆڕی بۆ (( کونه ئەمشیتەکە)) کە هەندێ دوور بوو لە تەنگەکەوە.

-کاك سەید وتی : شوێنێکی لەبارە کورینە ئاو و خواردن لە گەڵ خۆتاندا بهێنن ... ئێمە ئەزموونی لەوە پێشمان هەبوو ، چوون زۆر جار دوژمن بە شەوانیش ئەمانەوە زۆر بە ئاگاوە کەوتینە جووڵە بۆ شوێنی دیاریکرا و ئەو شوێنەی بەخەیاڵێ کەسدا نەدەهات ژیانی لێ بێت شوێنێك بە لێواری قەڵبەزەکەوە بوو ، زۆر بە ئەستەم و ناڕەحەتی گەیشتین بە بێ دەنگ و بە ئەسپایی .

-کاك سەید : وریای پێتان بن بەرد نەکەوێتە خوارەوە .

که گەیشتین دونیا تەواو تاریك بوو کاچێك بوو (١م ) بەرز بوو لەبەردەمەکەیدا قامیش سەوز بووە . خەیمەیەکشمان قوڕاوی کردووە رەنگی خاکی لێ نشتبوو ، زۆر هیلاك بووین بە گەیشتنمان هەندێ نان و ئاومان خواردو چاودێرمان داناو بۆ موتابەعەکردن ، ئێمەش ڕاکشاین و هەندێ گفتوگۆمان کردو ڕێنمایمان وەرگرت بۆ بەیانی زۆر بەئارامی بە نۆرە دەست ئاومان ئەکرد کە هەستاین بەیانی بەو دەستانەی تریشمانەوە کە هاتبوون (١٩) کەس بووین لەو کاچەدا .

١- مەلا ئەحمەد ٢- سەید محەمەد ٣- دارا ٤- سەلام ٥- پۆلا ٦- حەمید ٧- مەلا رەحیم ٨- حاجی حەمید ٩- ئەحمەد زەرداووی ١٠- تەها ١١- سەردار ١٢- خەباتە سوور ١٣- کەریم ١٤- م. حسێن ١٥- موکەرەم ١٦- حسام ١٧- نەوزارد ١٨- حەمە کادر ١٩- حەمە سۆران .

رۆژی ١٧/ ٢ لەو شوێنەدا ماینەوە ، هەر بەچاودێری کردن هەستمان کرد کێو ماڵ کردنەکە بەرەو کۆتا دەچێت ، کۆپتەرەکان بۆ پاش نیوەڕۆ ئاسمانی ناوچەکەیان بەجێ هێشت ، بە دوایاندا سوپاو جاشەکانیش کشانەوە . پاسەوانەکە گەڕایەوە ، رۆژ بەرەو ئاوا بوون ئەچوو ، بەهێمنی گەڕاینەوە بۆ تەنگەکە ( ئەشکەوتەکە ) لە کاتی دیاریکراو بە هۆی بێتەلەوە زۆر بە ئەستەم پەیوەندیمان وەرگرت بۆ مان

دەرکەوت هەموو شوێنەکانی تری گەرمیان بە قولایی بەر ئەو کێومالە کەوتوون ، هەر بە هۆی ئەو بێ تەلەوە رژێم ئەبزانی ئێمە بوونمان لە ناوچەکەدا هەیە ، بەلام نادۆزرێینەوە چوون هەر بەراستی فێری هونەری خۆشاردنەوە بووینە !!

ئەو شەوە گەراینەوە بۆ تەنگەکە ( ئەشکەوتەکە ) .. مەلا و سەید کۆبوونەوەیان کرد پاش گفتوگۆ و هەلسەنگاندانی بارو دۆخەکە ؛ سەرئەنجام بریاری ئەوە درا لەم شوێنەدا بمێنینەوە ، چونکە بەراستی چاکترین شوێنە لە هەموو گەرمیاندا بەتایبەت ( کونە تەمشیتەکە ).

ئەو رووداوە زۆر تاوتوێکرا تۆبلێی کەس باسی ئێمەی نەکردبێ ؟یان کەس پێشمەرگەی لەم ناوچەیەدا دیدار کردبێ ؟ یان لەناو خۆماندا دەستەکانی تر هێلی پەیوەندیان هەبی ..؟ یان کەسانێ بەنهێنیێ هاتبێتن ؟ ئەو رژێمە خاوەنی هەموو شتێکە ئەم پرسیارانە گریمانە بوون . وەکو باسم کرد ئێمە (١٩) کەس بووین قەرەبالغ بووین رۆژەکەشی ئاسمان ژانی لێ نشتبوو چاوەروانی باران ئەکرا .

شەوی ٢/١٨ بارانی چاك باری دانە دانە بەرد لە ئاسمانی ئەشکەوتەکەماندا ئەهاتە خوارەوە، وامان بریار دا ( خەباتە سور ، کەریم ،تەها ، سەردار ) بچن بۆ دەستەی ئاش داخ لای کاك حەمە رەش لە پەیوەندیەکەماندا هەندێك سەرکەوتوو بووین ، لە قولی پاریاولە " کاك سەید سەرپەرشتی ئەکرد هەندێ لە ئێمە لەو پەیوەندییانە بێ ئاگابووین ئەمەش وەك دیسپلین ، ئێمە تەداخولمان نەدەکرد ، بەلام ئێمە هەر لەبیری سەرکەوتنی کارەکاندا بووین ؛ گۆرانکاریش لە ستراتیژی کارکردنمان هەونگاوێکە بۆ بەرەو پێش چوونە بەردەوامەکان .

بۆ ئەو مەبەسە هاورێیان شێخ حسام .حەمە کادیر . م. حسێن ، نەوزارد .. دانران بەیانی بگەنە مەوعیدەکەو رێوشوێنیش بۆ ئەو مەبەستە دانرا .

بەسەر جێگاوە بووم برادەران باسی بەردەکانی ئەو شەوەیان ئەکرد کە لە ئاسمانی ئەشکەوتەکە ئەهاتە خوارەوە ، کە بەردوامیش دەهاتە خوارەوە ،

برادەران هەریەك بۆ چوونێکی هەبوو، بەڕاستی هەستمان بەمەترسی نەکرد بەلأم کەسمان لەڕوومان نەدەهات دەریببڕین .. ئەم ژیانە هەمووی بەربەرکانییەو چاونەترسانە لێرە هەندێ نەریت و عورف وا لە مرۆڤ دەکات لە گەڵ مەرگدا ململانێ بکات ، ترسیش لە مەرگ بە عەیبە ئەهاتە ئەژمار ، مەلا باسی پێشمەرگەیەکی کرد لە برادەرانی حیزبی شیوعیی کە چۆن ئەشکەوت ڕووخاوە بەسەریدا .

– م . حسێن : ئەم ئەشکەوتەی ئێمە دوولایە ئەگەر لایەکیشی بکەوێ لاکەی دیکە ئەمێنێتەوە .

دیار بوو هاتنە خوارەوەی ئەو بەردانە پرسیاری دروست کردبوو ، بەلأم بۆ ئەوەی کەس بەوی تر نەڵێ فلان ئەترسێ مەسەلەکە زۆر بەجدی وەرنەگرا .(( بێزاریش لەو جۆرە ژیانە ئەو جۆرە ئیهمالییەی دروست کردبوو لە ناخماندا ))

پاش نیوەڕوان ئەگەر جووڵەیەك بووایە ئەکرا ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بۆ ئەم جۆرە ژیانەچاك نییە ، ئەزموونی شۆڕشگێریش دەریخستووە کە نابێ پارتیزان ژیانی سستی هەڵبژێرێ ، واچاکە کاربکەی بۆ ئەوەی هەست بە بەتاڵی نەکرێ ، کاك موکەڕەم لە گەڵ کاك ئەحمەد زەرداوی هەندێ کەلو پەل و جلی چڵکن و خوێناوییان کۆکردبووەوە بیبەن بۆ لای دەستەکەمان کە ( ملجە)یان ، هەبوو تەقریبەن سەعات ونیوێ دووربوو، ئەوان هەستان کاك رەحیم وتی چاوەڕوان بن منیش دێم ، قوڵنەیەکمان ئەوێ ( قازمە ) کارمان پێیەتی ، پاش ئەوەی دەرچوون ماوەی چارەکێکی پێ چوو کاك رەحیم هاتەوە .

من لەسەر بەرزییەکەی بەشی دووەمی ئەشکەوتەکە دانیشتبووم ،لە چاو دێریدا بووم ، برادەران لە ژوورەوە هەریەکەیان بە شتێکەوە خۆی سەرقاڵ کردبوو ، " جڵەوی بیرو هۆشم پێی ئەوتم ئێرەو ئەم ژیانە خۆڕاگری ئەوێ پیاوی پارتیزان وەك سۆفی وایە جڵەوی نەفس ئەبێ توند بکات ئەگینا کاری بۆ ناکرێ "

لەسەر جیگاکەم ڕاکشابووم هەردوو دەستم نابووە پشتی سەرم بەرەو ئاسۆ ئەم ڕوانی تا چاو بڕبکا هەردەو لوتکەیە ...... هەندێ سەوزایی چەمەکەم لێ دیار بوو ، واشەیەك جار بەجار خۆی ئەکردە دۆڵەکەدا بۆ نێچیر ئەگەڕا ... نەئاوە دانییەك نە دوکەڵێك هیچ جۆرە ڕواڵەتێك بەدی نەدەکرا ڕۆژ بەرەو ئاوا بوون ئەچوو ، هەندێ لە لوتکەکان تیشکی زەردی خۆری گرتبوو ، ئەم جۆرە کاتە مرۆڤ حەزی لە گەڕانە ، کەچی ئێمە ئازاد نین .. من ڕانەکشاوم لە نێو پارکێکدا و لە سەر جێگایەکی نەرم و نیاندا ، جڵەوی هەستم ئازاد نەکردووە و نایەڵم بە ئارەزووی خۆی بیر بکاتەوە ، من پێشمەرگەی میللەتێکم قەوارەکەی بەرەو لە ناو چوون ئەچێ ، بەڕاستی ئەرکێکی زۆر گرانە .. دەنگی کۆترەکان ئەهات ئەگەڕانەوە بۆ هێلانەکانیان سوودیان لە بوونی ئێمە وەرگرتووە ڕەنگە واشەکان سڵمان لێبکەنەوە !!

مەلا بەسەر قەرەویلەکەیەوە ئە خوێنێتەوە سەرینەکەی دانابوو . م . حسێن ڕاکشابوو .. کاك سەلام ڕادیۆکەی بەدەستەوە بوو چاوەڕوانی دەنگی گەلی کوردستانی ئەکرد ئەو بۆ خۆی گوێبیستی ڕادیۆ بوو ، کاك حەیدەر نەخۆش بوو لە ژێر جێگادا لێی کەوتبوو ، کاك پۆلا دەستی شکاوە لە گەڵ کاك حەمید قسەیان ئەکرد لە سەر خۆ هەر لەناکاودا کاك سەلام ئیزگەکەی دۆزییەوە هەموومان گوێ بیستی بووین . چالاکیەکانی ئەخوێندەوە لە دڵەو وا هەستمان ئەکرد کە لەگەڵیاندان ، ورەی پێ ئەداین .

بە هۆی پەیوەندیەکانمانەوە ئەو کەلو پەلانەی ئەمان ویست پێمان ئەگەشت من بۆ خۆم زۆر سڵم لەو جۆرە پەیوەندییانە ئەکردەوە چونکە ئێمە پێویستمان بەو جۆرە خەڵکانە بوو کە پەیوەندی دوو لایەنەیان هەبوو . کێ ئەڵێ ئەمانە تەسلیمی بەرژەوەندییەکانی خۆیان نابن ، لەبیری ئەمانەدا بووم کاك سەلام بە کاك سەیدی ووت : لە کاتژمێر (٥) تێ پەڕی کرد کاتی پەیوەندییە ، کاك سەید هەستا و بێ

تەلەکەی (جیهان) هەلگرت . بانگی لێکردم وەرە با پێکەوە بڕۆین .. چەك و دووربینەکە لە گەڵ خۆت بهێنە ... چەکەکەم (BKC) ی بوو شێخ حسام لە گەڵ خۆی بردبووی دووربینەکەش هی مەلا بوو کە هەڵم گرت پێی ووتم وریای باران بە وشکیەکەوە .. چەکیشم نەبرد دەرچووینە دەرەوە دنیا مەغریب بوو کاك سەید چووە سەربەرزییەك ١٠٠- ١٥٠ م دوور لە تەنگەکە لە سەر ئەو ڕێچکە ڕێگایەی کە لە داری خلەوە دێتە خوارەوە دەستی بە پەیوەندکردن کرد منیش چاودێریم ئەکرد ، دروست کاتژمێر ٥:٣٠ خولەك لە پەیوەندی بووەوە شتێکی سپی لە دوورەوە دیار بوو پێ ووتم بزانە چییە ؟ دووکەڵە ١٠ مەتر لێم دوور کەوتەوە نەگەڕایەوە دنیا زۆر کپ بوو لە ناکاودا دەنگێکی گەورە پەیدا بوو .. دەنگە کە دەنگی ڕووخان بوو .. سەید هەڵوێستەیەکی کرد منیش ڕام کرد بۆلای دەنگی لێوە نەهات بەرەو برادەران و تەنگەکە بەرێ کەوتین .

کەچووین ئەشکەوتەکە سەران سەر تەپیوە بە بڕی ١٠ م چەو خۆڵ شوێنەکەمانی پڕ کردوەتەوە کۆترەکان لە هێلانەکەیان دەرچوو بوون ئەوەندە پەشۆکابووین چووینە سەر خۆڵەکە دەستمان ئەگەیشتە کونە کۆترەکان . کاك سەید زۆر بانگی کرد هاواری کرد .. هیچ دەنگێك نەبوو من هاتمەوە سەر هۆشی خۆم و دەستم کرد بەچاودێری .. چەکم پێ نییە. زۆر دامام .. لەوەها بارێکدا چەك زۆر گرنگە ، کاك سەیدیش دەمانچەکەی نەهێنابوو ، زۆر بەخۆمدا چوومەوە نە ئەبوایە ئەو تووڕەبوونەی کاك سەید وای لێبکردمایە چەك نەهێنم .

کاتەکە زۆر نالەبار بوو ، ئەشکەوتەکە تاویر نەبوو ( شەقی بۆشاییەك بوو) نە دەنگی هەناسە نە ئاوەدانی ! ! کاك سەید زۆر هاتوو چوو کەزانی هیچ سوودی نییە دانیشت چووم بۆلای بە کوڵێ خەمەوە تێی ڕوانیم ، جگە لە بێ تەلەکە ( جهان) هیچمان لانییە ، ئەوا شەویش داهات ، ڕاستە دەستمان نەکرد بەگریان بەلام سنووری بێ تاقەتیمان وای لێکردین هیچ قسەمان بۆ نەئەهات ، ئێمە چیمان باس

ئەکرد پێش نیو سەعات ئێستا چیێ ڕوویداوە ، ماوەیەك دوور لە هەستی خۆمان ماینەوە ، کاك سەید هەڵساو بەرەو ( بەردە لەگ ) کە دوو بنکەمان لەوێ بوون ڕێگا پێچو پلوچەکەکانمان گرتە بەر .

دونیا زۆر تاریك بوو کەسمان چەکمان پێ نەبوو لە ڕێگا کاك سەید لای کردەوەو پێ ووتم بانێوانمان هەبێ بێ ئەوەی قسەیەك بکەین ! هەر یەك لە دەریایەك بووین من ساتەکانی رابردووم بە بیر خۆمدا ئەهێنایەوە کە چۆن ئەو هەموو تێکۆشەرانەمان لە دەست دا ئێمە ماوەیەکی زۆرە پێشبینی ئەو ڕووداوەمان کردبوو ، قسەمان لێ کردبەڵام بۆچ گرنگیمان پێ نەدا ؟ .

کە گەیشتینە ئەوێ برادەران سەرقاڵی چێشت لێنان بوون (نیسك ) هەموومان لە دەوری یەك کۆبوینەوە ، ئەوان قسەی خۆشیان ئەکرد پاش سڵاو کردن هەستیان کرد بارەکەمان زۆر ناسروشتیە ، نەچەکمان پێیەو زۆریش بێ تاقەت دیارین .

– ئەوە چییە بۆ وا بێ تاقەت و بێ چەکن ؟ ئەم ئەو پرسیارە

– وەڵامەکەی زەمین لەرزەیەك بوو بۆ خۆی !

کاك سەید هەموو ڕووداوەکەی بۆ باسکردن ، بێ دەنگی و ناڕەحەتی وەك هەورێکی ڕەش باڵی کێشا بەسەریاندا ، هەرچۆنێك بوو نانمان خوارد لە پاشاندا هەموومان گەڕاینەوە بە ئومێدی ئەوەی شتێك گۆڕانکاریەك بکەین ، بەڵام هیچ نەبوو دۆڵێکی کپ وەك ئەوەی رۆژێك لە ڕۆژان ژیان لێرە نەبووبێ . ئەوانەی تادوێنێ هەڵگری دنیایەك ئاوات و خولیاو هیوا بوون لە ژێر ئەو خۆڵەدا ئەسیر ماون ! !

بەو خەمەوە سەرکەوتین بۆ ( کونە تەمشیتەکە) کە چەند ڕۆژ پێش ئێستا لەوێدا بووین ، دڵمان لای کاك شێخ حسام و برادەرانە ، بۆیە ئەبێ بچینە ڕێگایان و ئاگاداریان بکەینەوەو دواتر بگەڕێنەوە بۆ (کونە تەمشیتەکە) .

– تائەگەینە ئەوێ هیچیان بۆ باس نەکەین .

ئەو شەو چاوەڕوانی کاك شێخ حسام و برادەران بووین ، مانگە شەو بوو بەڵام مانگ گیرابوو لە گەڵ ئەو برادەرانەدا لە ڕێگا چاوەڕوان بووین جۆرەها بیرکردنەوەمان بۆ ئەهات خەمی ئەو برادەرانەمان جڵەوی هەستی ئازاد کردبووین ، بۆخۆم خەیاڵاتی وام بە بیردا دەهات هەرجارەی لە هەوارێك خۆم دەدۆزیەوە !

یادگارییەکان ئێش و ئازارەکان بەربەرەکانی و خۆ بەدەستەوە نەدان لە کۆتایی هەر بیرکردنەوەیەکمدا بۆم دەرکەوت ئەمەیە چارەنووسی ئەم ڕێگایە ... پاش ماوەیەك چەند تارماییەك بەدیار کەوت ، بۆم دەرکەوت کاك شێخ حسام و برادەرانن ، ئەم هێشت هەست بکەن کە گەڕاینەوە لای کاك سەید ئەوان کارەساتەکەیان بۆ باسکردن . پاشان کاك سەید بەبێ ئەلەکە ئاگاداری هەموو لایەکی کردەوە و ئەو هەواڵە جەرگ بڕو ویژدان هەژێنەی پێ ڕاگەیاندن ..

هەموو برادەران لە هەموو بنکەکانەوە ئەهاتن بۆ لامان بۆ دڵدانەوەو بەشداری کردن لەو کۆستە گەورەیە .

ئەو شوێنەو ئەو مرۆڤە فریشتە ئاساو تێکۆشەرانەمان لەژێر ئەو خاکە پیرۆزەی کوردستاندا . بۆ ڕۆژگارو زەمانە تابزانین چارەنووس بەرەو کوێ ئەڕوا .. بەڵام هەرکاتێ دەروازەی تەنگەکەو قەڵبەزەکەم دیدار ئەکرد ، ئەوەندەی تر ڕق و کینەم بەرامبەر بە دوژمن زیادی ئەکرد گڵپەی تۆڵە لە ناخمدا بەرز ئەبووە ، هەستی شۆڕشگێرانەم زیادی ئەکرد .

هەزاران هەزار ڕەحمەتان لێبێت شەهیدانی ئەشکەوتی داری خلە، خۆزگە ڕۆژێ ئەهات شوێنەکەتان ئەکرا بە مەزارگەی شەهیدان و نموونەی خۆڕاگری ڕۆڵەکانی گەرمیان .. ئێستا پێخەفی نەرموو نۆڵی شەوتان بەردو خۆڵی داری خلەیە .

(1) لە زاری پێشمەرگەی پارتیزان ( حەمە سۆران ) ەوە وەرگیراوە

# دار کونارەکە

## ((جێی ژووانی عاشقانی نیشتمان))

پاش ئەوەی هەموو هەوڵێکماندا بۆ مانەوەو بەرگریکردن لە خـود و بەسـەر هـەموو تەنگ و چەڵەمەکانی رۆژگاردا زاڵ بووین ، ئیدی هێدی هێدی داهاتین .. بیرمان لەوە کردەوە کە چۆن پەیوەندی لە گەڵ میللەتەکەماندا دروست بکەین .

هەندێ لـەو عوزلەتـە کـەم بکەینـەوە و ئاگـاداری رووداوەکـانی ناوشـاربین ، جگـە لەوەش راستە ئازوقـەمان پەیـدا کـردووە و شـاردومانەتەوە، ئێمـە ئازوقـەکانمان لـە حەشارگەکانی خۆمان قایم کردبوو ، لەترسی ئەگەری هەر کێومالکردنێکی رژێم ، بـۆ ئەوەی ئەو ئازووقانە وەکو یەدەك ( ئیحتیات) بمێنێتەوە .لەڕووەوە زۆر سەرکەوتوو بووین ، هەوڵدان بـۆ راهـاتن لـە گـەڵ ژیـانی پارتیزانیـدا هـەنگاوی چـاك نرابـوو ، لـە خۆبوردنێکی چاکمان تێدابوو بەڕاستی گیانی هاوکاری و دەستە جەمعی تیاماندا لـە ترۆپـك بـوو سـەرکردەی لێبوردەمـان هـەبوو ، زۆر بەسـەبر و تەحـەموول بـوون لـە گەڵماندا ، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ژیان زۆر قورس و دژوار بـوو ، کەهەسـت بکرایـە کەسێکمان لەڕووی دەروونیەوە ئاڵۆزە هەوڵدەدرا هاوکاری بکرێ .

وەکو پێویستیەکی رۆژانە هەندێ کەل و پـەل بـوو نەئـەتوانرا دەسـتی لێ هـەڵگرین لەوانە پێڵاو ( ئەدیـداس ) لـەو ڕووەوە زۆر گرفتمـان هـەبوو چـونکە زۆر ئەگـەڕاین . جگە لەوەش جۆری پێڵاوەکە گرنگ بوو ،هـەروەهادەرمان و درزیـو شـتی پزیشـکی ... هەنگاوی یەکەمان کار بۆ ئەوە ئەکرا پەیوەنـدی لەسـەر ئـەو بناغەیـە دروسـت بکەین ، خۆ ئەگەر بانە رۆژ کاربکرێ پەرە بەو پەیوەندییە بدرێ بۆشتی تر چـاکترە ، بەڵام قۆناغی یەکەم بۆ ئەو مەبەستە بێ ، چونکە زۆر جار باس لەوە ئەکرا گرنگە هەنگاو بنێن بەو ئاراسـتیەو لـە نـاو شـارەکاندا چـالاکی بکـرێ ، بـەڵام کـاتی مـاوەو پرۆژەی تۆکمەی ئەوێ .

یەك لەوكەسانەی كە رۆڵی زۆر گرنگی هەبوو لەو برادەرانە ؛ هەرچەندە خەڵكانی تریش هەبوون لە هاوكاریدا و رۆڵیێ بەرچاویان گێڕاوە ، ئەگەر توانرا پەیوەندیان پێوە بكەین ... كاك ئەبو عەلی ناسراو بە ( هاوڕێ سوپا) لە قۆڵی كفرییەوە رۆڵی چاكی هەبوو ، جگە لەوەش وەكو لەبیرەوەرییەكانیدا باسی كردووە لە( كتێبی دار كونارەكە ) پەیوەندی بەرێكخستنەكانی ناوخۆشەوە بووە بۆ ئەوەی رۆڵی ئەو پەیوەندییانە و كاریگەریان باسی بكرێت مافی خۆیانە لەم پرۆژە مێژووییەدا فەرامۆش نەكرێ، لەو بیرەوەرییانە وەكو خۆی باس ئەكەین .

كاك سوپا وەك لە بیرەوەرییەكانیدا بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەڵی " پاش كارەساتی ئەنفال تەكلیف كرام بۆ سەرپەرشتی یەكەمی رێكخستەكانی گەرمیان پێم قبوڵ نەكرا و پێشنیاری هاوڕێ سامیم كرد، كە هاوكاری كۆبوونەوە دانیشتنەكانم ئەكرد ئاگاداری ئیش وكارەكان ئەبووم ، بەتایبەت هاوكاری پارتیزانەكان كە هاوڕێیان( سامی ، ئیسماعیل مەردان ، سەردار ، جەلال عەبدوڵلا ، خەلیفە ناسراوە بەخەلیفە ) لەلایەن ( كاك موراد ، حمە نوری و بەهجەت و حەمە رەشید باریكەی ) سەرپەرشتی ئەكران ، ئەوكات لە بازنەیەكی بچووكدا ئەسوڕاینەوە بە كۆڵ شت ئەگەیشتە پارتیزانەكان زۆرجار لە كۆڵیش كەمتر ، زۆریش گران بوو بەڕیوەبردنی (٦٠-٧٠) پێشمەرگە بەكۆڵ لەرێگای دەواجنەكەی ئاوە خوێرییەوە پەیوەندی ئەكرا ئەو رێگایەش تاڕادەیەك عەمەلی نەبوو چونكە (پ.م) لە نێوان دوو رەبایەوە هاتوو چۆی ئەكرد ،بۆ ئەوەش تووشی شەڕ ئەبووین هەر ئەوەش وای كرد هاوڕێ سەردار و خەلیفە دوور كەونەوە لە وڵات .

لە مانگی تیشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٨ ئەركەكانی هەموو رووبەرووی من بووەوە ، لەگەڵ هاوڕێ عەزیز چ وەك دابینكردنی بژێوی پارتیزانەكان و ئەڵقەی گەیاندنی نێوان رێكخراوی سلێمانی و پارتیزانەكان . بۆ ئەو مەبەستە زۆر بیرم كردەوە لە هەر شارێك لە هەر لادێیەك بەڕەبییە ئەنراوە كارێكی زۆر گران بوو ، لە كۆتایی

ساڵی ١٩٨٨ دا بوو هـاوڕێ بەهجەت باسـی معاناتی پارتیزانەکانی بۆ کـردین بـە تایبەت کاك (عوسمانی حاجی مەحمود ) و هاوڕێکانی زۆر پێویستە بە هەموومانـەوە کار ئاسانیان بۆ بکەین بۆیە نامەیەکم نووسی ، بۆ کاك عوسمان و چـەند جێگایـەکم بۆ دیاریکرد لەدەرووبەری شاری کفری یەکێك لەو جێگایانە ( دارکونار) ەکەی نێـوان کفری و گوندی کگنربـان بـوو لـەمانگی ئـازاری ١٩٨٩ وەلأم هاتـەوە ئـەو شـوێنەیان دیاریکردبوو ، نهێنیەکەش ئازادەسوور بوو.

سـەرەتای ئـازاری ١٩٨٩ بـوو لـە شـوێنی دیـاریکراو بڕیـاری مەوعیدەکەمانـە ، دەرچوون لەشار کـارێکی ئاسـان نییـە ، نازانیـت چـۆن دەرچیت و لـە کوێـوە ؟ لـە نامەکەدا داوای پاترییەکی سـەیارەی پـڕ شـەحن کرابـوو ، بـۆ جیهـازی راکاڵەکـەیان لەگەڵ شەش جووت پێڵاو و هەندێ بەشە خواردەمەنی ، ئەمەش قورساییەکی زۆرە ، دوو سەربازی ونمان هەیە کە هەردەم ئامادەبوون بۆ جێبـەجێکردنی هـەر کـارێکی لەو چەشنە ، هەرکارێك پێشوازیکردنی مردنی تیادا بێت هاوڕێیانی رۆژانی تەنگانـەن ، بەرێزان ( کاك ئەنوەر کاریزی و کاك مەجید رەباتی ) .

ناردم بە دوایاندا بێ دواکەوتن ئامادەبوون ئەرکە دیاریکراوەکەیان بە تراکتۆرەکەی کاك ئەنوەر گەیاندە شوێنی خۆی بە ناوەی کاروباری کشـتوکاڵیەوە، کاتـژمێر (٦) ی ئێوارەی هـەمان رۆژ گەڕانـەوە لام دڵنیـان کـردم لـە بـەجێ گەیانـدنی ئەرکەکـە ، ئێمەش موعیدمان سەعاتی (٨) ی شەوە هەرچۆنێك بوو ئێوارە لەشـار دەرچـووین گەیشتینە سەر کەل و پەلەکان ،پاشان کەوتینە ڕێ بۆلای دارکونارەکـە .. لـە نزیـك دارکونارەکە رێگامان هەڵکرد تـاوەکو سـەعاتی (٤) ی بـەیانی ئەسـوڕاینەوە هەنـدێ جـار بـەدەنگی بـەرز بـانگی ئـازادە سـورم ئـەکرد ، بـەلأم بـێ هـودە بـوو ، ناچـار گەڕاینەوە کەلو پەلەکانمان شاردەوە .

لە نزیك دێی گردە گۆزینە –کەلار دوای چەند رۆژێك هاوڕێی هەمیشە نـەمر شـەهید حەحە ڕەش چاوی کەوتبوو بە برادەرێکی خۆمان دیسان مەوعیـدی دیـاریکردبوو لـە

هەمان جێگا بۆ رۆژی ١٩٨٩/١١/١٠ ئەو برادەرەی باسم کردن دیسان بە کارەکەی خۆیان هەڵسانەوە دووبارە خۆشم لە گەڵ هاورێ عەزیز بەلادا سوورەوە لە گەڵ حاکم نوریدا کە لەیانەی فەرمانبەران بوو لە گەڵ مامۆستا سەلاحی پەرلەماندا هەندێ خواردنمان کڕی بۆ ئەوەی ئەگەر تووش بووین بڵێین بۆ خواردنەوە ئەچین ، ئەمجارەیان بە رۆشنایی دەرچووین ، بۆ ئەوەی وەکو جاری پێشومان بەسەردا نەیەت ، کاک حاکم لە رێگایەکی ترەوە گەڕایەوە جارێك تەواو تاریك دانەهاتبوو لە گەڵ هاورێ عەزیزدا گەیشتینە بن دار کونارەکە .

ئەو ئێوارەیە باو باران بوو زۆری پێ چوو چەند تارماییەك پەیدابوو لە چوار لاوە روویان تێ کردین ، و ئێمەش هەڵساین و زەلام ئازادە سوورین ! بەیەك شادبووینەوە کە هەڤاڵان حەمە رەش ، عوسمانی حاجی مەحمود ، مەجید دووزی ، سەباح ، کەریم ، بوون زۆر چاك بوو خەڵکی ناسیاویان لەگەڵ نەبوو .

ژیانی پارتیزانی زۆرسەختە و هەموو رووداوێك ئەبێ بیری لێبکەینەوە بۆیە خەڵکی ناسیاو مەترسی هەیە ، جگە لەوەش هەرنامەیە تایبەتی بهاتایە ئەمان خوێندنەوە لەو دووشتە حەقیان پێ ئەدایـن . پاشان کاك حەمە رەش حەزی ئەکرد لە شوێنێك هەندێ ئیسراحەت بکەن ، دەواجنێك لەو نزیکانە بوو ، بۆی چووین سەگمان بۆ هات . ویستم نان بدەم بەسەگەکان ، کاك حەمە رەش نەی هێشت ، هەندێ نانی کۆنی خۆی بۆ فڕێ دا بەڵام سەگەکان نانەکەیان نەخوارد ! ئەوەندە کۆن بوو .. ئێمە سەگەکانمان مەشغوڵ کرد ئەو چوو دەواجنەکە تاقی بکاتەوە ، گەڕایەوەکەسی لێ نییە .

ژوورێکی لێ بوو ، چەند بەتانییەکی کەوتوو بوو ، کە چووین باران بەلێزمە ئەباری .. لە ژوورەکەدا نان و چا خورا ، پاشان کۆبوونەوە دەستی پێکرد ، زۆر شتمان تاوتوێکرد، بەتایبەت ژیان و گوزەرانی پارتیزانەکان و دەنگو باسی ناوچەکە ،

دانیشتنەکەمان تا کاتژمێر (٣)ی بەیانی بەردەوام بوو .. کاك عوسمان وتی : کاك شێخ کات درەنگە و چاکە بجولێین پێلاوە کۆنەکانیان گۆڕی .

دنیا زۆر تاریك بوو ئەوان دەرچوون ، ئێمەش تاوەکو (٨)ی بەیانی چاوەڕوان بووین بارانێکی زۆر باری بوو ، پاشان گەڕاینەوە .

– سەرکەوت یەکێ لەو پێشمەرگانەبوو کە لە گەڵ کاك ئازادی سەگرمە بریندارببوو ساڵی ١٩٨٨ لەوە ئەچوو کە برینەکەی سەخت نەبووبێت ، بەڵام لە مەوعدێکی تردا لە ساڵی ١٩٨٩ کاك عوسمانی حاجی مەحمود وتی : هاوڕێ سوپا سەرکەوت لەشاخ کەوتووەتە خوارەوە ، هەردوو دەست و هەردوو قاچی شکاوە ، لە کونە شاخێ دامان ناوە، چار نییە یان ئەبێ هەمووومان بەدەوریدا بکوژرێن یان لەو کونە شاخەدا بەجێی بهێڵین .

منیش بۆ دەربازکردنی گیانی ئەو پێشمەرگەیە سەیارەکەی عەبدوڵای پوورزام بەکار هێنا خۆم و کاك یاسین لە دوای مەلا بانگدان دەرچووین زۆر چاك بوو ئەو کاتە پاسەوانی ڕەبایەکە نووستبوو ، لە تەنیشت ڕەبایەکە سەیارەکەم کوژاندەوە و بەبۆش نەوەك کەس بمانبینێت ، لە شوێنی مەوعیدەکە ئەو جەنازەیەمان هەڵگرت کاك عەزیز لەوێدا بوو پێش ئێمە ( بە ایە الکرسی ) خوێندن گەیشتینە ناوشار جلی پاك و بەڵگە نامەی نەخۆشخانەمان ئامادە کردبوو (سەربازی ) بۆ سەرکەوت .

م. یاسین دەلیلی ناوشاری سلێمانی بوو ، هەروەها ماڵی براکانی کاك سەرکەوتی دەزانی تاوەکو تونیلی دەربەندیخان کەس هەواڵی لێ نەپرسین لەو پرسگەیەدا سەرو دڵیان گرتین داوای روخسەت و ناسنامەیان لە سەرکەوت کرد من پێکەنیم ... سەربازەکە وتی بۆ پێ ئەکەنێ ..پێم وت : بۆ چ داوای پێناسە لە ئێمە ناکەی ئەو برادەرە معەوەقی قادسییە هەردوو قاچ و دەستی شەلە .

مۆڵەتەکەی سەرکەوتم پێدا ، عەیبی نەبوو تاوەکو سلێمانی کەس پرسیاری لێ نەکردین ، بەسەلامەتی ئەو کارەش ئەنجامدرا . دەربارەی تاقیکردنەوەکە نەك تەنها

لای پارتیزانەکان شتێکی نوێ بوو بەڵکو هیچ قاموسێك لە دونیا واتای لەو بابەتەی نەگرتبووە خۆی ، ژیان لە ناوچەیەکی وێران کراو بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بێ ئەوەی چاوت بە ئادەمیزاد بکەوێ هەرجێگایەك ئاوەدانی تێدا بێت تەلبەند کرابێت ، بەنوێترین چەکسازی و چاودێری کردن ، رێگاو بانەکان بە سەربازگەو تانك و جاش تەنراوە جگە لەمانەش دەیان کۆپتەر و هەزاران سەرباز کێومالکردنی بچوکترین نیشانەی ژیان و ئاوەدانی ئەبێت ....

بەلام سەرەرای هەموو دژوارییەکان پێشمەرگە پارتیزانەکان راهاتن لەسەر ئەو چەشنە ژیانە بە بیرو باوەڕەوە ، ئەمەو زۆر شتی تریش کاك سوپا لە کتێبی دارکونارەکەدا باسی لێوە دەکات ئێمە ئەم نموونە بچوکەمان لە کۆڵە مەرگی ژیانی پارتیزانەکان هەڵبژارد بە هەندێ دەستکارییەوە ....

(٢) لە کتێبی ( دارکونار) وەکەوەرگیراوە هاورێ سوپا ( ئەبو عەلی)

## بناری خاڵخاڵان

### ((جیابوونەوەی مەفرەزەکان لە دۆخە ئاڵۆزەکاندا))

ڕێکـەوتی ١٩٨٨/٥/٦ وڵات وێرانـە، قـەیران ڕووی تێکردبـووین، هەرچـۆن بیرمـان ئەکردەوە ڕێگا نـەبوو ، مرۆڤـی وەك ئێمـە ڕێگـای بـۆ ڕوون بێتـەوە ، ئێمـە تـاوەکو دوێنێ هێز و بڕواو ئامانجی گەورە ، ئێمە تاکو دوێنێ وەك هێزی بوون حسـابمان بـۆ ئەکرا ، ئێستا سەرلێشێواو کەس خۆی بە خاوانمان ناکات، ئەوەتا کاك هێمن پێمـان ئەڵێ : هەرکەس ڕێگا چارەی خۆی بدۆزێتەوە .

پاش کۆبوونەوە لە بناری خاڵخاڵان لە هـەردەی ماسـی قـەلان ڕێکـەوتی ١٩٨٨/٥/٦ کۆمـەڵێ (پ.م) بـووین لـە کـەرتی چـواری جـەباری عەسـر بـوو لـە دۆڵێکـدا کۆبوونەوەیـەکمان کـرد، زۆرمـان وت بـەڵام نـەتوانرا بڕیـار بـدەین ، بۆیـە پـاش گفتوگۆیـەکی زۆر بڕیارمـان دا بگەڕێنـەوە بـۆ ناوچـەی جـەباری چـونکە زۆر شـارەزابووین . ئـەتوانین ماوەیـەك لـەوێ خۆمـان بشـارینەوە ، تـاوەکو هەنـدێ بەرچاومان ڕوون ئەبێـەوە.

داوامان کرد لە تیپی (٢١)ی کـەرکوك کەسـی شـارەزامان لـە گـەڵ بنێـرن بـۆ ئـەو مەبەستە ، پێشنیارەکەیان قبوڵ کـرد و دوو کەسـی زیـرەك و لێهـاتوو و شـارەزایان بۆمان دابین کرد. کاتژمێر (٦)ی ئێوارە بەڕێ کەوتین ڕێگا کەمان گرتە بەر جگە لە چەك و مەتارەی ئاو هیچ خۆراکێکمان پێ نەبوو ، ئێمـە وامـان دانـابوو بـۆ گونـدی (هەیبە) بـڕۆین لـە گـەڵ دڵـە ڕاوکـێ و ئامادەباشـیدا هـەردەکان و دۆڵـەکانمان پـەی ئەکرد زۆر جاریش دەمە تەقەدەستی پێ ئەکرد ، بەڵام قارس و جاڕس و بـێ ئامـانج ....

بەسەر هەرگوندێکدا گوزەرمان ئەکرد، ئەسووتاو ئاگری لێ بەرز ئەبووەوە هەردەکە پڕ بوو بوو لە دوکەڵ و بۆنی بوکوڕزی لێ ئەهات ، هەندێ جار دەنگی سەگە وەر ، یان قولەی کەلەشێر ئەهات ، بەلآم هەمووی چۆڵ ، ئەو شەوە بەدرێژایی بەرێوە بووین کاتژمێر (٤) ی بەیانی گەیشتینە گوندی (هەیبە) جارێ دنیا تایك بوو ، خۆمان کردە ماڵێکدا چۆڵ و هۆڵ بەلآم تەشتی نانمان دۆزییەوە، هەریەکە نانی بۆ خۆی هەڵگرت .

دێکە جارێك نەسووتابوو هەموو شتێ لە جێی خۆیدا بوو بەلآم کەس لە دێکەدا نەمابوو . ترسی ئەوەمان هەبوو جاش و جەیش پەیدا بێ بۆیە خۆمان کردە چەمەکەدا ، تاقی بەیانی بوو جاش و جەیش پەیدا بوو ، ترسمان لێنیشت بۆ ئێمە هاتبێتن یان کەسێ هەواڵی ئێمەیان گەیاندبێ خۆمان ئامادە کرد بۆ هەر ڕووداوێك ، بەلآم دیار بوو بۆ ڕاو ڕووت هاتبوون بەناوی گوندەکەدا ئەهاتن و ئەچوون ، ئێوارەکەی کۆپتر پەیدا بوو ، ئێمە پڕ چەك بووین، باش بوو هیچ ڕووداوێك رووی نەدا ئێمە تاوەکو ئێوارە ماینەوە ، شەو هاتینەوە سەر جادەی سلێمانی – کەرکوك کەمینی لێ بوو بڕیارماندا بڕۆین ئەگەر تەقەیان لێ کردین شەر ئەکەین .پەڕینەوە دیار بوو جاش بوون بە کوردی قسەیان ئەکرد . وتیان ئەوانە هاولآتین کەس دەست نەکاتەوە بابڕۆن تاوەکو گوندی خاڵە بازیانی نەوەستاین هێواش هێواش لەوێدا کۆبووینەوە ، بڕیارمان دا ببین بە چوار مەفرەزە...

١– بۆ چەمی پەڵکانە .کاك شوکر سەرپەرشتی بکات .

٢– بۆ چەمی تۆمەرەگەدە . کاك سەمەد گلی سەپەرشتی بکات

٣– بۆ هەردەی حەمك .خۆم ( حاجی ئەمین ) سەرپەرشتی بکات .

٤– بۆ کەیل هەیاس کاك حمە ناسیح شەرپەرشتی بکات .

پاش ئەوەی لەیەك دابڕاین هەر کەس بۆ شوێنی دیاری کراو کەوتینە ڕێ ڕاستیەکەی ئەو پرۆژەیە بۆ ئەوە بوو ئەو هەموو خەڵکە نە ئەکرا پێکەوە بن لەو

هەردە دا، بەهیچ شێوەیەك لە رووی پارتیزانییەوە كۆنترۆل نەئەكرا جگە لەوەش هیچ بانە رۆژ دیارنەبوو ، هەموومان لە یەك ئەترساین بۆیە بەباشمان زانی كۆمەڵ كۆمەڵ بین ، ناوچەكەش فراوان بوو لەوەش خراپتر هیچ پەیوەندییەكمان بەسەرەوە نەبوو ، خۆشمان هیچ ئامرازی پەیوەندی كردنمان لە نێواندا نەبوو ، بۆیە لەوكاتەوە لەیەك دابڕاین هەركەس بۆ خۆی بڕیاری ئەدا و پرۆژەی نەبوو جگە لە هاورێ كانی خۆی نەبێ زۆر لەو برادەرانە تووشی گرتن و كوشتن و گەڕانەوە بوون بۆ لای رژێم ..دوو (پ.م ) عەزەرەش و شامیل گیران و قەنارەكران ئەو بێ سەرپەرشتییە كاری زۆر خراپی كردە سەرمان لە هەموو ڕوویەكەوە .

ئێمە لەهەردەی حەمك ماینەوە وڕاهاتین بەو ژیانە ، سەرچاوەی ئاو شارەزا بووین ئەشكەوتەكان شارەزابووین ، خۆراك و كەل و پەلمان پەیدا كرد لە گوندەكانی ناوچەكە فێری چێشت لێ نان و كەل و پەل شۆردن بووین . ئەوەی زۆر گران بوو لامان نان كردن بوو ، بەرمیلمان سەرهەڵهێنابوو لەئەرزەكەدا لەچاڵ نابوو نانمان ئەكرد، بەلاَم چۆن نانێ هەر ( خەپكە ) بوو زوو زوو جێگۆڕكێمان ئەكرد لەم ئەشكەوتانەدا سەعەنیار. قووشەلان . لە هەردەی تاڵەبان ئەشكەوتی زیخەكە .مولەقەكە .

ئەم ئەشكەوتانە بۆ ئێمە زۆر گرنگ بوون ، لە چاو دوژمن ئەی شاردینەوە، زۆربەشیان ئاو و زەلكاو وشوێنی ژیانی لێوە نزیك بوو ، كاتەكان زۆر تر بەقسەكردن بەسەر ئەچوو زۆر حەزی هەواڵمان بوو ، ئێمە بەڕاستی هەر چاوەڕوانی رووداو و هەواڵ بووین نەمانئەزانی چی بكەین، بەلاَم بڕیارماندا خیانەت نەكەین خۆ ئەگەر توانرا بەم حاڵە ژیان بەسەربچێت تاوەكو سەرەوە بڕیار ئەدەن لەم بارەدا چی بكرێ كەسی واشمان لەگەڵ نەبوو لەو جۆرە بارەدا لێزانی هەبێ رێنماییەكمان بكات ، بۆ خۆمان هێزێكی چاك بووین ئەگەر رێكخرایە .

ئەم بەیانییە هەر بۆ هەواڵ زانین و ئاگاداری ناوچەکە لە لای ئەشکەوتی قوشەلانەوە دەرچووم ، بەدۆڵەکەدا لەبن کاچێکدا زەلامێ نووستبوو ، کەل و پەلی دانابوو،چوومە ژوور سەری ئاگای لێ نەبوو هەڵم ساندو هەندێ شپرز بوو ئەو بەمنی وت:

– چی ئەکەی لێرە ؟

–خۆم شاردوەتەوە.

– بۆچی ؟ پێشمەرگەم ..

– کێت لەگەڵ دایە ؟

پێم وت ئەی تۆ چۆن ئەژی ؟ وتی خۆم بۆ خۆم نان ئەکەم سینیەکی لەسەر سێ بەرد دانابوو ، ماوەیەك لای مامەوە ، بۆم دەرکەوت ناوی عەبدوڵلایە ئاوازەی خراپ بوو ، بەلام هیچ باوەڕی بەکەس نەبوو هەمیشە خۆی ئەشاردەوەتەنانەت لە ئێمەش ، راستی ئێمەش هەندێ ئاشکرابووین ، هەبوو ئاگادارمان بوو کە ئێمە لەو ناوچەیەداین ، وەکو باسم کرد کەس نەبوو رێنمایمان بکات هیچ پەیوەندیمان نەبوو لەگەڵ کەسی خۆماندا، زۆرتر هەرکەسەو لە هەوڵی خۆیدا بوو عەبدوڵلا شێت رۆژێ هات بۆ لامان داوای تاقمی تەراشی کرد بەیانی جەژنی رەمەزانەو واچاکە تەراش بکەین ، پێم وت عەبدوڵلا کەس دێ بۆ لات خواردنت بۆ بهێنێ ؟ وتی نەحێر .. پێم ووت : ئەی چۆن ئەژی ؟ بێ دەنگ بوو ، راستی نەوت بەلام من ئەم زانی دێن بۆلای بەتایبەتی دایکی زۆرجار سەری لێ ئەدا .

بۆ ئاگاداری خۆمان هەمیشە جۆرە وریاییەك هەبوو حەرەسیاتمان بەردەوام بوو بۆ چاودێری ، حەرەسەکە لە بەرزاییەکەوە پاسەوانی ئەکردین ، ئەگەر لەناکاو کۆپتەر بهاتایە هەر لەوێدا خۆی ئەشاردەوە بۆ ئەو مەبەستە زۆر سودمان لە روەك و زەل و پۆش وەرئەگرت . سنوری خۆ شاردنەوە و پارتیزانی ئێمە زۆر زۆر بوو لە ناوچەی قەرە حەسنەوە بۆ سەنگاو .

زۆر جار ئەجولاین و شوێن گۆڕکێمان ئەکرد، هەم بۆ ئەوەی لە ناوچەیەک بۆ ماوەیەک نەمێنینەوە، هەم بۆ بێ تاقەتی کە ئەجولاین ئێمە زۆر بەوریاییەوە.. بەلام سەیر لەوەدا بوو لە گوندێکدا لە باخێکدا خەلکمان بینی لە گەل خێزان و مال و مندال زۆر جێی سەرسوڕمانمان بوو ، چۆن ئەمانە لێرەدا ماون ؟ تاوەکو ئێستا دیارە بە جۆری لە جۆرەکان خۆیان پاراستووە ، ئێمە لەوناوەدا دوو رۆژ ماینەوە . خەلکی دێکە ئەوەی کە مابووەوە لە نێو باخەکەدا کەپریان بۆ خۆیان دروست کردبوو تیایدا ئەژیان،خۆیان لە کۆپتەر ئەپاراست ، زۆربەشیان مندال و ژن بوون.

ئێمەش دوور لەوان دەستمان کرد بە شوێن خۆشکردن بۆ خۆمان کەل و پەلمان پەیدا کرد.لەگەل خەلکەکەش تێکەلاو بووین و هەندێ دلمان کرایەوە، بەبینینی ئەو مندالانە راستە هەندێ دل تەنگ ئەبووین بۆ کەس و کارمان کە هیچیان لەبارەوە نازانین ، چیان بەسەر هاتووە ئەو رۆژانە بۆ ئێمە زۆر پڕ لە گۆڕانکاری بوو لە هەموو ڕوویەکەوە هیوایەکمان پەیدا کرد بە ژیان کە بتوانین پرۆژەی نوێمان هەبێ .

لە باخەکانداو لە گێلگەکاندا میوەو زەردەلووی لێ بوو زۆر گرنگ بوو بۆ ئێمەو خەلکەکە،عەسرانێ کۆپتەر پەیدا بوو ، زۆر گەڕا لای ئێمە هیچی بۆ دەرنەکەوت لە بانە گول .. بەلام لە گوندی داول سەیارەیەکی تویتا قەلاچییەکی بینی ئێمە ئەمان زانی ئەو سەیارەیە لەوێدا چییەو کێ هاوردبووی و کەی هاتبوو ؟

ئەوەندەی پێ نەچوو جاش و جەیش هێرشیان هێنا بۆ بانگول و داول ئێمە خواردنمان لە ئامادەکردندا بوو ، بەجێمان هێلاو بەرەو هەردەکەی بانگول بەلام لە مەغریبدا کۆپتەرەکە هەرچی هاولاتیانی گوندەکە بوو سوار کرد و بردنی ، ئێمە ئەمجارەیان چووین بۆ ناوچەی تالەبان ماوەیەکی زۆر لەوێ بووین لەبەرئەوەی جاری دنیا گەرم بوو ئەوەندە گوێمان نەدا لە هەر شوێنێ ئاو و دارو بنکاچ و قەلوەز هەبووایە ئەماینەوەو ژیانمان تیایدا بەسەر ئەبرد .

ئێمە هەوڵمان ئەدا چاودێری و هەواڵی ناوچەکە بزانین ، برادەران لە یەکێ لە مەفرەزەکانەوە هەواڵیان نارد کە بچین بۆ( گوندی ڕەشە) کۆبوونەوە هەیە، نەئەکرا بە رۆژ بجولێین ، بۆیە شەوێ چووین برادەران لەوێ بوون کێشەکانیان باس کرد ئێمە بەدڵمان نەبوو بۆیە بەشداریمان نەکرد ، لەو کاتەدا بەڕاستمان زانی تاوەکو رادەیەك ناخۆشی دروست بوو ، گەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان بەڵام لەوێش ئەترساین لە برادەران لەبەر بەشداری نەکردنمان لەو پرۆژەیەدا . بۆیە شوێنەکەمان گۆڕی ، شایەنی باسە ئێمە وڵاخمان لابوو بۆ گواستنەوەی کەلو پەلەکانمان رۆژانە سودمان لیٚ وەرئەگرت ، لەئاکامی هیلاکی و ماندووبوندا لە کاتی رێکردن و جەولە کردندا ، لەو ئەشکەتانەدا بەشی ساڵێك خۆراکمان قایم کردبوو ، بەرنامەو پرۆژەی زستانیشمان دانابوو .

بەڕاستی چاوەڕوانی گۆڕانکاری و پەیوەندی بووین. یەکێك لە برادەران گەڕایەوە ناوشار بۆ چەمچەماڵ لەگەڵ خاڵۆیدا هاتن بۆ لامان بۆمان دەرکەوت خۆی تەسلیم کردووە ، کۆمەڵێك خواردنی بۆ هێنابووین ، پاش گفتو گۆ گەڕایەوە... فەخرەدینی برای (مامە ریشە) پێی وتین کاکە من باوەڕم بەم پیاوە نییە ، ئەبێ لێرە برۆین لەڕووی لۆژیکەوە قسەکەی راست بوو، کەسێ لای ئێمە بگەڕێتەوە ئەبێ ئاگاداربین ، بۆیە ئەو شوێنەمان چۆڵ کرد لە شوێنێکی دوورتر دامەزراین ، هەر وابوو پاش چەند رۆژێکی کەم جاش و جەیش و کۆپتر دابەزینە شوێنەکەمان بەڵام خۆشبەختانە کەسی لیٚ نەبوو !.

رژێم کەوتە جوولە پاش ئەو رووداوە، ئێمەش هەمیشە ئاگادار بووین رۆژێ حەرەسیاتی ئامۆزا تاڵەبانی بوو هەمووومان لەحەشارگەکەدا ئاراممان گرتبوو بە هەڵەداوان بانگی لێکردین ، کورینە ئەمجارەیان تەواومان کرد ! لە هەرچوار لاوە جاش و جەیش هێرشیان هێنا لەم قوڵانەوە: گوندی گۆران ، جافان ، تاڵەبان دارە توو هێرشەکە زۆر بەربلاوە بۆیە ئێمە خۆمان قایم کرد هەوڵمان دا هیچ شوێن

هەواریّ نەهێڵینەوە، بوو ئەی گوت ئەمە شوێن پێی پێشمەرگەیە بگەڕێن ئەیان دۆزینەوە ئەوی تریان ئەی وت پێشمەرگە لە کویّ ماوە دەوەرە بابڕۆین شکمان لەوەکردبوو کە ئێمەیان دیوەو خۆیان گێل ئەکەن تاوەکو درەنگیّ تەمشیتەکە بەردەوام بوو پاشان گەڕانەوە.

یەك لە کێشە گەورەکانمان نەبوونی پزیشك بوو کە کەسێك لە ئێمە نەخۆش ئەکەوت زۆر دائەماین. کاکە حەمە باوایی نەخۆش کەوت ، زۆر بیّ تاقەت بوو هیچ دەرمانمان نەبوو ، بیرم لە دەوای عەشایەری کردەوە، مەنجەڵی ترشاوم بۆ لێنا بەزۆر دەرخاردیم دا ... پاش ماوەیەك چاك بووەوە.

ئێمە ماوەیەکی زۆر ماینەوە هیچ گۆڕانکاری نەبوو ، زۆر بیرم لە خۆم و ئەو برادەرانە ئەکردەوە ئەم دابڕانەش زۆر ناڕەحەتی کرد بووین ؛ هیچ هەواڵی نەبوو کەسێك نەبوو شتێکمان پیّ بڵیّ باوەڕیش بەکەس نەئەکرا ، ئەو برادەرانەش لە دەورو بەرمان بوون ، هەروەکو من رەنگە هەندیّ بۆچوونیان بوایە بەلاّم زۆر بەرتەسك بوو ، بۆیە رۆژیّ هاتە سەرمدا و بڕیاری ئەوەم دا بچمەوە ناوشار، چەك و تاقمەکەم لە ئەشکەوتیّ بەجێهێلاّ ،سواری گویّ درێژێك بووم زۆریش ئەترسام ماوەیەك بەرێوەبووم تووشی پیاوێك بووم پاش سلاّو و لیّ پرسین .

– ئەریّ لەکوێوە دێت؟

– وتم بۆچی لالە گیان ؟ بۆ قوربەسەری کوڕەکەم لە خزمەتی سەربازی هەلاّهاتووە.لەم ناوچەیە خۆی شاردوەتەوە خۆم لیّ بیّ خەبەر کرد حەزم ئەکرد زۆر لەسەری بڕۆین .

ماوەیەکی تر رۆشتم تووشم بوو بە تووشی کۆمەڵیّ ئافرەتەوەبانگیان لیّ کردم کاکەی شوان لەو دەشتەدا(تەپاڵە) هەیە ، منیش لە دڵی خۆمدا وتم تۆ سەیری ئەم بەزمە بکە. منیش وتم بەڵیّ بەڵیّ ئەو دەشتە هەمووی تەپاڵەیە ... باشە بە شوانیشم بزانن !!

چوومە سەر جادەکە و کەرم بەرەڵلاّ کرد ، سواری سەیارە بووم ئینزباتیێ لە پاڵمدا سواربوو ئەوەندە ئەترسام تۆبڵێی داوای (ناسنامە)م لێ نەکات لە(مدینەشۆڕش) دابەزیم ماڵی خزمێکم لەوێ بوو بەلاّم ماڵیانم نەئەزانی ، بۆیە بەپرسیارکردن دۆزیمەوە ، زۆریان لاسەیر بوو پێم وتن ماوەیەکە تەسلیم بوومەتەوە، ئەوان زۆر ترسان پاش دوو ڕۆژ گەڕامەوە لای برادەران ، پاش ئەوە زانیم دیسان هیچمان بۆ ناکرێ کەسمان نییە هاوکارمان بێ هەر بەڕاستی چەند کەسێ هەژار بووین لە هەموو ڕوویەکەوە.

مامەتالە(تاهیر سابیر محەمەد) ژنەکەی پەیوەندی هەبوو لەگەڵی هەموو جارێ سەردانی ئەکرد خۆیان مەوعدیان ڕێکخستبوو ، قەڵوەزێکیان دیاری کردبوو بۆ ئەو مەبەستە مامە تالە بەسواری کەر ئەچوو بۆ ژوانەکەی شەوێ لەوێ ئەمایەوە لەوێدا کانی ئاو و شوێنێکی خۆش بوو برادەران پێیان ئەوت، مامە تالە چیت نەکراوە، پارتی زانی ئەکەیت ومانگ هەنگوینتیش هەیە، لەوهاوینە هەوارەدا مامە تالە هەموو جارێ دوبتڵ عازی بەتاڵی لەگەڵ خۆی ئەبرد هەندێ جار بۆ ئێمەش سوودی بوو ، برادەران ئەیان وت کار وا بڕوا غاز لەم دەڤەرەدا نامێنێ ، هاتوو چۆی مامە تالە شەوانە بوو ، خێزانەکەی بەناوی دارهێنانەوە ئەهات زۆر جار بوو هەواڵی دەهێنا ئەو برادەرانەی لەو مەفرەزەیەدا بووین ئەمانەی لای خوارەوە بوون :

١- شەهید سەمەد. ناسراوەبە سەمەد گلی .

٢- شەهید محەمەد سەعید محەمەد ناسراو بە حەمە باوایی .

٣- ئەمین عەبدولعزیز . ناسراوە بە حاجی ئەمین.

٤- ئەحمەد شەریف حسین . ناسراو بە ئامۆزا تاڵەبانی

٥- محەمەد شەریف حەسەن .

٦- فەخرەدین شکور ڕوۆف . برای مامە ریشە.

٧- سەباح فاتیح ناسراوەبە سەباح ئۆمەرە گەرەی

٨- تاهیر سابیر محەمەد. ناسراو بە مامەتالە ،

پاش هەموو خۆڕاگرییەك سەرئەنجام نەمانتوانی بەردەوام بین و بەهۆی نەبوونی پەیوەندییەکان و چاودێری کردنی رژێم بۆ دوا جار لە یەکێ لە عەفوەکاندا گەراینەوەخۆمان دایە دەسی رژێم کە ئەویش سەختریـن و نارەحەتریـن ساتە وەخت بوو بۆ ئێمە .

(٣) لەزاری پارتیزان ( حاجی ئەمین) ەوە وەرگیراوە .

# هەردەی کوردە میرەکان

## (( لە پڕێکدا (٦) کۆپتەر هاتە سەرمان ))

بەسەر بەرە کۆنەکەدا بە ئامادە باشییوە خۆم بەستبوو ، هەستم بە توندی ( ئەدیداسەکەم ) ئەکرد لە پێمدا ، حەزم ئەکرد هەندێ ئاو بە پێمدا بکەم و پشتیونەکەم شل بکەمەوە ، بۆی ڕاکشام ، بەلام چاوم بە برادەران کەوت کە هەریەکە بە کارێکەوە سەرقاڵە و چاودێرەکەش بە دووربین تەماشا ئەکا ،تەنها مێزەرەکەم لادا وخستمە ژێر سەرم و لەسەر پشت خۆم دا بەزەویدا بەو نیازەی هەندێ بحەسێمەوە .

گوێ بیستی ئەو دوو برادەر بووم بە دەم دروست کردنی کولێچەوە ( کولیچە بژی ) وە قسەیان ئەکرد ، ئەبێ بۆ ئێستا بەو لاوە زۆر وریابین تەنها بوونمان بپارێزین ئەم قسەیە دەرگای کردەوەو چوومە نێو بیرکردنەوەی قوڵەوە... چەندرۆژێکە ماڵ و منداڵەکانمان ڕەوانەی شارکردوە ، هەربەڕاستی بەڕاستی لە ژیانێکی دژواردا بوون ، ئێمەشیان وا لێ کردبوو هەر لە خەیاڵی ئەواندا بین .

ئێستا ئێمە لەم کوردەیە زۆر ئازادین و ئەتوانین خۆمان بپارێزین ، و لە بوونی خۆمان دڵنیا بین ، ماوەیەك ئەو هێزە زۆرەمان پەرتوو بڵاو بووە ئەوەی خۆی گەیاندە سنوور چووە بەو دیودا ، هەندێ بەناچاری گەڕانەوە بۆ شارو چەند کەسێکی کەم لەنێو ئەم هەردەو شاخ و پێ دەشتەدا خۆیان حەشارداوە ، ناوچەکەیش جگە لە وێرانی و سووتان زۆریش چۆڵ و هۆڵە . ئێمە بڕیارمان داوە گەرمیان بەجێ نەهێڵین شارەزایی چاکمان هەیە لە ئەشکەوت و بن کاچ و حەشارگەی چاك شارەزاین .

ئێمـە ئـەتوانین بـەردەوام بـین لـە ڕێگـەی بـیّ تەلـە بچوکەکەشـەوە ئاگـاداری برادەرانی ناو چەکەو سەرەوەش بین، پلانی ئەوەشمان هەیە خواردەمەنی و کـەل و پـەلی بـەجیّ مـاوی لادێکـان لـە شـوێنە جیاجیاکـان قـایم بکـەین و بیانشـارینەوە ،هەولێش دەدەین لە گەلّ برادەرانی شاردا پەیوەندیمان هەبێ ، نازانم چـەندی خـەو چوو بووە چاوانم لەبەر ئەوەی ئێوارەیە ترسمان کەم بوو دەنگە دەنگ بـە ئاگـای هێنامەوە ، چـاودێرەکە قسـەی ئـەکرد مامـە سـالە ورە لەگـەلّ کـاك مـەحمود بـی کەیسی و دوو پێشمەرگەدا پەیدا بوون لـە پـالّ سـاجەکەدا دەسـتیان کـردە کولێچـە خواردن و قسە کردن . هەمووشی دەربارەی چوننێتی مانەوەمان بوو جگە لـە دەنـگ و باسی زۆر کەم دەربارەی خەڵکە ئـەنفال کراوەکـە ، کاتـژمێر (٥) ی ئێـوارە کـە کاتی پەیوەندی کردن بوو، کاکە حمە ڕەش پیّ وتین ئەم شەو لە دێی ( جام ریـن) چاوەڕوانتان ئەبین ئەو لە ئاش داخـەوە لەسـەر ئاوەسـپی یـەوە پـاش ئـەوەی دنیـا تاریکی کرد خۆمان ئامادە کرد، بەرێکەوتین هەمووشمان شارەزا بووین .

کاکێش لە ئاسمادا خۆی بۆ درەنگانی شەو خۆی ئەکوتا لە نزیك گوندی (جەم رین) لە گەلّ کاك حمە ڕەش و برادەراندا یەکمان گرت ؛ دیار بوو ئـەوان لـە نێـو ئـەو بـن کـاچ و دۆڵانـەدا هەنـدیّ شـوێنیان بـۆ خۆیـان خـۆش کردبـوو ، بـۆ ئـەوەی دوژمـن نەیاندۆزێتەوە،ئێمـە زۆر مانـدوو بـووین چـایەکی خۆشمـان خـواردەوە ، ماوەیـەك حەساینەوە ، کـاك حمـە ڕەش پـیّ وتـین : هەوڵدەدەین لێـرە بمێنینـەوە ، بـەیانی مریشکمان هەیە و هەمووتان میوانی منن ، مـام سـالّح ئـەم پێشـنیارەی کـاك حمـە ڕەشی پیّ قبولّ نەبوو ، کۆبوونەوەی ئەم کۆمەڵ خەڵکە زۆرە بەم شێوەیە بەباشی نەئەزانی .

مام سالّح هەندیّ لەگەلّ برادەران چـوون بـۆ هـەردەی کـوردە میرەکـان ، ئێمـەش بۆی ڕاکشاین بەڵام زۆر بەوریاییەوە ، بەیانی نـۆرەی حەرەسـیاتی مـن بـوو ، بـەڕەو بەیانێکی زۆر جوان بوو، ئەم ڕوانیینە ئەم هردو دۆڵانە دنیایەکی کپ وخامۆش بوو ،

یەکێ لە پێشمەرگەکانم هەڵسان ئاو بێنێ بۆ چا .. لە پڕێکدا (٦) کۆپتەر هاتنە سەرمان ئەوەندەمان زانی هەزاران جاش و سەرباز و دەبابە بە ناو چەکەدا بڵاو بوونەوە، ئیتر زانیمان کە ئیخباری کراوین .

کاك حمە ڕەش بە هاوڕێ کامەرانی وت : وڵاخەکان بەرەڵا بکەن و خۆشتان ئامادەبن، ئەو هێزە ئەزانن ئێمە خێزانمان لەگەڵە ئەگەر چی وڵاخەکان بۆ ئێمە سوود مەند بوون بەڵام ناچار بووین بەرەڵایان بکەین ؛ ئەو ڕۆژە نەك هەر مریشکمان نەخوارد بەڵکو هەموو شتێکمان بە جێهێڵا ،خۆشمان تاوەکو عەسر دەستمان لەسەر بەلە پیتکەی تفەنگەکانمان بوو سنگەرمان گرتبوو ،کاك حەمە ڕەش هەستی کرد شوێنەکەمان چاك نییە، بۆیە کشاینەوە بۆ ئاش داخ لەبەر ئەوەی شارەزا بوو بەسەلامەتی گەیشتین ، ئێوارە هێزەکە کشانەوە پاش وێرانکردنی دێکانی ناوچەکە لەوانە : گوندی فەقی مستەفا ، کویك .. زۆر دڵمان لای ئەو مەفرەزانەی ئەو ناوە بوو . بەتایبەت مەفرەزی کاك تەهاو برادەران بەڵام لە کاتی پەیوەندی کردنمان لەگەڵیان بۆمان دەرکەوت کە سەلامەتن و کەس تووشی نارەحەتی نەبووە.

حەزی ئێمە بۆ خواردنی مریشکەکان هەرمابوو ، بۆیە پاش پاشە کشەی هێزەکانی ڕژێم ئێمەش گەڕاینەوە شوێنەکەی خۆمان ، دیاربوو سەربازەکان زۆرێك لە حەشارگەکانی ئێمەیان ئاشکرا کردبوو، هەرچی خواردن و کەل و پەلمان بوو لە گەڵ خۆڵ دا ئاوێتە کردبوو ، بەڵام شوێنەکەی ئێمەیان نەدۆزیبووەوە ؛ پاشان دەستمان بە دروستکردنی چێشتی مریشك کرد .

لەوەها ژیانێکدا ئەگەر چی هیلاك و ماندو بووین، بەڵام هەستمان بە لێپرسراوێتی دەکرد ؛ ئەو هەستکردنەش بە لێپرسراوێتی وای کرد بوو بەسەر کێشەکاندا زاڵ بین ، بەتایبەت ئێمە هەموو جارێ ڕووبەڕووی مەرگ دەبووینەوە،تەنها ژیانمان بۆیەك

مەبەست تەرخان کردبوو ، رۆڵی سەرکردەش زۆر گرنگە ئێمە هەستمان بەخۆشەویستی دەکرد لە نێوانی خۆماندا ، هەمیشە فریای یەکتر ئەکەوین .

بەیانی کەرۆژ بووەوە چووین بۆ گوندی فەقێ مستەفا ،کە دوژمن لە گەڵ زەویدا تەختی کردبوو ،هەربەڕاستی دڕەندەیی خۆی نیشان دابوو بەو کردارەش جارێکی تر دڕەندیی بەعسمان کەوتە بەرچاو ، بەڵام ئێمە ماوین هەر زووش لەگەڵ ئەم بارو دۆخەدا رادێن هەوڵ کانیش بەردەوام دەبن بەو ئاراستەیەدا ، پاش ئەوەی گەڕاینەوە بۆ شوێنەکەی خۆمان ، کاك حەمە ڕەش کۆبونەوەی لەگەڵ کردین زۆر قسەمان کرد لەسەر ئەم بارودۆخە سەختە .

کاك حەمە رەش پێ وتین :سەرکردایەتی بوونی ئێمەی زۆر لا گرنگە لە ناوچەکەدا مانەوەی ئێمەو بەربەرکانی ئێمە نموونەیە بۆ مانەوەی شۆرش، بۆیە ئەبێ کارێکی وابکەین لەم قۆناغەدا شەڕی مانەوە بکەین بەتەنها و لە داهاتوودا ڕەنگە جۆری هەنگاوەکانمان بگۆڕین ،بۆیە لەو کۆبونەوەیەدا بڕیار درا ئێمە بگەڕێنەوە بۆ سنوور پاریزۆلە لەوێدا حەشارگەو جێگە بۆ خۆمان دابین بکەین ، کاك عەدنانی حەمەی مینا و برادەران بۆ داری خلە ؛ کاك عوسمانی حاجی مەحمود و برادەرانیش لە دەوروبەری ناوچەی کفری ..کاك حەمە ڕەش شوێنی هەبوو بەناوی ٠( هەزار ئاوا) بۆ بێ تەلە سەرەکیەکە کە ڕاکاڵ بوو ئێمەش هەریەکە بێ تەلی بچووکمان هەبوو بۆ پەیوەندی نێوان ئێمەو کاك حەمە ڕەش .

مەفرەزەی ئێمە لە گەڕانەوەمان لە رۆسەی شامار و زەوت حەشارگەمان بۆخۆمان ؛ دروستکرد ؛ کاك عەدنان و برادەرانیش لە داری خلە شوێنیان بۆ خۆیان دروستکرد لەو شوێنەی کە پێیان ئەوت کونە تەمشیتەکە کە بۆکاتی کیۆماڵ کرد زۆر بەسوود بوو. ئەو برادەرانەی لەگەڵ کاك عەدنان بوون بریتی بوون لەمانە:(بورهان.حاجی عوسمان .مەلا کەریم . شوانە . عاسی . هەیاس کەجیهازەکەی پێبوو) ئێمەش جگە لە حەشارگەی رۆسەی شامار چووینە ناوچەی پاریزۆلە لەوێدا هەستمان ئەکرد

ئارامین هەوڵمان ئەدا پەیوەندی دروست بکەین ، کاك کامەران لەو پەیوەندییەدا سەرکەوتوو بوو . لەرێگای کاك خەلیفەو هاورێ نەریمانەوە کۆمەڵی پێشمەرگە کە چووبوونە نێو شار دابڕابوون داوایان کرد کاك حەمە رەش ببینن .بۆ ئەو مەبەستەش رێو شوێن دانرا بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ کاك حەمە رەش و برادەران ئەم کۆمەڵە پێشمەرگەیە بەشدابوون ( حەمە رەش . عوسمان . عدنان . مەلا ئەحمەد . سەید .بورهان . کامەران . توفیق . رەمەزان . مەلا رەحیم . محمود مامە عەزە . بەندە ) ، رۆژێکی خۆش بوو ئێمە دیسانەوە یەکمان گرتەوە پلان و پرۆژە دائەنرێ بۆ بەربەرەکانی و خۆ بەدەستەوە نەدان بە هەموومانیشەو ە بەڵێنمان نوێ کردەوە،لە کۆبونەوەکەداچەندین نامە نووسرا بۆ رێکخراوی ناوشار لە رێگای خەلیفە و کاك نەریمانەوە ، بەتایبەت ئەو پێشمەرگە دابڕاوانەی کە گەڕابوونەوە بۆ ناوشار و داوای پەیوەندیان کردبوو .

ئەو پێشمەرگانەی کە لە پاریزڵە بووین بریتی بووین ( هاورێ کامەران . توفیق . رەمەزان . موکەڕەم . ئەحمەد زەرداوی . بەندە) رۆژانە ئێمە لە مۆڵگەکانی خۆمان ئەماینەوە زۆر وریا بووین ، ئێواران سەعات (٥) پەیەندیمان دەکرد لەگەڵ کاك حەمە ڕەش .... لە پەیوەندیەکدا کاك حەمە رەش ئاگاداری کردین کەوا من و کاك کامەران خۆمان ئامادەبکەین و بەرێ بکەوین بۆ ئاش داخ ، پاش ئێمەش برادەران بڕیاریان دا بجوڵێن بۆ سنووری قولیجان ئەو شوێنەیان بەباش ئەزانی .

ئێمە کەوتینە ڕێ بۆ جێی دیاریکراو ، لە گوندی (ئاخە) بەیەك گەیشتین ، ئەوان ئەمانە بوون ( شێخ تەها . مام جەلال مەسۆیی . حەمە ئاخە. حەمە رەش ) پاش کەمێك وچان دان کەوتینە ڕێ بۆ پشتی ( کرپچنە ) لەرێگا حەمە رەش باسی ئەوەی کرد کە مەوعدێکی هەیە لەگەڵ چەندبرادەرێکدا . پێشمەرگەکانی وەك چاودێر داناو من و کامەرانی لەگەڵ خۆی برد بۆ شوێنی مەوعید . سەرەتا کەس

دیارنەبوو ، پاش کەمێك لە چاوەڕوانی پەیدابوون دوو برادەر بوون خەڵکی سەنگاو بە ناوەکانی ( ساڵح . سدیق ) ئەم دیدارەش کاری پەیوەندی بوو ...

بوونی ئێمە لە ناوچەکەدا زۆر کاریگەر بوو . لە هەواڵێکدا کاك حمە رەش پێ وتین : کاك ئازادی سەگرمە لە گەڵ مام رۆستم هاتوونەتە گەرمیان و چوونەتە لای عوسمانی حاجی مەحمود لە گوندی کانی عوبید منیش لەگەڵ کاك جەلال مەسۆیی و کاك هونەردا ئەچین بۆ لا یان . ... من و کاك کامەرانیش پاش ئەو دیدارەی لە گەڵ برادەرانی سەنگاو ئیتر گەڕاینەوە بۆ قولیجان لەوێشەوە بۆ پاریوڵە .

لەو ڕۆژانەشدا ئێمە لە پاریۆڵە چاوەڕوانی هاتنی کاك ئازادی سەگرمە بووین بەهاتنیان زۆر دڵشاد بووین، و کۆبوونەوەیان لەگەڵ کردین و زۆربەی برادەرانی گەرمیان ئامادەبوون " حەمە رەش . عوسمان . عدنان . مەلا ئەحمەد . سەید محەمەد . سەید جەوهەر . نازم کەرکوکی . ئەحمەد حاجی رەشید . مەلا سەعید . عەلی فەقێ مستەفا . حمە ئاخە . مەحمود مامە عەزە و دەیان پارتیزانی تر..

شەوێ کاك ئازاد لە گەڵ کاك عەدنان لە زاوت کۆبووەوە . وایان بڕیار دا کاك ئازاد بەرپرسی یەکەمی هەموو رەتڵەکانی گەرمیان بێ

ڕێکەوتی ١٠/١١/ ١٩٨٨ برادەران لە گەڵ کاك ئازاد بەرێ کەوتن بۆ سنووری شوان کە خوا حافیزیان کرد کاك عوسمان پێ ڕاگەیاندن کە زۆر وریا بن کۆپتەر لەم ڕۆژانەدا زۆر ئەسوڕێتەوە، جگە لە برادەرانی کاك ئازاد ...کاك حەمە رەش ومام ڕۆستم –یش بوون. هەر ئەو ڕۆژە (٦) کۆپتەریان لێ پەیدا ئەبێ دیارە ئەوانیش خۆیان لانەداوە بۆیە بەتوندی بەرکەوتن (٣) پێشمەرگەیان شەهید بوون بەناوی ( شێرکۆ . سەلاح . شێرزاد ) ،کاك ئازادیش بریندار دەبێت ،قاچی دەشکێت ، چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار دەبن . کاك عوسمان بەهێزەکەیەوە فریان کەوت و بریندارەکانی دوور خستبووەو بەپووش دای پۆشیون لە دۆڵەکاندا ، بەلاّم بەداخەوە شەهیدەکان کەوتنە دەستی ڕژێم بەلاّم بریندارەکانیان نەدۆزییەوە ، دوای ئەوەی

هەواڵەکـەمان پـێ گەیشـت خۆمـان ئامـادەکرد بـۆ فریاکـەوتن ، بریـنـدارەکان گواسترانەوە بۆ سنووری ( تورکەو مراوە ) لە مراوە شوێنێکی سەختمان هەیە کونە سوچەڕەکەی پێ ئەڵێن ، شوێنێکی سەخت بوو بۆ خۆ شاردنەوە. کاک ئـازاد لەوێـدا دانرا ، بریندارەکانی تـریش لـە تورکـە قـایم کـران ، دکتۆرمـان نـەبوو ، کـاک عـدنان هەندێ لە دەواو دەرزی سەری دەرئەچوو .. تاڕادەیەك لەو ڕووەوە کـاری پێویستی کرد ، بەڵام لەبەر سەختی برینەکان ئەوەندە سوودی نەبوو .

کاك عوسمان هەوڵێ دا دکتورێك پەیدا بکـەین بـۆ ئـەو مەبەسـتەش لەگـەڵ مـن و برادەران بڕیاری دا بچین بۆ لای خەلیفە لە گونـدی (ئـاوە خـوێری ) تـا ڕێکخـراوی ناوشار ئاگادار بکاتەوە ، بۆ ئەو مەبەستەش خەلیفـە کـاری باشـی کـرد ، ڕێکخـراوی ناوشـار کەسـێکیان بـۆ نـاردین بـەناوی (صـدیق ) لەگـەڵ پێداویسـتی دەواو دەرزی ماوەیەکی زۆر لامان مایەوە ، بەڵام کاك ئازاد هـەر چـاك نـەبووەوە ، بۆیـە بڕیـار درا کـاك ئـازاد ڕەوانـەی ناوشـار بکرێـت لـە ڕێگـای ڕێکخـراوی سـلێمانییەوە ، بـۆ ئـەو مەبەستەش کـاك نـوری ئەحمـەد بەسـی پەیوەنـدی کـرد بـە حەمـە ڕەشـیدەوە لـە شارەزوور کەوا پەیوەندی بکەن بە دکتۆر خەسـرەوە لـە بەغـدا بـۆ چارەسـەرکردنی کاك ئازاد .

ئەم ڕووداوەی کاك ئازاد و بریندار بوونی برادەران بەڕاستی مایەی نیگـەرانی بـوو بۆ ئێمە ڕژێم بە تەواوی گومانی لە ناوچـەکە پەیـدا کـرد ، و زانـی بریـنـداری لێیـە . بۆیـە کێومـاڵکردنی دەسـت پێکـرد بـۆ ماوەیـەك پشـکنین بـەردەوام بـوو شـەوان مۆڵگەیان هەبوو ، زۆر نزیك بوونەوە لەو شوێنەی کە کاك ئازادی لێ دانرا بوو ، بـەڵام خـۆش بەختانـە پاشەکشـەیان کـردو نـەیان دۆزییـەوە . بۆیـە پەلـەمان کـرد لـە گواستنەوی کاك ئازاد بۆ پاریۆڵە ، بۆ شەوی دووەم بە دارە مـەیت گوسـتمانەوە بـۆ داواجنەکە ، کاك ئازادمان گەیاندە لای بـرادەران کـە چـاوەڕوان بـوون . پـاش (١١) شەو گەڕاینەوە بۆ شوێنەکەی خۆمان لە پاریۆڵـە، کـاتێ کـاك ئازادمـان بـەجێ هـێڵا

زۆر نارەحەت بوو هەروەها ئێمەش ، لەبەر ئەوەی بەڕاستی فەرماندەیەکی خۆشەویست بوو لە نێو پێشمەرگەدا ؛ ئێمەش بەڵێنی ڕۆحمان پێدا.

ئەو برادەرە پێشمەرگانە ئەمانە بوون (( حەمە رەش . عوسمان . عدنان . مام رۆستم . مەحمود مامە عەزە . توفیق . رەمەزان . صدیق . حاجی عوسمان . سامان . شێخ مەحمود . بورهان . هەیاس . سامی . هونەر . مام بەگ مراد . سەلام شووشە . مام سالح ورە . جەلال مەسۆیی . )) جگە لە چەند پاتیزانێکی تر .

ئەو شەوە سەعات (١) گەڕاینەوە زۆر ماندوو بووین ، ڕێکخراو کۆمەڵێ خواردنیان بۆ هێنابووین ؛ لەپارێزڵە لەو شوێنەی ئێمە بۆ ماوەیەك ماینەوە بۆ حەسانەوەو گفتو گۆ کردن ؛ بارو دۆخەکە زۆر ئاڵۆز و نالەبار بوو بۆیە پێویست بوو زۆر ئاگاداری خۆمان بین .پاشان برادەران بلاَوەیان لێ کرد و هەرکەسەو بۆ لای مەفرەزەی خۆی .

مەفرەزەی ئێمە لە (٧) کەس پێك هاتبوو ( خۆم .(حەمە پارێزڵە ) . رەمەزان . توفیق . مەحمود مامە عەزە . صدیق . مام بەگ مراد . ... کاك مەحمودی مامە عەزە لە کاتی چوونی بۆ دیداریێ لە سنووری عەلی ئاوا و دیوانە لە قەرەداغ خۆ فرۆشێك تاوانێکی گەورەی بەرانبەر کرد ، و بووە هۆی شەهید بوونی کاك قارەمان و شێرکۆ محەمەد .بۆیە لەگەڵ کاك صدیق ا گەڕانەوە لای ئێمە .

ئێمە بە هەوڵ و کۆشی برادەران توانیمان پەیوەند لەگەڵ چەند کەسێکدا پەیدا بکەین ،کە بەڕاستی لەو کاتەدا یاری کردن بوو بە ژیانی خۆیان بەلاَم ڕۆحی شۆڕشگێڕی و نیشتمان پەروەریان لەوە گەورە تر بوو . ئەو کەسانەش ئەمانەبوون ((کاك ئەحمەد دیوانە باوکی برایمە سوور ، کاك ئەحمەد ناوە نهێنیەکەی سۆفی حەسەن بوو . خالید شاهۆ . کاك عەلی (مامی رۆستم ) . هەموویان خەڵکی پارێزڵە بوون ، ئەمانە لە ڕێگای خەلیفەو کاك نەریمانەوە کارەکانیان بە دڵسۆزی ئەکرد و پەیوەندیان هەبوو ، هەروەها خەڵکی تریش بوون وەك ((کاك رەحمان .محەمەد . قادر . حاجی عەبدوڵلاَ . جگە لەچەند خزمێکی کاك مەحمود مامە عەزە . مەلا

مەحمود . کاك ئەحمەد . مام سالح . قادر. جەمال ...)) ئەمانە هەر بەڕاستی هەرچیمان پیان بسپاردایە ئەنجامیان ئەدا .

ئێمە چەند بنکەیەکمان بۆ خۆمان دروست کردبوو ، مەفرەزەکان لەو شوێنانەدا بلاوەیان لێ کردبوو کەسی بێ تاقەت بوایە ئە چوو بۆ لای مەفرزەکانی تر بۆ گۆڕینی شوێنەکان زۆر بەوریای کارمان ئەکرد زۆر جار ڕووەکی وشکمان بە شوێن خۆماندا ئەکێشا بۆ ئەوەی شوێن پێمان نەکەوێ . لەرێگای جیهازە گەورەکەوە کەلای کاك حەمە رەش بوو ئاگاداری دەنگ و باسی سەرکردایەتی بووین ، چوون جیهازی بچووك لای مەفرەزەکان بوو . کە لەرێگایەوە هەواڵی ناوشار و ناوچەکەمان ئەزانی .

لە ئەشکەوتی داری خلە گرد بووینەوە (٢٢) کەس بووین هەموومان میوانی کاك عەدنان بووین . ئەو بەیانییە کاك عدنان هەڵسا بۆ مراقەبەکردن ، گوێی لە دەنگە دەنگێ بوو بە عەرەبی قسەیان ئەکرد لەو شوێنەی کە ئێمە سەرو ملمان ئەشۆرد ، زۆر بەپەلە گەڕایەوە لامان و ئاگاداری کردینەوە ، " دوژمن زۆر نزیکە لێمان خۆتان ئامادە بکەن " ئێمە لە ئامادە بەشیدا بووین بۆ تەقەکردن ، لە ناکاودا ((کاك مەلا ئەحمەد و کاك سەید )) پەیدا بوون هاواریان لێکردین .. کلاوە .. کلاوە !! جاباش بوو زوو ئاگاداریان کردین ، ئەوەندەی نەمابوو تەقەیان لێ بکەین .

مەحمودی مامە عەزە زۆر حەزی ئەکرد بچین بۆ ( بەمۆ) چونکە خۆی زۆر شارەزا بوو ،بۆ ئەو مەبەستە من و صدیق و عەلی و توفیق و رەمەزان خۆمان ئامادەکرد بۆ ئەوەی لە دیدارێکی رێکخراو لە قەرەداغ ئامادەبین ، بەرێ کەوتین لە گوندی تاڵەوان تەرزە شووتیەك سەوز بوو بوو ، کاك توفیق بانگی کردین " وەرن شووتی چاك لێرەدایە " دوو دانەی چاکی گرتبوو لە گەڵ چەند دانەیەکی بچووکدا ، لەو پایزەدا و شووتی بەڕاستی خۆش بوو، دانەیەکمان لێ شکاندا وئەوی ترمان هەڵگرت بۆ رێگا .

چووینە قۆپی قەرەداغ بە شوێن هەوارەکەی مەحمودی مامە عەزەدا گوزەرمان کرد ، بەڵآم جاش و جەیش هەموویان سوتاندبوو، ئێوارە گەیشتینە دێی ( عەلی ئاوا ) لەوێدا لە قۆپی چاوەڕوانی برادەران بووین ،پاش کەمێك پەیدا بوون . مەلا مەحمود و ئەحمەدی حاجی خانم . خواردنی چاکیان بۆ هێنابووین پاش گفتو گۆیەکی دوور و درێژ هەواڵ گۆڕینەوە ، لەگەڵ مەلادا هەواڵی بۆ جەمالی حاجی عەلی و کۆمەڵێك لە خزمانی خۆی کە هاوکاری بکەن بۆ چوونمان بۆ سنووری بەمۆ ، پاش ماوەیەك وەڵآمان بۆ هاتەوە کات و شوێن دیاری کرا ، شەوەکەی ٢٧/ ١٢/ ١٩٨٨ بەڕێکەوتین کە ئەم برادەرانە بووین (( کاك عدنان . کاك مەحمود . کاك بورهان . کاك صدیق . مام بەگ مراد . مام صاڵح ورە . مام ڕۆستم . سەلام شووشە . حاجی عوسمان . سامی .هەیاس . مەلا کەریم . شێخ مەحمود . چالاك . سامان . کاك توفیق . مام جەلال مەسۆیی . ڕەمەزان . حمە ڕەحیمی جیهاز . حمە پاریۆڵە . مەحمودی مامەعەزە )) پاریۆڵە

لە ١٩٨٨/١٢/٢٩ گەیشتینە (دەردۆین ) کاك ئەحمەدی حاجی خانم و برادەران چاوەڕوان بوون ، کەڵەکێکی دەست کردیان بۆ دروست کردبووین بۆ پەڕینەوەمان ئێمە (٢٠) پێشمەرگە بووین ..." زۆر بەداخەوە کاکە حمەی پاریۆڵە لەسەر ئەم باسە زۆر نەدواوە ، کە ئەبوو زۆری لەسەر ئەم مەسەلەیە باس بکردایە چوون بەڕاستی پەڕینەوە لە سیروان جاری یەکەم بووە " نووسەر.

ئەو بەیانییە لە بەمۆ خۆمان حەشار دابوو لەبەر ئەوەی زۆر ئاگاداری بارودۆخی ناوچەکە نەبووین زۆر وریا بووین ، ئێمە لەوە ئاگادار بووین کە بە مۆ چۆڵە لە پێشمەرگە ، ئێمە لە دەروەند دهول و کاکەڕەش جێی گرتن بوو لە گەڵ برادەرانی پەیوەندییەکانی ئێران کە لەوێدا چاوەڕوان بوون .

ئێمە بەڕێ کەوتین بۆ شوێنی دیاریکراو یەك بەدوای یەکدا شوێنی پێی خۆمان ئەسڕییەوە، لەوێدا ڕەبیەیەکی کۆنمان بەدی کرد، دنیاش باران بوو ، زۆر

بەوریاییەوە یەکێکمان نار بۆ تاقیکردنەوە ، لەبەرئەوە ئەو شوێنە هەمووی چێنرابوو بە لوغم ئەبوایە زۆر ئاگادار بین ، کە گەڕایەوە بۆمان دەرکەوت چۆڵەو کەسی لێ نییە ، شوێنێکی باش بوو بۆ حەسانەوەمان، هەر لەوێدا کۆمەڵێ فیشەکی کلاشینکۆف هەبوو لەگەڵ گولەی ئاربیجی ئەوەندەی پێویست بوو هەڵمان گرت جولاین بۆ شوێنی دیاریکراو ، بەلام هەندێ ترسمان ڕەوایەوە کاتێك زانیمان رژێم ئەوەندی گوێی بەسنوور نەداوە ، لەسەر جادەی داری زەنگەنە رەبایەیەك هەبوو ، ئاوەدان بوو ، ئێمە لە رەبیەی ئێران تێگەین ، ئەوان هەستیان بە ئێمە کرد بەلام هەر چاودێریان کردین ، پاشان وازیان هێنا ، پاش ئەوەی لێیان دوور کەوتینەوە بۆمان دەرکەوت ئەوانە سەربازی عێراقی بوون لەبەر ئەوەی لەو ناوەدا بارەگاکانی ( حزبی دیموکراتی ئێران ) هەبوو وایان زانی ئێمە پێشمەرگەی ئەوانین ، ئێمە لە چوونی خۆمان بەردەوام بووین ، کە گەیشتین کەس دیار نەبوو بە بێ تەلەکە پەیوەندیمان کرد ، وەلام نەبوو ، ناچار پەیوەندیمان کرد بە برادەرانی گەرمیانەوە، ئەوان پەیوەندیان کردە ( علاقات) ەوە، لە وەلامدا بۆمان دەرکەوت ئێران رێگا نادات کەس بێت بۆ ناوچەکە .

لەساڵی ١٩٧٥ ەوە ئەو ناوچەیە چۆڵکرابوو پاش ئەوەی رژێم ئەو شوێنانەی بەقەدەغەکراوی و سنووری نێوان ئێران عێراق دانا ، مەسەفەیەکی چاکی چۆڵ کردبوو ئاوەدانی لێ نەبوو جگە لە سەرباز و ئاژەڵی کێوی ، ئێمەش خواردنمان نەمابوو ، بەرێوەبەرایەتی ئاوەدانەکردنەوە جادەیان دروست ئەکرد بۆ سەر بەمۆ ، شەوانە شتۆفەڵو کرێدەرەکانیان بە جێ نەهێلا . برادەران چوون بەڵکو هەندێ خواردنیان دەست کەوێ ،وەکو باسیان ئەکرد هەندێ برنج کرا بووە چێشت و لێیان زیاد بوو لەسەر عەرزەکە هەڵیانرژاندبوو ، چاکیان لێ خواردبوو خۆیان تێرکردبوو بە تێری گەڕانەوە ، بەلام بە خۆیان پێ ئەکەنین .

کاك ڕەحیم بۆ شکار چووە ئەشکەوتەکانی ئەو ناوە پاش سەعاتێ گەڕایەوە ئاسکێکی کوشتبوو ، زۆر بە هەڵە داوان چووینە پیرییەوە ، دەستمان کرد بە گوشت برژاندن ، خۆش لەوەدا بوو خوێمان لا نەبوو ، مام ڕۆستەم لە کۆڵە پشتەکەی شتێکی دەرهێنا ئەی کردە سەر گۆشتەکە دا بەلأم بەنهێنی هەوڵێ ئەدا ئێمە نەزانین ، پاشان بۆمان دەرکەوت نانە ڕەقە ، پاش ئەوە نانمان خوارد ئیسراحەتێکی چاکمان کرد .

بۆ ئاگادار بوون لە ناوچەکەو هەوڵدان بۆ پەیدا کردنی نان بەشێ لە برادەرانی پێشمەرگە لەگەڵ مەحمودی مامە عەزە بە ڕێ کەوتن بۆ پشتی خرکانێ ، ئێمە لە شوێنی خۆمان ماینەوە ، حەرەسەکە ئاگاداری کردین کە دوو چەکدار لەو شاخەدا ئەگەڕێن بۆیە بۆیان چووین هێنامانن بۆ ئەشکەوتەکە پاش هەواڵ پرسین بۆمان دەکەوت ئەمانە (پ .م) حزبی دیموکراتی ئێرانن هاتوون بۆ گەڕان و ڕاو کردن ، ئێمەش وتمان هەروەها ئێمەش بۆ ڕاو کردن هاتووین و خواردنمان پێ نەماوە ئەگەر بکرێ هاوکاریمان بکەن .

پێشنیارەکەی ئێمەیان بە دڵ فرەوانییەوە وەرگت و پێیان وتین ئەتوانن لەگەڵمان وەرن بۆ قسلأن کە بارەگامان لەوێ هەیە ؛ بۆ ئەوەی هەندێ خۆراکتان بۆ ڕەوانە بکەین . ڕێك کەوتین بۆ ئەوی (٤) پێشمەرگە بنێرین بۆ هێنانی خۆراك ، باش بوو دەفتەری بارەگاکەیان خواردنی باشیان بۆ رەوانە کردین کە گەڕانەوە بوو بەجەژنمان ؛ لەو ماوەیەدا زۆر جار لەبەر نەبوونی خۆراك پەنامان دەبردە بەر بەڕوو برژاندن .

کاك مەحمود مەفرەزەیەکی ناردبوو بۆ گەرمك و ئاو بارە لەوێدا چەند بنە ڕانێك هەبوون خزمی خۆی بوون .. بۆ ئەوەی نانمان بۆ ڕەوانە بکەن . مەوعد دانرا شەو چەند کەسێ بەرەو لامان هاتن هێستریکیان پێ بوو دیار بوو خزمانی کاك مەحمود بوو یەکێ لەوانە : کاك جەمالی حاجی عەلی بوو ئەویتریشیان گەنجێکی خوێن گەرم

بوو بەناوی کاك فریاد ، کاك جەمال پاش ئەوەی خۆراکەکەی پێمان سپارد بە پەلە گەڕایەوە پێی وتین کە دەرچووم لە دەربەندیخان خەڵك بینیمانی و لە هەمان کاتدا لە ناو خەڵکدا باس لەوە ئەکرێ کە کاك مەحمود و برادەرانی لە بەمۆن ، پاش ئەوەی ئەوان خوا حافیزییان لێ کردین ، ئێمەش چووینە ناو خانووی شەخسەکەوە (شێخ جرۆیل ) قوتویەکمان پەیدا کرد ، چایەکمان کرد و تێر نانمان خوارد .

کاك بورهان زۆر پیاوێکی قسە خۆش و بە هیمەت بوو هەروەها خوێندەواریش بوو ، کاتێك نانمان خوارد کوڵە کانمان دابەشکرد، کاك بورهان گەورەترین کوڵی هەڵگرت ، ئەو پیاوە زۆریش چاو نەترس بوو ، ئێمە هەمیشە گوێڕایەڵی بۆچوونەکانی ئەو بووین . پاش کاتژمێر (١١) ی شەو گەیشتینە لای برادەران حەرەسەکەیان ئاگادار کردبوو کە چووین برادەران نووستبوون ، بەیانییەکەی بۆمان دەرکەوت کاك مەحمود و ئەوان دوو ژەم خۆراکیان بۆ هاتوو ، بەشی ئێمەشیان دانابوو .

لەم رۆژانە کاك مەحمود کۆمەڵێ خزمی هاتن بۆلای لەوانە(کاك جەمال . کاك صالح . کاك فریاد . کاك ئەحمەد حاجی خانم ) خەڵکی دڵسۆزی تریشیان لەگەڵ بوو ، ئەو پەیوەندیانەش وای کردبوو بوونی پێشمەرگە لە بەمۆ بەردەوام بێت ... پاشانیش دوای راهاتن لە گەڵ بارودخەکەدا بڕیاری گەڕانەوە درا بۆ گەرمیان سەرەتاش بڕیاری ئەوەمان دا بگەڕێنەوە بۆ سەرکردایەتی پاشان بۆ گەرمیان، بۆیە بە بێ تەل ئاگاداری سەروەمان کرد و مەوعیدمان دانا بۆ گەڕانەوە لە رێگای عەلاقاتی خۆمانەوە ، برادەران هاتنە سنوور بۆ هاوکاری کردنمان ، لەوانە کاك سەلام کوێخا عەزیز کاك شێخ جەعفەر و چەند برادەرێکی تر .. هاوکارمان بوون تاوەکو گەیشتینە لای برادەران لە دیوی ئێران ....

[٤] لەزاری پارتیزان ( حەمە پاریۆڵە )ەوە وەرگیراوە

# ماسی بە بێ ئاویش دەژی

## ((کاک کوردۆ بۆ جگەرە حاڵی زۆر پەرێشان بوو))

ئـەم ناونیشـانە نـاوی رۆمانێـك ، یـان چـیرۆكێك نییـە بـەڵكو باسـی پێشـمەرگە پارتیزانەکانی گەرمیانە کە لەپاش پرۆسەی بەدناوی ئەنفال ، بـەبێ دێهـات و خـەڵك ژیانیان دەبردە سەر .

... لـە پـاش ئـەوەی حکومـەتی عێـراق هـەموو ناوچـەکانی کوردسـتانی داگیرکـرد. ئێمەش گەڕاینەوە بۆ سنووری مەریوان و بناری قەندیل و رەزگەو ماردوو ؛ پاشان لە زەڵێ کەسنووری نێوان عێراق ئێرانە بە سەیارە گوازراینەوە بۆ سـنووری مـەریوان ؛ بەتایبەتی دێکانی دزڵێ و مەرگەوان کە ئەویش تازە ئاوەدان دەبوونـەوە لـە خـەڵكی کوردەکانی ئێران کە بەهۆی شەڕی ئێرانەوە وێران کرابوو .

بارگاکانمان زۆربەی لە خـانووی گـڵ دا بـوو ، تـەنها بارەگـای تیپـی ٥٥ ی قـەرەداغ نـەبێت سـەبکرابوو. سـەرەتای گەیشـتنمان بـۆ نـاو ئێـران زۆرێـك لـە پێشـمەرگەکان تەسلیم بوونەوە ؛ چونکە رژێمی بەعس عەفوی دەرکردبوو بۆ هەموو کوردێك تـەنها بەڕێز مام جەلال نەبێت .

سەرەتایی چوونە ئێران زۆر سەخت بوو ، چونکە ڕانەهاتبووین لـە کوردسـتان دوور بکەوینەوە، هەروەها وامان دەزانی کە ئـێتر کـورد ناتوانێـت شـۆڕش بـەرپا بکـات و هەموو خەڵکەکەشی لە ناو دەچێت .

ژیانی رۆژانەی رۆژانەمان تا مانگێك تەنها خواردن و تەماشاکردنی ئەو برادەرانە بوو کە پۆل پۆل تەسـلیم دەبوونـەوە،پاش تـەواو بـوونی وادەی عەفوەکـەی رژێـم، ئـێتر پێشمەرگەبەتاك تاك تەسلیم دەبوونەوەو ئەوەشی مایەوە وردە وردە راهـات لەسـەر ئەو وەزعە و مۆڵەتی هاتووچۆی شارەکانی ئێرانیش کرایەوەلەبەردەم پێشمەرگەدا .

بەراستی رۆژگارێکی ناخۆش و دڵ تەنگ بوو ،چونکە پاشە رۆژی خۆمانمان نەدەزانی و هەروەها چارەنووسی کوردیش نادیاربوو ،لەبەر ئەوە هەر لەوکاتەدا بەدەیان پێشمەرگە روویان لە هەندەران کرد و چەندین سەرکردەش بروایان بە مەسەلەکە نەمابوو و چووبوونە هەندەران ، ئەو پێشمەرگانەشی مابوونەوە هیچ لێپرسراوێك کاری بەسەریانەوە نەمابوو کێ تەسلیم دەبێتەوە کێ دەمێنێتەوە ؟ هەر کەس بە لێپرسراوکانیشەوە( سنووری گەرمیان ) خۆی بڕیاری لەسەر تەسلیم بوونەوە و مانەوەی خۆی دەدا ؛ دوای پێنج مانگ ڕژێم عەفویەکی تری دا ،دیسان کۆمەڵێك پێشمەرگەی تر تەسلیم بوونەوە، هەندێ پێشمەرگە ( نەك لێپرسراو) ئامۆژگاری ئەوانەیان دەکرد کە تەسلیم دەبوونەوە کەسانی تر بەدەستەوە نەدەن

پێشمەرگەکانی مەلبەندی یەك تا سەرەتای ساڵی ١٩٨٩ ڕەنگە نزیکەی ٤٥٠ کەسێك مابوونەوە . ئەوانەشی کە مابوونەوە زۆربەیان خوێندەوارەکان بوون و خەرێکی خوێندنەوە بوون و ئەوەی فێری دەبوون پێشمەرگەکانی تریان پێ ڕۆشنبیر دەکرد . بەڵام بەداخەوە ئەم حاڵەتە لای هەندێ لەلێپرسراوەکان بە هەڵە لەیەك دەدرایەوەو ئەو خەڵکانەیان (خوێندەوارەکان ) بەخەڵکی لادەر لە ڕێبازی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە قەڵەم دەدا، و هەوڵدرا چەند پێشمەرگەیەك لەو خوێندەوارانە دوور بخەنەوە، لە ریزەکانی یەکێتی ، بەتایبەت کە پێشمەرگەی خوێندەوار و ڕۆشنبیر بە دەگمەن مابوونەوە.

لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩ بنکەکانمان لە دزلی بوو واتا لەسەر سنووری ئێران عێراق ، کاك کوردۆ قاسم پێی وتم من ئەم وەجبەیە دەچمە خوارەوە بۆ گەرمیان تۆ لە گەڵ هێزەکە بمێنەوە ، منیش بەمە ڕازی بووم ، پاش ڕۆژێك کاك عدنان حەمەی مینا پێی وتم بابچینە سەر شاخ ( سورێن ) بۆ ئەوەی بە بێ تەل لەگەڵ کاك کوردۆ و برادەران قسەبکەین تا دەگەنە گەرمیان منیش وتم بۆچی کاك

کوردۆ نەرۆیشتووە ؟ کاك عدنان وتی نەخێر . لە خوارەوەن لە کوردستانی عێراق منیش لە گەڵیدا رۆشتم کە گەیشتینە سەر شاخ بینیم برێك خواردن و چەند جووتە پێڵا وێکیان سەر خستووە بۆ ئەوەی بیگەیەنن بە کاك کوردۆ و برادەران منیش وتم : کاك عدنان لەگەڵ (پ .م ) تیپی ١٥ دا دەچمە خوارەوە بۆ سەردانی برادەران ،لە گەڵ ئەو دوو پێشمەرگەیە دابەزینە خوارەوە بۆ لایان .

برادەرانم بینی لە دۆڵێکی خوارشاخی سورێن کە پێك هاتبوون لەم هەڤاڵانە ( مەحمود سەنگاوی . مقدادی برای شەهید شێخ جەمال .حەمە ئێرانی . برایم چاو جوان . سوهاد خانەقینی . کەماڵە خڕە . مام رەئوف .خلیل سەر کانی . حەمە سیاسی . فازیل شیرە مەڕی . کوردۆ . حەمە پاریۆڵە . هەژار ) هەژار و حەمە پاریۆڵە لە گەڵ کاك کوردۆ بوون . لە کاتی گەڕانەوەی پێشمەرگەکان کە خواردنیانهێنابوو، من وتم ناگەڕێمەوە بە کاك عدنان بڵێن منیش لەگەڵ ئەماندا دەچم بۆ گەرمیان . کاك کوردۆ وتی بەکاك مەحمود بڵێ ..منیش پێم وت . کاك مەحمود وتی نابێت چونکە مەکتەبی سیاسی تەنها بەئێمەی وتووە . منیش سوور بووم لەسەر رۆیشتن لەگەڵیاندا ، کاك مەحمود وتی نانمان کەمە وتم : لەم برادەرانە شتێك کۆدەکەمەوە ، وتی پێڵاومان نییە ؛ (من ئەدیداسم لە پێدا نەبوو) وتم ئەوە مشکیلەی خۆمە ؛ هەرچۆنێك بوو ڕازیم کرد ، پاشان هەندێ کێکم لە برادەران پەیدا کردوو و ئەدیداسە کۆنەکانی هەژارم لە پێ کرد و لەگەڵ کۆڵە پشتیەك کە زیادە بوو ، لە گەڵیان کەوتمە رێ رۆژی ٢٤/ ١٩٨٩/٦ بوو ، رۆژێکی زۆر گەرم بوو .. لەرێگا هەندێ جار رادیۆکەم دەکردەوە ( لە پێشمەرگایەتیدا هەرگیز بی رادیۆ نەبووم) لە یەکێك لە ئیزگەکاندا باسی دوور خستنەوەی منتەزەری کرد لە دەسەڵاتی ئێران ؛ پێش ئەوەش خومێنی مردبوو ، وەعەدنان خێراللەش لە تەیارە سووتابوو ، رۆژێکیش پێش ئەو مشیل عەفلەق مردبوو .

لای خۆمەوە کەوتمە بیر کردنەوە ، ئایا بۆ لەم مانگەدا هەموو ئەمانە روویدا ؟ ئایا حاڵەتێکی ئاساییە ؟ یان دەبێت دەستێکی لەپشتەوە بێت !! بۆ خۆم قەناعەتێکم لا دروست بوو کە لەوانەیە غەرب کاریان بەم رژێمانەوە نەمابێت پێویستە گۆڕانکاریان تێدا بکات ، بەم خەیاڵانەوە گەیشتینە سەر شاخ و چیم بینی ؟ زۆربەی شارەزوور وگەرمیان و شارباژێر کەتە ژێر نیگای چاومەوە زۆر هەوڵمدا ورەی خۆم بەرزبکەمەوە و خۆم بخلافێنم بەڵام دڵ قوڵپەی گریان گرتی و بەبیرمدا نایەت کە حاڵەتێکی ئاوهام بەسەر دا هاتبێت ، مەگەر ئەوکاتەی باوکی فایق ژاڵەیی خەبەری ( دایك و باوکمی پێدام کە هەردووکیان عەمەلیاتیان کردووە کوڕێکی جاش بردوونیەتی بۆ خەستەخانە ). زۆر لە دێهاتەکانی شارەزوور دەرکەوتن وێرانکرابوون لەگەڵ هەست کردنم بەو شەپۆلە گەرمایەی گەرمیان یەکسەر یادگارییەکانی ساڵانی پێشووم بەبیردا هاتەوە . پرسیارم دەکرد ئاخۆ خەڵکی ئەم دێهاتانە ئێستا دەبێ لە کوێ بن ؟ و چیان بەسەر هاتبێت ؟ ( چونکە تا ئەو کاتە زانیاری تەواو لە کوشتنی بەکۆمەڵیان نەبوو ) پاشان لە ئاستی چاوگی دێی شێرە مەڕەوە دابەزینە خوارەوە بەڵام دەورووبەرمان مین ڕێژکرابوو دەتگوت عێراق پارەی هەموو نەوتەکەی بۆ مین و تەلی درکاوی سەرفکردبوو ! ترسم لە چاوی هەموو برادەران دەخوێندەوە بە خۆشمەوە(ترس لە مەجهول) چونکە ئێمە یەکەم مەفرەزەی یەکێتی بووین لەو سنوورەوە دابەزینە خوارەوە هیچ زانیارییەکی تەواویش لای برادەران نەبوو، زانیاریش نەبوو دەربارەی رەبایەکانی رژێمی بەعس .دەلیلەکانیش( فازڵ شێرە مەڕی . مام رەوف . کەماڵە خڕە . خەلیل سەرکانی . حمە سیاسی ) کە شارەزای ئەو سنوورە بوون، شەوی ٦/٢٥ گەیشتینە شێرە مەڕ ، من بۆ یەکەم جار بوو ئەو دێیە ببینم ، بەڵام بەداخەوە بە رووخاوی و بەشەو بینیم هەستم کرد دێیەکی خۆش بووە ، چونکە هەم ئاوی هەبوو هەم هەندێ داری تێدا مابوو ، ئاو هەواویەکی فێنك و دڵگیری هەبوو .

ئـەوە یەکـەم جـار بـوو پـاش سـاڵێك دوور کەوتنـەوە ئـاوی سـازگاری دێهاتـەکانی کوردستانی عێراق بنۆشین ، هەر ئەوشەوە گەیشتینە گوندی حـاجی حمـە ئـەمین ، گوندێکی رووخاو بوو تەنها حەوزەکەی مابوو لەسەر حەوزەکە ئیسـراحەتێکمان کـرد و هەندێ ئاو و کێکمان خـوارد ، لەوێـدا زۆر لەسـەر خـۆ قسـەمان دەکـرد ، چـونکە نەماندەزانی دوژمن لەکوێیە ؟

حەمە ئێرانی بەدەنگێکی بەرز بانگی برایمـی کـرد .. هـەموومان پێکـەوە وەك بلێـی کۆرسێك بین وتمان لەسـەر خـۆت .....!! بـۆ رۆژی دوایـی لـە چـەمی کوڵکنیـەکان ماینەوە ، رۆژێکی گـەرم بوو ، بۆ ئێوارە لە جادە پەڕینەوە و بەرۆژەکەی لـە زەڵـم ماینـەوە هـەروەها گـەرم و نـاخۆش بـوو بەتایبـەت دیـار بـوو کـە رژێـم تـازە ئـەو ناوچـەیەی تەمشـیت کردبـوو، چـونکە بـە شـەو کـەڕێمان دەکـرد بـۆنی سـووتانی پووش و پەڵاشەکان دەهات .

نزیکـی سـەعات ١٢ ی نێـوەڕۆ هەلیکۆپتـەرێك بەسـەرماندا تێپـەڕی زۆربـەمان تاخمەکانمان لەپشت کردبووە، بۆیە زوو تاقمەکانمان لەپشت کرد و تفەنگەکانمان بە دەستەوە گرت ، ئەمە وای کرد هەریەك لە ئێمە بەجۆرێك بیر بکاتەوە ....

ئیدی کاك سوهاد وتی : کاکـە ئـەمڕۆ ٢٧ و ٢٨ ی مانگـە ئـەم فڕۆکەیـە مووچـەی هێناوە .. ئێتر هەموومان لەقسەکردن وەستاین و تاڕادەیەك بڕوامـان بـە قسـەکەی هێنا ،ئێتر نازانم لەبەر ئـەوە بڕومـان هێنـا کـە لـەکاتی ترسـدا بـڕوا بـە بچـوکترین ئومێد دەکرێت ،یان هی ئەوە بوو کە تەیارەکە دوور کەوتەوەو لە چاو دیار نـەما ، بۆ شەوەکەی کەوتینە ڕێ لە پشتی قاجەرەوە پەڕینەوە لە جادەی سـەی سـادق ، بەرێگاوە شەو چووینە سەر رەبایەیەکدا لە شاندەری ‹ چونکە دەلیلەکان زانیاریان لەسەر مۆڵگـەکانی رژێـم نـەبوو ) ئەوەنـدە لـەو رەبایـە نزیـك بووینـەوە حەرەسـی رەبایەکەش ئاگای لە خۆی نەبوو وا شڵەژا بانگی کرد ( ئەحمـەد) بـە هـەمان شـێوە ئێمـەش شـڵەژاین و دوور کەوتینـەوە لـە رەبایەکـە ، رێگـا کـە دڕك و داڵێکـی زۆر

ناخۆشی هەبوو برادەران لە پێشەوە دڕکەکانیان دەبڕی ئەو سەرە شەکرۆکانە هەڵدەسایەوە و دەیدا بە ناوچاوانماندا چەند برادەرێکمان خوێن بە دەم و چاویاندا هاتبووە خوارێ ، بە هۆی ئەو حاڵەتەوە .

پاشان چووینە چەمی گەلاڵە لەوێ ڕۆژمان لێ بووەوەو ئاومان زۆر کەم پێی مابوو ئەو دۆڵەش ناسراوە بەبێ ئاوی خەممان لێ'هاتبوو ( تائێوارە لێرە بین بەبێ ئاو ) کاک مەحمود کەوتە گەڕان و پاش ماوەیەك وتیان کوڕینە وەرن ئاومان دۆزییەوە ، ئێمەش لە خۆشیدا ماندوو بوونمان لە بیر چووەوە، کەچووین ئاوەکەمان بینی ئاوێکی زۆر کەم بوو لەبەر ئەوەی ئاوی باراناو بوو لە نیوە قەدی شاخەکەش بوو ، دیار بوو تاوێرەکان ئاوەکەیان هەڵنەمژیبوو ، بەلاّم پڕ بوو لە ریقنەی کۆتر ، هەر چۆنێك بوو هەریەك نیوەی مەتارەیەکمان پڕ کرد و هەروەها بە مشتیش هەر یەك چەند قومێکمان لێ'خواردەوە ، سەعات چوار کەوتینە رێ لە نزیك دێی قەویلەوە بەلاّم دۆڵەکە زۆر گەرم بوو من جارێکی تریش بەو دۆڵەدا رەتبوو بووم بەلاّم ئەو کات یەك دوو دێ هەبوو ئاوەدان بوو بەلاّم هەستم نەکردبوو کە ئەو دۆڵە ئەوەندە گەرم بێت .

لە نێو دۆڵەکەدا شوێن پێی ولاّخ ( کەر ) و زەلام کەوتبوو یەکێك لە برادەران بەدەم ڕێگاوە وتی یەك دوو پێشمەرگەی گەرمیان کە تەسلیم بوونەتەوە بەڵێنیان بە حکومەت داوە کە پێشمەرگە تەسلیم بکەنەوە ، یان بکوژن لەبەرامبەر پاراستنیان .. ئێمەش کەوتینە گومان و حەزەرەوە چونکە جێ پێکان تازە بوو وە کەسیش نەیدەوێرا ئەو کاتە بێتە ئەو شوێنانە ، چونکە موحەڕەمە بوو . لەبەر ئەوە ڕێگا کە دوور بوو هەمیش دونیا گەرم بوو دیسانەوە ئاومان پێ نەما .. تا گەیشتینە کازاو لەوێ ئاو هەبوو، لەوێ چەند چادرێك هەڵدرابوو ( مۆڵگەی سەرباز ) چراکانیشیان هەڵکرا بوون فازل شیرە مەڕی و حەمە سیاسی چوون ئاویان بۆ هێناین هەر لەوێ دەست و دەم وچاومان شت و ئاومان خواردەوەو

مەتارەکانیشمان پڕ کرد. تائێوارە لەنێو ئەو شاخانەدا ماینەوە چەند وێنەیەکمان بۆ یادگاری گرت .

برادەران ( مام ڕەوف و فازیل و کەمالە خڕە و خەلیل سەرکانی ) خوا حافیزیان لێکردین و بەرەو ئێران گەڕانەوە بەڵام حەمە سیاسی و سوهاد لە گەڵمان هاتن ، پاشان کەوتینە ڕێ هێشتا ڕۆژ مابوو چووینە سەر ئەو شاخەی دەڕوانێتە سەر جادەی سلێمانی عەربەت، مەحمود سەنگاوی و حەمە سیاسی لە پێشەو بوون وتیان : کەمێك بگەڕێنەوە خوارەوە و دانیشن چونکە چەند ڕەبایەکی تازە لەم ناوە دانراوە ، کە تاریکی کرد کەوتینە ڕێ و لە جادە پەڕینەوە پاشان چووینە گوندی یەخی مالّی و لەوێ ئاومان خواردەوە ، و چووینە سەر ئاوی تانجەرۆ و لەوێشدا ئاوێکی زۆرمان خواردەوە .پاشان چووینە گوندی باخچە پاڵمان لێ دایەوە، من لە گەرمادا حاڵم زۆر پەشێوە چونکە زۆر لە مەساماتی گیانم کراوە نییە لەبەر ئەوە زۆر کەم عەرەقە دەکەم بەڵام هەموو لاشەم گەرم دەبێت ( جارێکیان لە شاخەکانی پشت کاپیلۆن حەرەسیاتمان دەگرت بەفرێکی زۆر باریبوو ئێمەش نایلۆن و گۆرەوی وپوزەوانەمان تێکەڵ بە یەکتر کردبوو لەبەر بەفر ( ڕەمەزان چاڵەڕەشی و سەلاح فەتاح ) مان لەگەڵ بوو وتیان : ئێستا خۆشە یا هاوین ، منیش وتم یاخوا ئەوەندەی تر بباری بەس هاوین نەیەتەوە ) کە خۆر لێی دام بە خەبەر هاتمەوە و بینیم کۆمەڵێك ڕەشە ولاخ لە دەورو بەرماندان وپاشان هەندێ برادەری تریش هەستابوون من و حەمە پاریۆڵە لە نزیکی یەك بووین وتم کاکە حەمە ئەو ولاخانە دەبینیت ؟

(پێمان سەیر بوو کە ولاخ لە و ناوچەیەدا بێت چونکە حکومەتی بەعس بۆی بکرابایە نەیدەهێلا باڵندەش بە ئاسمانی ئەو ناوەدا بفڕێت )

حەمە پاریۆڵە وتی : لەوانەیە وڵاخی جاشەکان بێت و بۆ جاسووسی کردن هەتبێتنە ئێرە . تا ئێوارە لە ناو تاوێر و بەردەکانماینەوە ، پاشان بۆ گوندی مۆریاس بەرێ کەوتین .. لەسەر ئەو شاخانە رەبایەی زۆر دانرابوو ، تەنانەت لەسەر رێگاکانیش .
لە وێ لە پاڵ هەندێ بەردو تاوێر جێی دانیشتنمان چاك کرد ، پێش نیوەڕۆ گوێم لێ بوو کاك مەحمود لە گەڵ جیهازێکدا قسەی کرد بەلام بە جفرە ، ئێوارە بەرێ کەوتین چووینە سەر شاخ و ناوچەی قەرەغمان لێ بەدیار کەوت .ناوچەکە هەمووی ئاگری تێ بەردرابوو ، دیار بوو تازە حکومەت ئەو ناوچەیەی تەمشیت کردبوو ، ( لەسەر شاخ هەژار و حەمە ئێرانی بوو بە شەڕیان من لێم کردنەوە وتم ئێستا کاتی شەڕە ) .
پاش ماندووبونێکی زۆر بەرێ کەوتین و گەیشتینە نزیکی ئەستێڵی سەروو ، برادەران وتیان : لەوێوە سەردەکەوین زۆر دڵخۆش بووین کە ئەم شەو دەگەڕێنەوە سنووری گەرمیان ، بەلام سەرەوەی دێ کەئاگری تێدا کرابوەوە لە زۆر شوێنەوە لایتی لێدەدرا ، ناچار گەڕاینەوە ئەستێڵی خواروو ، لەوێدا هێشتا گڕی پووشەکان مابوو کە نیشانەی ئەوە بوو ئێوارەی پێشوو حکومەتی بەعس سووتاندبووی ، ئێمەش لە ناو ئەو زەلانە خۆمان قایم کرد ( بەلام باوەڕ ناکەم هیچ نووسەر و چیرۆکنووس و رۆمانووسێك هیچ شێوەکارێك بتوانێت وەسفی ئەو رۆژەی ئێمە بکات تەنانەت ئێستا بۆ خۆشمان ناتوانین وەسفی ئەو رۆژە بکەین ! !
دەترساین دوژمن نزیکمان بێت رۆژگار زۆر درێژ بوو ، کاك حەمە پاریۆڵە بە دەنگێکی زۆر کز و بەحاڵ بیستراو دەیووت ( ئەرێ خۆر هیچ لە شوێنی خۆی دەجوڵێ؟) هەژاریش بەتەنیشتمەوە بوو بە ئەسپاییەوە هەواڵی سەعاتی دەپرسی سەعات ١٠,١٥ خولەك بوو ، بەبەردەوامی پرسیاری سەعاتی دەکرد ! ! کاك کوردۆ بۆ جگەرە حاڵی زۆر پەرێشان بوو خەریك بوو لەگەڵ کاك مەحمود بێتە ناخۆشیان

لەسەر جگەرە کێشان، بەلأم بەهەموو برادەرانەوە نەیانهێلا کاک کوردۆ جگەرە بکێشێت ( کاک کوردۆ رۆژێك جگەرە نە کێشێت موستەحیلە ! ! )

پاشان گەڕاینەوەو چووینە نزیك گوندی کۆشکی سەروو ، بەرێگاوە گوێم لە دەنگی بۆق بوو ، زۆر خۆش بوو بەلامەوە ئەگەرچی لە هەموو ژیانمدا حەزم لە دەنگی نەبووە ،لەگەڵ هەژاردا نزیکی دەنگەکە بووینەوە ، بەلأم نەدەنگ ماو نە ئاویش هەبوو ؛ برادەرانیش هەندێ لێمان دوورکەتبوونەوە بە هۆی ( بۆق ئەفەنیەوە) پاشان سەد جوێنم بە بۆق دا .

ئەو شەوە لەوێ ماینەوە رێکەوتی ٧/١ بوو منیش لە تەسکەرەکەمدا لە دایك بوونی ٧/١ نووسرابوو ؛ لە مفکرەکەمدا نووسیم ( ئەگەر راست بێت لەم رۆژەدا لە دایك بووبێتم ئەوە هەر لەوانەیە لەم رۆژەشدا لە تیونێتیدا بخنکێم ) .

چاوەڕوانی خۆر ئاوا بوون بووین تاریك داهات چووینە کانیەکەی سێوسینان ئاومان خوارد ، و مەتارەکانمان پڕ کردو کەوتینە رێ سیوسینانیش رەبایەی تێدا دانرابوو ، پاشان گەڕاینەوە بۆ قۆپیەکەی راست (زەردە لیکاو ) و بەلأم ئەویش گیرابوو ، دوژمن لێ بوو چەند سەد مەترێك گەڕاینەوە دواوە لەوێدا رۆژمان لێ بووەوە ، لە ناو دۆڵەکاندا خۆمان حەشاردا ( لە برسی و تیونێتدا چەند بیرۆکەیەکی پەشیمانیم بۆ دەهات ( باشە بۆ من لەگەڵ ئەماندا هاتم ...! ! )

نیوەڕۆ بوو کاک حەمە پاریۆڵە وتی من رێگایەك شارەزام کاتی خۆی مەحمودی مامە عەزەو منالەکانی لەوێدا بوون و لەوێشەوە سەردەکەوین بۆ زەردە .. پێش تاریك داهاتن کەوتینە رێ لە رێگا کاک حەمە شوێنەکەی مەحمودی مامە عەزەو منالەکانی پێ نیشاندام وتی : لێرەش ( دەستی درێژ کرد بۆ کەمێك سەروتر ) منداڵەکانی کوژران بەدەستی حەمایەکەی خۆی ، پاشان سەرکەوتین بۆ شاخی زەردە بەلأم ئەو شوێنە قۆپی نەبوو ، بۆیە حکومەتی بەعس رەبایەی لێ دانەنابوو .

حەمە پاریۆڵە وتی : لەوانەیە وڵاخی جاشەکان بێت و بۆ جاسووسی کردن هەتبێتنە ئێرە . تا ئێوارە لە ناو تاوێر و بەردەکان ماینەوە ، پاشان بۆ گوندی مۆریاس بەڕێ کەوتین .. لەسەر ئەو شاخانە رەبایەی زۆر دانرابوو ، تەنانەت لەسەر رێگاکانیش .
لە وێ لە پاڵ هەندێ بەردو تاوێر جێی دانیشتنمان چاك کرد ، پێش نیوەڕۆ گوێم لێ بوو کاك مەحمود لە گەڵ جیهازێکدا قسەی کرد بەڵام بە جفرە ، ئێوارە بەڕێ کەوتین چووینە سەر شاخ و ناوچەی قەرەغمان لێ بەدیار کەوت .ناوچەکە هەمووی ئاگری تێ بەردرابوو ، دیار بوو تازە حکومەت ئەو ناوچەیەی تەمشیت کردبوو ، ( لەسەر شاخ هەژار و حەمە ئێرانی بوو بە شەڕیان من لێم کردنەوە وتم ئێستا کاتی شەڕە ) .
پاش ماندووبونێکی زۆر بەڕێ کەوتین و گەیشتینە نزیکی ئەستێڵی سەروو ، برادەران وتیان : لەوێوە سەردەکەوین زۆر دڵخۆش بووین کە ئەم شەو دەگەڕێنەوە سنووری گەرمیان ، بەڵام سەرەوەی دێ کەئاگری تێدا کرابووەوە لە زۆر شوێنەوە لایتی لێدەدرا ، ناچار گەڕاینەوە ئەستێڵی خواروو ، لەوێدا هێشتا گڕی پووشەکان مابوو کە نیشانەی ئەوە بوو ئێوارەی پێشوو حکومەتی بەعس سووتاندبووی ، ئێمەش لە ناو ئەو زەلانە خۆمان قایم کرد ( بەڵام باوەڕ ناکەم هیچ نووسەر و چیرۆکنووس و رۆمانووسێك هیچ شێوەکارێك بتوانێت وەسفی ئەو رۆژەی ئێمە بکات تەنانەت ئێستا بۆ خۆشمان ناتوانین وەسفی ئەو رۆژە بکەین ! !
دەترساین دوژمن نزیکمان بێت رۆژگار زۆر درێژ بوو ، کاك حەمە پاریۆڵە بە دەنگێکی زۆر کز و بەحاڵ بیستراو دەیووت ( ئەرێ خۆر هیچ لە شوێنی خۆی دەجوڵێ؟) هەژاریش بەتەنیشتمەوە بوو بە ئەسپاییەوە هەواڵی سەعاتی دەپرسی سەعات ١٠,١٥ خولەك بوو ، بەبەردەوامی پرسیاری سەعاتی دەکرد ! ! کاك کوردۆ بۆ جگەرە حاڵی زۆر پەرێشان بوو خەریك بوو لەگەڵ کاك مەحمود بێتە ناخۆشیان

لەسەر جگەرە کێشـان، بـەڵام بەهـەموو برادەرانـەوە نـەیانهێڵا کـاك کـوردۆ جگـەرە بکێشێت ( کاك کوردۆ رۆژێك جگەرە نە کێشێت موستەحیلە ! ! )

پاشان گەڕاینەوەو چووینە نزیك گوندی کۆشکی سەروو ، بەرێگاوە گوێم لە دەنگـی بۆق بوو ، زۆر خۆش بوو بەلامـەوە ئەگەرچـی لـە هـەموو ژیانمـدا حـەزم لـە دەنگـی نەبووە ،لەگەڵ هەژاردا نزیکی دەنگەکـە بووینـەوە ، بـەڵام نـەدەنگ مـاو نـە ئـاویش هەبوو ، بـرادەرانیش هەنـدێ لێمـان دوورکەتبوونـەوە بـە هـۆی ( بـۆق ئەفەنیـەوە) پاشان سەد جوێنم بە بۆق دا .

ئەو شەوە لەوێ ماینەوە رێکەوتی ٧/١ بوو منیش لە تەسکەرەکەمدا لە دایك بـوونی ٧/١ نووسرابوو ، لە مفکرەکەمدا نووسیم ( ئەگـەر راسـت بێـت لـەم رۆژەدا لـە دایـك بووبێتم ئەوە هەر لەوانەیە لەم رۆژەشدا لە تیونێتیدا بخنکێم ) .

چاوەڕوانی خۆر ئاوا بوون بووین تاریك داهات چووینە کانیەکەی سێوسینان ئاومـان خوارد ، و مەتارەکانمان پڕ کردو کەوتینە رێ سیوسینانیش رەبایەی تێدا دانرابوو ، پاشان گەڕاینـەوە بـۆ قۆپیەکـەی راسـت (زەردە لیکـاو ) و بـەڵام ئـەویش گیرابـوو ، دوژمن لێ بوو چەند سەد مەترێك گەڕاینەوە دواوە لەوێدا رۆژمان لێ بووەوە ، لـە نـاو دۆڵەکاندا خۆمان حەشاردا ( لە برسی و تیونێتـدا چـەند بیرۆکەیـەکی پەشـیمانیم بـۆ دەهات ( باشە بۆ من لەگەڵ ئەماندا هاتم ...! ! )

نێوەڕۆ بوو کاك حەمە پاریۆڵە وتی من رێگایەك شارەزام کاتی خۆی مەحمودی مامـە عەزەو منداڵەکانی لەوێدا بوون و لەوێشەوە سـەردەکەوین بـۆ زەردە .. پـێش تاریـك داهاتن کەوتینە رێ لە رێگا کاك حەمە شوێنەکەی مەحمودی مامە عەزەو منداڵەکانی پێ نیشاندام وتی : لێرەش ( دەسـتی درێـژ کـرد بـۆ کـەمێك سـەروتر ) منداڵـەکانی کوژران بەدەستی حەمایەکەی خۆی ، پاشان سەرکەوتین بۆ شاخی زەردە بەڵام ئەو شوێنە قۆپی نەبوو ، بۆیە حکومەتی بەعس رەبایەی لێ دانەنابوو .

كە گەیشتینە سەر شاخ هەموو گەرمیانی لەش مردوومان لێ دەرکەوت ، خۆم هەستم دەکرد کە سەبرێکم هەیە دەتوانم سەبریش بشکێنمەوە بەلأم لەبەرامبەر لاشەی گەرمیاندا خۆم پێ ڕانەگیراو گریانێکی بە سۆز گرتمی و نەم توانی بە هیچ شێوەیەك خۆمی لێ رزگار بکەم فرمێسك بە چاوانمدا هاتە خوارەوە و هەموو روومەتی تەرکردم زمانم لە گۆ کەوت بۆ وەلآمی ئەو هەموو پرسیارانەی کە بەمێشکمدا گوزەری دەکرد کە لە چرکەیەکدا خۆی لە سەدان پرسیار دەبینیەوە.

کە رۆژ بووەوە دابەزینەخوارەوە،بۆتاوێرو بەردەکانی ( زەردە لیکاو) ، دیار بوو کاك مەحمود لەگەڵ شێخ کەریم چاو ڕەش دا بەجیهاز قسەی کردبوو چونکە ئەوان لەوێدا چاوەڕوانمان بوون ( شێخ کەریم . شێخ حسام . خەباتە بچکول . هونەر زاوای حەمە رەش ) یەکەم جار بوو من شێخ حسام و خەبات ببینم ، بەبینی ئەو برادەرانە هێزمان بەبەردا هاتەوەو چەندین پرسیارمان ئاراستە کردن ئەوانیش هەروەها هەواڵی برادەرانی ئێرانیان دەپرسی . لەوێدا (چا ) یان بۆ کردین و نان و چامان خوارد پاش حەوانەوە کەوتینە ڕێ لە ڕێگاکەی خوار ( تەپە گەڕوز) هەندێ موعەلەباتمان دۆزییەوە دیار بوو هی کاتی تەمشیتی جەیش بوو ئێمەش هەڵمان گرتن ، ( بەلأم برادەران وتیان مەیخۆن نەوەك ژەهراوی کرابن ئێمەش لە ترسا نەماخوارد ) بەلأم کاك مقداد وتی من یەکێکی دەخۆم ئەگەر ژەهراوی کرابوو با بەتەنها من بکوژێت .پاش ئەوەی کاك مقداد خواردی هێشتا تەواوی نەکردبوو ئێمەش بەدەم ڕێگاوە بەحەربەکانمان قوتوەکانمان شکاند و خواردمان ، بۆ دەم و بەیانی گەیشتینە شاخی ئاشداخ ( ئاش داخ شاخێکە دەکەوێتە نزیك سەنگاوەوە و زۆر سەختە )

یەکەم جار کاك حەمە رەشم بینی زۆر بەگەرمی باوەشمان بەیەکدا کرد ، چونکە لە پێش پرۆسەی ئەنفال سەرتیپمان بوو، پەیوەندیشمان زۆر خۆش بوو ، پاشان موکەڕەمم بینی لە گەڵ ئەویش بەهەمان شێوە دەست لەملان بووین ، هەروەها

لەگەڵ کەریم برای شەهید حەسەن بەڵام مـن حەمـە ئاخـەم بـاش نەدەناسـی ، بۆیـە وەکو ئـەوان باوەشمـان بەیەکدا نـەکرد، پاشـان لەگـەڵ موکـەڕەم چـووینە دامێنـی شاخەکەو ئیتر کەوتینە پرسیارو وەڵام  لە یەکتری ( هەردووکمان کادری رێکخسـتنی کەلار بووین لە پێش ئـەنفال ماوەیـەکیش لـە یـەك سـنوور پێکـەوە کارمـان کردبـوو یادگاری زۆرمان لە نێواندا هـەبوو ) لـە لاشمانـەوە کـاك ( مـەحمود و حەمـەرەش و کوردۆ ) خەریکی قسەو باسی حۆیان بوون ماوەی سێ رۆژ لایان ماینەوە .

لەگەڵ موکەڕەم چووینە ئەو ئەشکەوتەی کە ناویان نابوو ( هەزار ئـاوا)  چـونکە پـڕ بوو لە مشك و ئەیانچواند بە ماڵەهەزارەکان، رێگای ئەشکەوتەکە  زۆر نارەحەت بـوو چـونکە ئەشـکەوتەکە  کـەوتبووە نێـو قـەدی شـاخەکەوە و دەبوایـە بـۆ چـوونە ژوورەوەی پشت لە شـاخەکە بکـەیت  و رووت لـە خـوارەوەی شـاخەکە بێـت ئەگـەر بەپێچـەوانەوە بێـت  ئـەوە کەسـەکە دەکەوێتـە خـوارەوە ، هـەر ئـەو کاتـەش کـاك (مەریوانی حاجی حسێن) م ناسـی  و وتیـان خزمـی کـەریم رەفعەتـە ( لەگـەڵ کـەریم بەینم زۆر خۆش بوو پێش تەسلیم بوونەوەی بە هـۆی فشـار خسـتنە سـەری لەسـەر ئاڵای شۆڕش )

لـە ٧/٧ لەگـەڵ کـاك حەمـە پاریزڵـە و هـەزار کەوتینـە رێ  بـۆ سـنووری کـەلارو باوەنور، کـە مەفرەزەیـەکی تێدا بـوو لـە گـەڵ سـەید محەمـەد چـونکە ئێمـە پـێش پرۆسەی ئەنفال لەو ناوچەیە پێشمەرگە بووین، و زیاتر شارەزای ئەو سنوورە بـووین و لە هەمانکاتیشدا کـە ئێمـە لەگـەڵ کـاك کـوردۆ بـووین ئـەویش لێپرسـراوی کـەرتی رێکخستنی کەلار بوو ، زۆربەی  رێکخستنەکانیشـان لەو سنوورەدا بوون .

لە دەم وبەیانی ٩و٧/١٠ گەیشتینە لای سەید و برادەران ( ئەحمەد زەرداوی . حەمە کادر .نەوزاد کەریم فارس . حەمە سۆرانی مامۆستا غازی . مامۆستا حسێن ) کە لـە جێگایەکدا دەژیان پێـی دەوتـرا ( کونەکـەی سـەید) واتـا ئەشـکەوتەکەی سـەید کـە دەکەوێتە نێوان پاریزڵە و زاوت و ترشەکە ( ئەمانە سێ دێی سەر بە بـاوەنورن) لـەو

برادەرانــە جگـە لـە سـەيد تـەنها حەمـە كـادرم بـاش دەناسـی چـونکە ئـەويش پێشـمەرگەی (٥٣) ی شـێروانە بـوو ؛ هـەروەها حەمـە سـۆرانيش لـە حەملەكـەی هەڵەبجە پێكەوە بووين .

برادەرانی تر بە حەمە سۆرانيشەوە لە تيپی (٥١) ی گەرميان بوون ، بـەلأم مـن لـە تيپی (٥٣) ی شێروانە بووم لە پێش ئەنفال ، چەند رۆژێكمان پێكەوە بەسەر برد لـە گەڵ ئەو برادەرانـەو سـەيد زۆر هـەواڵی ( حەسـەنی برامـی دەپرسـی ) كـە تـازە لـە زيندانی مۆئەبەد عەفوكرابوو .

كـاك ئەحمـەد زەرداوی زۆر تاقـەتی دەسـتكاری كردنـی راديـۆی هـەبوو ئێـوارەی ١٩٨٩/٧/١٣ وتی ئەم راديۆيە بگـرە ؛ پاشـان چـووين بـۆ ئـەو جێگايـەی كـە لێـی دەخـەوتين راديۆكـەم كـردەوە بـە رێكـەوت سـەعات (٨) بـوو راديۆكـە لـە سـەر مۆنتيكارلۆ بوو لە گەڵ كردنەوەی راديۆكەدا كە پيلەكانيشی تەواو نەبوو ، نابووم بە گوێمەوە هەواڵی داو وتـی ) اغتيـال الـزعيم الكـردی عبـدالرحمن قـاسملو علـی طاولـة المفاوضات ) منيش ئاخێكی قـوڵم هەڵكێشـا .... ئـيتر هـەر زوو بـرادەران لـە دەورم كۆبوونەوە وتيان بيخەرە سەر تەفاسيلەكەی ..

ئێوارەی ٧/١٧ سەيد بە جيهازەكەی لای من كـە هـی كـاك كوردۆ بـوو بـە نـاوی (شايب) ە كە هەر لەئێرانەوە لای من بوو قسەی لەگەڵ حەمە سـۆران كـرد كـە لـە نزيكی كەلار بوون ، ديار بـوو باسـيان لـە شـاردنەوەی چـەك و تەقەمـەنی دەكـرد ، منيش وتم : سەيد ئەوە تۆ چۆن وا بـە ئاشـكرا قسـە دەكـەی ترسـتان نييـە، ( وتـی دەماغسز ئەمە ئيشمانە هەموو رۆژێك ) منيش ئيتر وازم هێنا . پاشان سەيد وتی من دوو بەيانی دەچـم بـۆ نـاو شـار دێيـت لـە گـەڵم، راسـتيەكەی مـن دوو دڵ بـووم، لـە رۆيشتن لەگەڵ كاك سەيد رۆژی دواتر كاك حەمە رەش و كاك مەحمود هاتنـە لامـان وتيان بچن بۆ زەردە ليكاو ، لەگەڵ حەمـە پاريۆڵـە بـۆ پـيری ئـەو برادەرانـە كـە لـە ئێرانەوە دێن .

منیش نامەیەکم بۆ ماڵ نووسی و دام بە کاك سەید و ئەویش لە شار دابیوو بە جمعەی مەجید داویّ و ئەویش دابووی بە ئەحمەد سەعید و ئەویش گەیاندبووی بە حەسەنی برام . من و کاك حەمە پاریزلە و کاك ئەحمەد زەرداویش هەر ئەو ئێوارەیە بەریّ کەوتین بۆ شاخی زەردەو بە هەرسێکمانەوە یەك جیهازمان پیّ بوو لە ئێوارەی ۲۰ /۷ من و کاك حەمە سەرکەوتینە سەر شاخ و کاك ئەحمەد زەرداوی لە تاوێر و بەردەکانی لای زەردە لیکاو لە گەڵ گویّ درێژەکەو خواردنەکە مایەوە ئەو شەوە هەرچەندە جیهازمان کرد هیچ وەڵامێك نەبوو بۆ رۆژەکەی تر لەگەڵ کاك حەمە چووینە سەر کانیەکەی دێی قۆپی و هەندیّ ئاومان کرد بە خۆماندا و مەتارەکانمان پرکردو هاتینەوە ... عەزە سەرەوە لەسەر شاخەوە بانگمان لەکاك ئەحمەد دەکرد گویّی لیّ نەبوو ،کاکە حەمە چووە خوارەوە بۆ هێنانی خواردن و شەو گەڕایەوە ، ئەو شەوەش هەر چیمانکرد برادەرنمان وەرنەگرت ، ئەوەندە خەریکی جیهازەکە بووم وایەرەکەی بڕا ،جیهازەکە جۆری ( هۆکی تۆکی ) بوو ، هیچ ئەدەواتێکی کردنەوەی بورغیشمان پیّ نەبوو

زۆر دامایـن ، ئایا دەبێت چی بکەین چوون بەبیّ ئەریەڵ هیچ دەنگێکی نەدەهێناو نەدەگەیاند لەبیرکردنەوەدا بووم لەناکاو لەگیرفانمدا دەستم بەر شتێك کەوت بینیم ( دوو قرانیەکە ) وابزانم هەر لە دزڵیەوە لەگیرفانمدا بوو ( دوو قرانی ڕاستە خریوو بەلأم ئەستور نەبوو ) وەکو ۲۵فلسیەکانی جاران بوو ، لەبورغیەکەم بەست و سوڕم دا بورغیەکەی کردەوە ، پاشان بورغیەکانی تریشم بەهەمان شێوە کردەو ، باشی ئەو جیهازە لەوە دابوو کە ڕوو تەخت و شوێنی بەستنی بورغیەکانی لە قوڵأیدا نەبوو ، بۆ ئێوارە لەگەڵ کاکە حەمە ( کەئەو دەستی خستبووە سەر وایەرە براوەکەو منیش بەدەستیّ جیها زەکەو بەپەنچە گەورەی هەمان دەستم ئیشم بەدوگمەکانی گویّ گرتن و قسەکردن دەکرد و بەدەستەکەی تریشم پشتی جیهازەکەم گرتبوو بۆ ئەوەی وایەرەکانی نەبڕێت ، زۆر هەو ڵماندا کەس نەهاتە سەر خەت کاکە حەمە

دوای نیوەڕۆ دابەزیە خوارەوە بۆ لای کاک ئەحمەد شەوە نەهاتەوە ؛ شەو خۆم بەتەنها لەسەر شاخی زەردە بووم ، وردە وردە چوومە بەرزترین لووتکەی زەردە کە دیروانیە سەر هەموو ناوچەکە ( بریسکەی گلۆپەکان لەکەلارەوە بۆ سولەیمانی لێمەوە دیار بوون بەتایبەتی ئەوانەی دەربەندیخان زۆر ڕوونتر بوون ؛ نەم دەزانی لەکوێ پشویەك بدەم جونکە دەمزانی ئەو شاخە دڕندەی کێوی لێ یە و گەر بخەوم لەوانەیە پەلامارم بدەن ، چوومە سەر گابەردێکی گەورەو دانیشتم ، دونیا زۆر کپ و ئارام بوو هیچ دەنگێك نەدەهات جارجار نەبێت دەنگی (زیقاوڵە) ئەو مەلانەی بەشەو دەقیرێنن ) ڕایان دەچەڵەکاندم و خەیاڵ و بیرکردنەوەمیان دەپچڕاند ، هەموو ناوچەکە چۆڵ دیاربوو ،زوریش خەوم دەهات و نەم دەوێرا بخەوم وەك ئەوەی بەدیار جەنازەیەکەوە دانیشتبم ، سەعات ١٢شەو بەهەر جۆرێك بوو جیهازەکەم کردەوە و بانگی ( شاهۆ ) م کرد کەعەدد جیهازی ئەو مەفرەزیە بوو کەئێمە بەرەو پیریان دەڕۆیشتین ، یەکسەر حەمە چاو جوانی کفری وڵامی دامەوەو ووتی شاهۆت لەگەڵە ، منیش دڵخۆشیەك دایگرتم هەرچی ماندوو بوون و تەنیای بوو لەبیرم چووەو ، ووتم لەکوێن وتی لەنزیك شەکری شوعیەکانین ئیتر نازانم کەلە شاخەکەی بەرامبەرن ، منیش ووتم وەرن من لە ڕێگاکەتانم ، حەمەی کفری ووتی بەخوا زۆر ماندووین پشوویەك دەدەین و بەیانی دێینە لاتان ، ئیتر هەستم کرد کەئاسوودەم و لەسەر بەردەکە ڕاکشام و ئەوندەی نەبرد ڕۆژبووەو ە ، کەسەیری خوارەوەم کرد بینیم ( قۆپی ) پڕە لەجاش و جەیش و بەو بەیانیە زووە هاتبوون بۆ تەمشیت ، زۆر جێگا گەڕان بەڵام نەهاتنە سەر شاخ و نزیکەی سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆ ئینسحابیانکرد ، جیهازم کردەوە و بەشاهۆ بڵێم ووتیان ئاگامان لێ یە خوارەوەمان تەمشیت دەکرێت ، پاش تەمشیتەکە هەردوو لامان چووینە خوارەوە بۆ ناوقۆپی و دوای هەواڵ پرسینێکی گەرم لەگەڵ شەهاب خانەقینی و کاك هەڵکەوتدا چووین لە حەوزەکەی قۆپی ئاومان بۆ هێنان و، ئەو مەفرەزەیە بریتی بوون لە ( ماجد فەیلی ،

ئـازاد قـەرەوڵـسـی ، یاسـین شـاربـاژێڕی ، د.هـاوڕێ ، حەمـە چـاو جـوانی کفـری ، هەڵکـەوت ، حەسـەن شـێخ لەنگـەری ، شـەهاب خانـەقینی ، شـەماڵ قـەرەیاتاغی ، ،سوهاد ، حەمە سیاسی )یش کەچوو بوونە پیریانەوە بۆ پۆشین پاشـان هاتینـە لای کاك حەمە پاریۆڵەو کاك ئەحمەد زەرداوی ، هەر لەوێ نانمـان خـواردو شـەو بـەڕێ کەوتین بۆ ئێوارەی ڕۆژی پاشتر کاك سوهادو یەکێکی تر لەنزیك قـەڵای تەپـە گـەروز ئـەو چـەکانەیان شـاردەوە کـەدژی تـەیارە بـوون ،کـە لەئێرانـەوە هێنابوویـان ، لە٧/٢٥گەیشتینە مەلجەکانی پشت ڕۆسەی شـامار ، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی دونیـا زۆر گـەرم بـوو مەلجـەکانمان بەکارنـەدەهێنا بـۆ پشـوودان و هـەر لەدوڵەکانـدا نانمـان دەخواردو پشوومان دەدا ،لـە٧/٢٨کـاك عوسمـانی حـاجی مـەحمود( تائـەو کاتـەی پاش ئەنفال لەگەرمیان چاوم پێنەکەو تبوو ) ووتی من دەنگم ناگاتـە کـاك مـەحمود پێی بڵێ کە سەید گلەیی لێ کردووم لای برادەرانی ناو شار گوایە من ( کاك عوسمـان ) گۆشت و مریشکم دەگاتێ و بەشی ئەوانی لێنادەم

( ئە وکات سەید لەکەلاردا بوو ) پاشان ووتی شـایب نەهاتووەتـەوە ، ووتم نـەخێر ، کاك کوردۆ لەگەڵ هەژاردا ڕۆیشتبوو بۆ چەمی بەرلووت بۆ بینینی ئەحمـەدی مالیـەو فایەق کەلاری ، بۆ چەند ڕۆژێك لەدەورو بەری مەلجەکانماینەوە .

پێش نیوەڕۆی ٨/٣کەریمی برای شەهید حەسەن بەتەنها گەڕایەوە لامـان کەلەگـەڵ سەید موحەمەد چووبوو بۆ کەلار پاش هەواڵ پرسین ، ووتی پەیوەندیت لەگەڵ کاك عوسمان و ئەواندا هەیە ووتم ئێوارە ( چونکە ئەگەر تەمشیت نەبووایە زۆربـەی کـات ئێواران پەیوەندی دەکرا لەبەرئەوەی بەڕۆژ نەدەکرا بچینە بەرزایەکان بۆ پەیوەنـدی کردن لەترسی چاودێر کردنی دوژمـن ) کـەریم ووتـی کاکـە زوو ئاگاداریـان بکـەرەوە چـونکە ژیـانی سـەید لەمەترسـیدایە خزمـەکانم منیـان بـەفێڵ دەرکـردووە ، هەسـت دەکەم ژیانی سەید لەمەترسیدایە ، ئێوارەکەی کاك عوسمان هـەواڵی (شـایب ) کـاك کـوردۆی پرسـی ووتم نەگەڕاوەتـەوە ، کـاك عوسمـان زۆر مەشـغوڵ دیـاربوو

لەجیهازەکەدا ووتم ئەوە کەریم گەڕاوەتەوە و باسی سەید دەکات ، بەڵام دوای تەواو کردنی قسەکانم دەرکەوت ئەو پەیوەندی لەگەڵ نەمابوو ، هەر ئەو شەوە ئێمەش لەو جێگایە دوور کەوتینەوە  کە سەید شارەزایی بوو ، حەمەی کفری و ئازاد قەرەو لَسی و سوهاد چوون بۆ شاخی ئاشداغ ، ئێمەش لەگەڵ کاک حەمە پاریزۆڵە شارەزایەکی زۆر باشی لەناوچەکەدا هەبوو لەگەڵیدا چووینە دۆڵەکانی نێوان ( پاریزۆڵەو پارەمەن ) کەجێگەیەکی زۆر سەخت بوو ، بەڵام کێشەی بێ پیلی جیهازەکەشمان بۆ دروست بوو ، ماوەیەك بوو کاك کوردۆ ڕۆیشتبوو نەگەڕابووەوە بۆ ئەوەی پیل لەگەڵ خۆی بێنێت ( یەکێك لەداواکاریە سەرەکیەکانمان لەبرادەرانی ناو شار هێنانی پیل بوو )   ئێمەش نەچووبووینە سەر هیچ مەوعیدێکی برادەرانی ناوشار بەهۆی گەیاندنی ئەو برادەرانەوە کە لەئێرانەوە هاتبوون ، ماوەی دوو ڕۆژ لەوەێ ماینەوە بەبێ هیچ پەیوەندی و زانیاریەك لەسەر ناوچەکە ، پاشان چووینە ئەو شوێنەی کە پێی دەڵێن( سەلاجەکە ) کە دەکەوێتە سنووری پاریزۆڵە ، ئەو شوێنەی سەرەڕای ئەوەی کە دەکەوێتە سنووری گەرمیانەوە ، بەڵام ئەشکەوتێکە ئەوەندە سارده لەمانگی تەموزدا ، نیوەڕوان بەبێ بەتانی ناتوانیت تێدا ئیسراحەت بکەیت ، لە٨/٨کاك کوردۆو هەژارو موکەڕەم گەڕانەوە لامان ( ئەحمەد سەعیدو ئەحمەدی مالیە) یان بینیبوو ، کەهەواڵی سەیدمان لێ پرسین هیچ زانیاریەکیان نەبوو ، ووتیان برادەرانی ناوشار هیچیان لەوبارەیەوە باس نەکردووە.

لە٩/٨لەگەڵ کەریم و مەکەڕەم بەگوێدرێژە سپییەوە چووین بۆ دار هێنان لەخانوەکەی باوکی برایمە سوور ( ئەو گوێدرێژە زۆر عیناد بوو گەر خیشی بکردایە هەرچیت پێ بکردایە ڕێی نەدەکرد ، موکەڕەم و کەریم لەوێدا بوو بەناخۆشیان ، بیرم نایەت لەسەر چی بوو ، بەڵام کاتەکە هی ئەوە نەبوو ئەو برادەرانە لەگەڵ یەك تێکبچن ، چونکە هەم دونیا ڕۆژ بوو هەم پێویستیەکی زۆر مان بەدار بوو ، سەرەڕای ئەمانە گوێدرێژەکەش خیشی کردبوو ، هەرچۆنێك بوو ئەوانم ئاشتکردەوە

، بەلأم ئەوەندە لەگەڵ گوێدرێژەکە خەریك بووین باری بکەین ڕانەدەوستا تەنانەت من وام لێهات بڵێم ( هۆش براکەم هۆش ...... ! ! )

کاك کوردۆ موعیدی دانابوو لەگەڵ ئەحمەدی مالیە و جومعەی مەجید داویە بۆ ڕۆژی ١٢/ ٨ئێوارەکەی لەگەڵ کاك کوردۆوحەمە پاریۆڵەو کەریم و من بەڕێ کەوتین بۆ سەرمەو عید، لای سەلاجەکەوە ، بەتوولە ڕێگایەکدا کەدەکەوێتە نێوان (سەلاجەکەو زەنگەکەوە ) دەڕۆیشتین لەملەیەکدا دانیشتین بۆ ئیسراحەت کردن ، ناوچەکە چوڵ و زۆر گەرم بوو، لە سێبەرێکدا دانیشتین و نان و شەکەرمان خوارد، کاك کوردۆ لەو کاتەدا، ووتی پاش ماندوو بوون شەکەر ووزە دەداتە ئینسان ، لەقسەکردندا بووین لەدوورەوە شتێکی سپی دیاربوو کاك حەمە ووتی ماینەکەی مەجەی بۆرمە(ئەمە پیاوێکی قسە خۆشی دێ ی پاریۆڵە بوو) نەجاش و نەجەیش نەیتوانیوە بیگرێ لەو کاتەوە هەرلەم ناوەدایە، پاش چەند دەقیقەیەك ماینەکە گەیشتە لامان و هەندێ سەیری کردین و سەری بادەدا، وەك چۆن بڵێی لەم چۆڵەوانیەدا ئەمانە چی دەکەن ، کەریم لەتەنانێکی بەدەستەوە بوو ،ویستی لەڕێگای نان پێدانیەوە بیگرێت ، بەلأم ماینەکە بەنزیك بوونەوەی کەریم ئەو دوور دەکەوتەوە کەریم زۆر هەوڵی لەگەڵدا ،بەلأم سەر ئەنجام هەڵهات و دورکەوتەوە لێمان ، ئێمەش کەوتینە ڕێ بەلأم جارجارە کە ئاوڕمان دەدایەو ، دەمانبینی ماینەکە هەروەستاوەو سەیری ئێمە دەکات، تابەرەو خوار بووینەوە و لەچاو وونبوو، چووینە دۆڵێکی پشتی زەنگەکە و سۆفی ڕەحیم و لەوێ خەوتین بۆ بەیانیەکەی پاش نان و چاخواردن لەگەڵ کەریم چووینە بەرزاییەك بۆ چاودێری کردن ، لەناکاو چوار هەلیکۆپتەر زۆر بەنزمی بەسەرماندا هاتن ئیتر نازانم نەبینراین یان خۆیان مەبەستیان نەبوو تەقەمان لێ بکەن ، پاشان چوار هەلیکۆپتەری تر هات و پاش نیوڕۆ دووبارە لەگەڵ کەریم چووینەوە بۆ چاودێری بەدووربین بینیمان لەنزیك جیگاکەی سەیدجاش و جەیش بلاوەی کردوە ، گومانمان لادروست بوو

کەسەید ئیعترافی کردبێت ، لەو کاتەشدا هەزارو حەمە کادر لەو جێگایەدابوون،( پاش چەند ڕۆژێك خۆیان گێرایانەوە کەجاش و جەیش تادەمی ئەشکەوتەکە چوون ، بەڵام نەچوونەتەناو پێچەکەوە کەدەچێتە ناو ئەشکەوتەکەوە ) تائێوارەکۆپتەر بەو ناوەیەدا هاتوچۆی دەکرد دەتگوت سیارەن و لەخەتدان ئیش دەکەن ، پێش ئاوابوون بینیمان لەزۆربەی دێهاتە ڕوو خاوەکانی دەورو بەرمان ئاگر هەڵکراوە ئەو کات زانیمان هەموو ناوچەکە تەمشیتی بۆ کراوە ، ئێمەش بێ ئومێدبووین لە مەوعیدەکەمان ، ویستمان بگەڕێینەوە (لەگەڵ ڕێکخراوی ناوشاردا مەوعید وادانرا ،ئەگەر ئەو ڕۆژەی تەمشیت بوایە ئەوە مەو عیدەکە بۆ ڕۆژی دواتر دەبوو ) کاك کوردۆ وتی ئێستا بگەڕێنەوە چۆن جارێکی ترمەوعید دابنێین ، کەریم وتی ئەی پێت نەوتوون ئەگەر تەمشیت بوو بۆ ڕۆژی دوایی کاك کوردۆ وتی نەخێر (ئەو برادەرانەی ئێمە دەچووین بۆ لایان (پ ـ م) بوون تەسلیم بوونەوە ، واتا تا ئەو کات پەیوەندیان بەڕێکخراوە وە نەکردبوو ، بۆیە ئەو حاڵەتەیان نەدەزانی ) کەریمیش تورەبوو وتی خەڵك هەیە بەزۆر خۆی بخاتە ناو ئەم ئاگرو جەیشە ، پاشان هەرسێکمان قەناعەتمان بەکاك کوردۆ کرد کاتی مەوعید نییە ، لەگەڕانەوەمان بۆ جیگاکانی خۆمان ڕیگاکەمان گۆڕی و لەجێگایەکدا ڕیگاکە دەبوو بەدوو بەشەوە یەکێکیان هەورازو ئەوەی تریان هەورازی کەمتر بوو ، کەریم لەپێشەوە بوو لە هەورازە بەرزەکەی دا کاك کوردۆ وتی کەریم ئەو ڕێگا دوور ئەکەوێتەوە و بەرزە، کەریم وتی هەر دەبێت لێرەوە بڕۆین و کەریم ئاوڕێکی دایەوەو بەتوڕەییەوە وتی : ( هەردەبێت لێرەوە بڕۆین مەوعید جوان) واتا نازانی مەوعید دابنێت بەهەر شێوەیەك بوو کەریمان ئاشتکردەوە، چونکە زۆر تورە بوو، هەرچۆنێك بێت ئەو شەوە گەڕاینەوە جێگاکانی خۆمان ،بەڵام چەند جارێك تووشی ماربووینو دوو جاریش پەلاماردراین لە مارەکانەوە .

له۸/۱۲هه‌ژارو حه‌مه کادر گه‌ڕانه‌وه لامان و باسی وه‌زعه ناخۆشه‌که‌ی خۆیان بۆ کردین که چه‌ند ترساون له‌کاتی ده‌ور دراون و ڕێك له‌سه‌ر ئه‌شکه‌وته‌که‌یان ( که ڕێگای هاتنه خواره‌وه‌ی تێدا نه‌بوو) چه‌ندین سه‌ربازو جاشی تێدا بووه ؛ له۲۰/ ۸(که‌ره‌سپی ) به‌ده‌ستی هه‌ژاره‌وه بوو بۆ به‌ستنه‌وه‌ی له‌جێگای دوور له‌خۆمان هه‌ڵهاتبوو له‌ده‌ستی و ڕای کردبوو هه‌ژاریش هاته‌وه ووتی که‌ره‌که ته‌سلیم بووه‌ته‌وه ؛ له ۲۳/ ۸ له‌گه‌ڵ که‌ریم چووین بۆ مه‌وعیدی حه‌سه‌ن ژاڵه‌یی له دێ ی سۆفی ڕه‌حیم شه‌و چووینه دێ ڕووخاوه‌که هیچی تێدا نه‌مابوو جگه له ده‌ڵه سه‌گێك و پشیله‌یه‌ك و دار گه‌زێکی ناو گونده‌که ، شه‌وێکی مانگه شه‌وی ڕووناك بوو ، که‌ریم ویستی به‌به‌رد کۆتر بکوژێ که‌له‌سه‌ر داره‌که بوون به‌ردێکی تێگرتن ، به‌ڵام سه‌رکه‌وتوو نه‌بوو ، پاش ماوه‌یه‌کی که‌م له‌هه‌ڵفڕینیان گه‌ڕانه‌وه شوێنی خۆیان منیش ووتم وازیان لێ بێنه (ئێمه بێ جێگاو شوێن کراوین، توخوا گوناحن وازیان لێ بێنه باوه‌ك ئێمه‌یان لێ نه‌یه،به‌ڵام له‌وێدا حاڵه‌تێکمان بینی هه‌رگیز جێگای باوه‌ڕ نه‌بوو ، له‌چه‌می خواره‌وه‌ی دێیه‌که گۆماوێکی بچووکی تێدا بوو ده‌نگی بۆقی لێده‌هات که‌به‌ووردی تێم ڕووانی ته‌ماشا ده‌که‌م سه‌گه‌که بۆقه‌کان ده‌گرێت و ده‌یانخوات ،پاش ماوه‌یه‌کی تریش پشیله‌یه‌کم بینی گوانی ده‌ڵێکی ده‌مژی ، زۆر سه‌رم سوڕما له‌م حاڵه‌ته ، چونکه ئه‌وه‌ی من بیستبووم که سه‌گ و پشیله دانوویان به یه‌که‌و ه ناکوڵێت ، منیش ووتم که‌ریم ئێستا کامێرایه‌ك له‌کوێ بێنین وێنه‌ی ئه‌م حاڵه‌ته بگرین بۆ ئه‌وه‌ی براده‌ران بڕوامان پێ بکه‌ن ، ئه‌و شه‌وه تانزیکه‌ی سه‌عات دوو ماینه‌وه ، به‌ڵام حه‌سه‌ن ژاڵه‌یی نه‌هات و ئێمه‌ش گه‌ڕاینه‌وه جێگاکانی خۆمان .

له۸/۲۸ڕژێم جارێکی تر ته‌مشیتی بۆ ناوچه‌که هێنایه‌وه تا ئێواره له‌سه‌لاجه‌که خۆمان حه‌شاردا جارجار چاودێریشمان ده‌کرد، ئێواره هه‌م بۆچاودێری و بۆ جیهازکردن چوومه به‌رزاییه‌ك کاك مه‌حمودی مامه عه‌زه هاته خه‌ته‌وه که ئه‌وان دوو مه‌فره‌زه بوون له‌گه‌ڵ کاك سه‌لامی کوێخا عه‌زیز پێکه‌وه تازه هاتبوونه سنوری

بەمۆ،کاك مەحمود ووتی ئەو داڵ و قەلەڕەشانە چی بوون لەدوروبەرتان، هەر بەو ئاشکرایە ( ئە وسنورە شارەزا بوو زانیاریشی لەسەر ئێمە هەبوو) منیش ووتم هیچ لەدەورو بەری ئێمە نییە،ئاگام لەهیچ نییە ئەویش وازی نەدەهێنا و ووتی چۆن زۆر وریای خۆتان بن منیش ووتم ئێمە زۆر دوورین و هیچ باسێکمان لانیە یەکسەر دەستم کرد بەپرسیارکردن بۆ ئەوەی واز لەو بابەتە بهێنێت ، پاشان ووتم کێت لایە ووتی هاپۆو د.قاسم، منیش ووتم د.قاسمم بدەرێ پاش هەواڵپرسین ووتی چەند ڕۆژێکە منالێکمان بووەبەجێم هێشتووە ووتم ناوی چیە ؟ ووتی چاوەڕوان ووتم ئەمە کەی ناوە ناوت بنایە هیوا ، شۆڕش ووتی کچە،ووتم ناوت بنایە کوردوستان واتا ئێمە لە میحنەت و ناخۆشیدا هەر هیوامان بوو ، پاشان کاك مەحمود دووبارە ووتی وریای خۆتان بن و من جیهازەکەم داخست .

لە٨/٣٠کاك کوردۆ لەکاتێکدا دەچووین بۆ پەیوەندیکردن ووتی ڕات چییە بەبەردانی (مەلابەختیار ) ئەو کات بیرکردنەوەم زۆرتوند ڕەوانە بوو ووتم وەڵڵا گوناحە ئازاد بکرێت حەقی ڕەمی کردنە ، چونکە خیانەتی گەورەی کردووە( تائەو کاتەش من بۆ خۆم زۆر شتی کەمم لەسەر ململانێ سەرکردایەتی ناو حیزب و بەتایبەتی یەکێتی دەزانی وەکو دەروێش وابووم) کاك کوردۆ ووتی زۆربەی سەرکردایەتی بڕیاری داوە لەوانەیە (مەلا بەختیار ) ئازاد بکەن ،ووتم حەتمەن سەرکردایەتی لەئێمە باشتر دەزانن.

لە٣/ ٩لەگەڵ کاك حەمە چووین بۆ هێنانی برنج و شەکر لەنزیك مەلجەکانی نزیك دێی زاوت ، چونکە لای خۆمان هیچ نەما بوو ، لە٥/ ٩لەگەڵ هەژار چووین بۆ مەوعیدی ئەحمەد مالیەو ڕەمەزان چاڵە ڕەشی لە دێ ی ڕووخاوی چاڵە ڕەش وابزانم کاك کوردۆ لەڕێگای ڕێکخراوەوە ڕێکیخستبوو بۆ ٧/ ٩پێش ئەوەی لەجادە بپەڕینەوە لەنێوان زەماوەنگە وچاڵەڕەش دا ڕانە مەرێك هاتبوونە نزیك تاوێرو بەردەکان ،ئێمەش دوورمان لێ گرتن ، چونکە ئەو ناوچەیە قەدەغە بوو لە لایەن

ڕژێمەوە بۆ هەموو کەسێك ،مەگەر ئەوانەی بۆ جاسوسی بهاتبان ، لەوێش تا درەنگە وەختێـك ماینـەوە ، بـەڵام ئـەو برادەرانـە نەهاتنـە سـەر مەوعیـد، پـاش دوو ڕۆژ گەڕاینەوە لای برادەران .

لە١٢/ ٩کاك کوردۆ ووتی لەگەڵ کەریم و حەمە کـادردا بچن بـۆ ئـەو غەرازانـەی کـە حەمـە کـادر شـاردبوویەوە ، لـەنزیك زاوت کـەریم ووتـی بەچـی بیهێـنین( ئـەو کـات گوێدرێژەکەی خۆمان تەسلیم بوویـووەوە) ووتـی کـاك مەحمودسـەنگاوی و ئەوانـەی بەڕێگاوەن هەم لەگەڵ خۆتـان بیـانهێنن هـەم گوێدرێـژیان پێیـەو غـەرازەکان بخەنـە سەری ، ئێمەش لەهەمان شەو کەو تینە ڕێ بۆ بەیانیەکـەی گەیشـتینە (قەتارەکـە) شوێنێکە هەم دۆڵەو هەم دارو ژاڵەیەکی زۆری تێدایە و هەم کونێکی بچووکی تێدایـە ، کەریم ووتی لەم کونەدا تەباغێك هەیە بابچین بیهێنین چای پیَ دروست بکەین کـە چووینە بەردەمی کونەکە گولە ئاربیجیەکی تێدا بوو ، بەڵام گوێمان لەفیشـکەی مـار بوو کەریم بـە گولەکـە تەباغەکـەی بـەرز کـردەوە مارێـك لەژێریـدا بـوو نزیکـەی نیـو مـەترێك دەبـوو تەباغەکـەمان دەرهێنـاو کـەریم گولـە ئاربیجیەکـەی خسـتە سـەری مارەکەو گرتی ، ئینجا پاش کوشتنی لێمان خوارد زۆر بەلەزەت بوو نازانم هـی ئـەوە بوو ماوەیەك گۆشتمان نەخواردبوو یاخود گۆشتی مارخۆشە ، لەگەڵ کاك مـەحمودو ئەوان سەرەڕای ئەوەی پەیوەندیمان بەیەکەوە هەبوو، بـەڵام لـەجێگای دیـاری کـراو یەکمان نەبینی سەری یـەکێك لەسـەعاتەکان ئـەوان نەهاتنـە سـەر خـەت لەسـەعات ٩ووتیـان ئێمـە گەیشـتووینەتە لای ئەشـکەوتی شـەهیدەکان ( مـەلا ئەحمـەد و هاورێکـانی ) منـیش ووتم بـۆ لـەوێن ، زۆر دزیر کەوتوونەتـەوە لێمـان ووتیـان چاوەڕوانتان دەبین بێنە لامان ئێمەش ناچار چووینە لایان ووتم کـاك مـەحمود ئێـوە لەگەڵ کەریم برۆن گوێدرێژێکیش بدەنە ئێمە دەگەڕێینەوە خـواردن دەهێـنین حەمـە ئاخـە ووتـی گوێدرێـژەکانی ئێمەپێکـەوە نـەبن ڕێ ناکـەن ، هەرچـی هـەو لمـان دا لەگەڵیان گوێدرێژەکەیان نەدا پێمـان ، کەگەڕاینـەوە لای برادەرانـی خۆمـان خـەرێك

بوو ڕۆژ دەبووەوە، چووم ڕاکشام کاك کوردۆ هات ووتی : خواردنتان هێنا ووتم نەخێر و حاڵەتەکەم بۆ باسکرد ، بەلاّم ئەو گوێی نەگرت و توڕە بوو بووبە ناخۆشیمان .

کاك حەمە پاریۆڵە چوو بوو بەشوێن چوار میوانی (مجلس الاعلی) دا کەلەلایەن بەڕێز مام جەلالەوە نێردرابوون بۆ لامان لەڕێگای کاك (سەلامی کوێخا عەزیز و مەحمودی مامەعەزە ) کە ئە و کات ئەوانیش وەکومەفرەزەی پارتی زانی هاتبوونە بناری بەمۆ بۆ ئەوەی بگەیەنرێنە ناوچەی خالص و دەوروبەری ؛ بەیانی زوو کاك حەمە پاریۆڵە لەپاش دوورخستنەوەی گوێدرێژەکانی کاك مەحمودو ئەوان زۆر بەشپرزەی ووتی خۆتان کۆکەنەوە دەورمان جەیش و جاشە ، ئێمەش کەوتینە خۆمان و زیاتر خەمی عەرەبەکانمان بوو کە هیچ شارەزایەکیان لەو ناوچەیەدا نەبوو، یەکێکیان تێدا بوو بە ( علی الحیدری ) ناسراو بوو زۆر قۆشمە بوو گاڵتەی بە عەقڵی برادەرەکانی دەهات دەربارەی بیرو باوەڕو نوێژکردنیشیان، تا سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆ بەردەوام هەلیکۆپتەر بەسەرمانەوە بوو ، بەلاّم جێگاکەی ئێمە زۆر تەنگەبەر بوو بەپیادە بهاتباینە بانی سەرمان نەدەبینراینەوە مەگەرلە دۆڵەکەوە ڕووبەڕوومان بهاتبان، لەکاتی تەمشیتەکەدا (علی الحیدری ) گاڵتەی بەبرادەرەکانی خۆی دەکردو دەیووت( هسه اروح اسلم) واتا ئێستا دەڕۆم تەسلیم دەبمەوە ، نازانم ئەو کەسەیان چۆن بۆ جێگایەکی ئاوها خەتەرناك لەگەڵ خۆیان هێنا بوو، چونکە زۆر گاڵتەی بەو حاڵەتەی ئێمەش دەهات، کە نۆرەی من هات بۆ چاودێری کردنی جەیش خەریکی سوتاندنی خانووەکەی باوکی برایمە سور بوون کە بەتەنها لە شێوێکدا دروستی کردبوو، واتا کەمتر لە٢٠٠مەترێك لیمان نزیك بوونەوە، دیاربوو پاش سووتاندنی خانووەکە زیاتر نەهاتبوونە پێشەوە ، بەلاّم سەری هەموو بەرزایەکانی دەورو بەرمان گیرابوو لەکاتی دەرکەوتنی سەربازەکان لەدەوروبەرمان تەماشای هەر برادەرێکم دەکرد تەواو ڕەش هەڵگەڕابوو هەر بەچاو یەکترمان دەخوێندەوە کە

لەوانەیە ئەم جارە دواجاری یەکتر ببینین بێت، پاش کشانەوەی هێزەکەی دوژمن کاك مەحمود لەگەڵ ئەبوئەنفال ناوێکیانە کەوتە گفتو گۆ بەلاَم کاك مەحمود عەرەبی نەدەزانی و نەئەو یش کوردی دەزانی ئیتر بەفارسی هەردووکیان یەکتریان تێ گەیاند، ئێوارە کاك کوردۆ و کاك مەحمود لەگەڵ میوانەکان ڕۆیشتن بۆ ڕێکخراوی ناو شار بیانگەیەننە خالص و دەورو بەری .

بەرواری ۹/۱۸کاك عوسمانی حاجی مەحمود لەگەڵ مە فرەزەیەکدا هاتنە لامان بۆ ئەوەی بیانگەیەنینە شاخی بەمۆ بۆ لای مەحمودوکاك سەلامی کوێخا عەزیز تاوەکو لەوێوەوە بگەڕێنەوە بۆ ئێران ، ئەو مەفرەزەیە ئەو یەکەمین جاریان بوو لەدوای ئەنفالەوە بڕۆن بۆ ئیسراحەت ، بەرواری ۱۹/ ۹ کاك حەمە پاریۆڵە و شەهاب خانەقینی و من بەڕێکەوتین لەگەڵ کاك عوسمان و ئەواندا مەوعیدمان قەبرستانەکەی بانی خانی نزیك باوەنوور بوو لەگەڵ مەفرەزەیەکی بەمۆدا،لە چەمەکەی قەلاَتۆپزان نزیك جادەی کەلار سلێمانی ڕۆژمان لێ بووەوە ناچار ئەو ڕۆژە لەو کەنەلاَنەی چەمەکەدا ماینەوە ،نیوەڕۆ کاك عوسمان ووتی: پێم باشە تۆ نەچیتە لای کاك سەلام و ئەوان لەگەڵ کاك کوردۆ و ئەوان بمێنیتەوە ،منیش ووتم ڕەنگە ئیتر پێکەوە هەڵنەکەین ، بۆ شەو چووینە جێگای مەبەست و برادەران (کاك سەلام، سدیقی عەلی توفیق، سدیقی سۆفی مەجیدو حسەینی حامی لەوێ بوون، پاش خواحافیزی لەحەمەو شەهاب لەگەڵیان بەکەڵەك لەئاوی سیروان پەڕینەوە بۆ بەمۆ ؛ بەلاَم ژیانی ئێرە یەکجار سەخت بوو کە لەداهاتوودا بەدرێژی باسی لێوە دەکەم ، چونکە هەم دێهاتەکانی ساڵی ۱۹۷۵دا ڕووخابوو هەم جەبهەیەکی سەختی شەڕی ئێران - عێراق بوو کەبە ملوێنەها مینی تێدا چێنرابوو

(۵) لەزاری پارتیزان ( مامۆستا نەجم ) ەوە وەرگیراوە

# گەڕانەوەمان بۆ گەرمیان

## ((چەند ژیان ئەیەویست خۆی بنوێنێ ئەوەندەش مەرگ ئەیەویست خۆی بسەپێنێ))

ئێمە ئێستا لە گوندی (گەروان) نین سنووری مەڵبەندی (٣) ی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان ) کە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای چیای کاروخ .

گوندێکی چۆڵ بەڵام خانووەکان کە بەدەستورێکی زۆر جوان دروستکرابوو مابوونەوە، پڕ ئاو و سەوزایی هەر بەڕاستی نیگارێکی جوانی هەبوو ، ئەگەر ئەو هەموو پەژارەیە نەبوایە قەت بێ تاقەت نەئەبووم هەموو چەشنە بەرهەمێکی لێیە لە میوە . ئێمە لەسەر چیاکەی نزیک دێ کە رەبیەیەکمان هەبوو بۆ چاودێری ، بەرانبەرمان رەبیەکانی رژێم دیارە و نێوانمان زۆر نییە .

ماوەیەکە لەم گوندە ئاراممان گرتووە ، پاش هیلاکی زۆر و ریگایەکی دوور و درێژ ، پڕ لە کارەسات ، هەر لەم ماوەیەدا لە چاوەڕوانیداین ، فەرمانی گەڕانەوەمان پێ بگات بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ گەرمیان .. چوون رقی تۆڵە لە دەروونماندا پەنگی خواردوەتەوە .

پاش نانی نیوەڕۆ هەر بۆ بێ تاقەتی کلاشینکۆفەکەم هەڵگرتوو بەچیاکەدا هەڵکشام لە سەر تەختە تاوێرێك کە ئەیڕوانییە ناوچەکە ئاسمانێکی پاك و خاوێن .. وڵاتێ تابلێی دڵڕفێن پڕ لە نیگاری جوان . باڵندەیەك بەو لامەوە بەپەلە خۆی ئەکردە هێلانەکەیدا ، و پاشان دەر ئەچوو ، هەموو جارێك نێچری بچووکی ئەبردە هێلانەکەوە دیارەبچکۆلەکانی تێر ئەکا .

ئێوە گوێتان لە دەنگی حیلەی ئەسپە کە خۆی ڕائەوەشێنێ بۆی هەڵبەزو دابەز ئەکا .. ئەو حیلە نەعرەتەو هەڕەشەیە ، ئێمە لەزووەوە چاوەڕێن ، لەیادی ئەو

ولآته  وێرانه له دەروونما جۆشاو چەقۆ كولی نێو برینەكان بزاوه بیّ ئـەوەی ئاگـاداری هەسـت ونەسـتی خـۆم بم پـەلاماری كلاشـینكۆفەكەم دا ..بـەلاّم لـەكاتی جولآنـدا هاتمەوه هۆش خۆزگە  فەرمانی گەڕانەوەمان ئەمڕۆ و ئێستا ئەهات .

لەم بارەگایەدا هەموومان گەرمیانیین دڵمان لای ئەو برادەرانەیە ئێستا لەگـەرمیانن و ڕوو بەڕووی ئەو هەموو بەر بەرەكانییە ئەبنـەوە، هـەر ئـەوان وایـان لەسـەركردایەتی كردووه بیر له بەردەوامی شۆڕش و بەربەرەكانی بكەنەوه لەوێـدا پێشـمەرگە بتـوانیّ بەر بەرەكانی بكـات . لـەو هـەردوو و پـیّ دەشـتەدا ڕوو بـەڕووی درنـدەترین دوژمـن بوەستیّ و وجودی خـۆی بسـەپێنیّ بـه دوژمـن بلـیّ ئێمـه مـاوین و نـەمردووین هـەر ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی له هەموو شوێنی بە دوژمن بیسـەلمێنن كـە ئێمـە مـاوین و پرۆژەش دانریّ بۆ سەلماندنی ئەو بەربەرەكانییە .

ئەو هەوالآنەی پێمان ئەگات هەمووی جەرگ بڕن ، هـەمووی هەوڵـە بـۆ لـەناوبردنی میللەتەكەمان ، هەرلەم ڕۆژانەدا  جەنگی عێراق ئێران وەسـتا .ئەمـەیان گەریگـەری خۆی هەبوو ئەگەر بە وردی بیری لێبكرێتەوه ئەگەرچی من ئەو كاتـە ئەوەنـدە بـیرم لیّ نەكردەوە.

لەنزیك  بارەگادا گوێم له دەنگە دەنگ و قاڵـە قـاڵ و جەنجاڵیـەك بـوو، هەسـت بـە خۆشی دەكرا . هەر له دوورەوە هاتنە پیریمەوه وتیان لـە كوێیـت ؟ كۆڵەپشـتەكەت ئامادەكە..... تولەڕێی هات و نەهات بگرە هەموو ڕۆژیّ شەڕمان پیّ ئەفرۆشی ئـەوه عەرز و ئەوەگەز .

– چی ئـەڵێن ئـەوه بەڕاسـتانە ؟ باوەشمـان بەیەكـدا كـردو بـەدڵێكی زۆر خۆشـەوه پیرۆزبایمان لەیەكتر دەكرد .

پاش ئەوەی هەندیّ گفتوگۆكرا ..چی بكریّ و چی نـەكریّ ، پلانمـان چـی بێـت بـۆ گەڕانەوەمان  پاشان هەریەكە خۆی ئامـادەكرد . لەوێـدا ئەوەشـیان پـیّ وتـین . كـە كاك ئازادی سەگرمە و مام ڕۆستم له سما قولی چاوەڕوانمان ئـەبن ، وئێمـەش ئـەبیّ

بەرێکەوین بۆ لای ئەوان ... لەو کۆمەڵە (پ.م) ە (٢٨–٣٠) کەس خۆمان ئامادەکرد بۆ گەڕانەوە . چەکەکانمان کلاشینکۆف ، هەریەکەو بەشە تەقەمەنی پێویستمان هەڵگرت بۆ ڕووبەڕووبوونەوە، هەروەها پابەندنمان بەڕێنماییەکان (کە هەوڵدەین لە روو بەڕووبوونەوە) دوور بکەینەوە و خۆمان لەو شتە گەورانە بپارێزین .

زۆرم بیر لە وڵات ئەکردەوە ، بیر لە ڕووبەڕووبوونەوە...تد هەمیشە لەبیرکردنەوە هیلاك دەبووم پاش ئەوەی خەوم لێ کەوت بەبەیانییەکەیدا بەشاخی بیموردا سەرکەوتین.

چوینە خوارەوە بۆ ئاوایی (تارینا) وقاعیدەی گاردەکانمان بینی زۆر لامان گرنگ بوو بە ناو ڕەزێکی زۆر جواندا ڕۆیشتین وتیان :کەس تریّ نەخوا کیمیایی پیوەیە بە شاخی (بانخەتیّ)دا سەرکەوتین کە لە سەرەوەی کانییەکی جوان هەبوو ·کە ڕۆیشتینە خوارەوەلە (توتمیّ) بووینە میوانی بارەگایەك هیشتا ڕوخساری ·ژیانی ئاسایی مابوو تەلەفزیۆن ئیشی ئەکرد کە ئێمە لەویّ بووین دوو عەرەبانەو تراکتۆر پڕ لە گوولە( ئار· پی· چی ) گەیشتە ئەو بارەگایە و گەورەکەیان وتی :ئەمشەو لە دوور ڕایگرن ئەگەر نەتەقییەو سبەینیّ دابەشی کەن بە سەر هێزەکاندا کە پرسیمان وتیان موستەشارێك ناردویەتی ئەمەش ئەوەندەی تر جیاوازی عەقڵی لای ئێمەو ئێوەی زەق ئەکردەوە کۆبونەوەیەکیان پیّ کردین زیاتر لە گاڵتە پیّ کردن ئەچوو بەوەی ئەم هێزە بتوانیّ لەو قۆناغەدا سەرکەوتوو بیّ ·

ئێمەیان سپارد بە یەکیّ و ئەویش برایەکی خۆی لە گەڵا ناردین و کەوتینە ڕیّ و لە (توتمیّ)ەو بۆ (چێوە) دوای ئەوەش بە شاخی (هەوریّ)دا سەرکەوتین و چووینە (کونە فلسیّ )و لەوێشەوە بۆ (هیران) دێیەکی زۆر جوان بوو ماڵەکانیان لە ناو دارەکاندا بە حاڵ دیار بوو لە یەکێك لە بارەگاکانی ئەوێدا خەوتین ·

ڕۆژی دواتر بە شاخەکەی سەر نازەنیندا سەر کەوتین و چوینە (سماقولی سەروچاوە) دواتریش (سماقولی گرتك) لێرە گۆشتیان داینیّ ·

١٧ /٨ له سماقولییه‌وه كه‌وتینه ڕێ خۆر له زه‌رده گه‌یشتینه سه‌ر ئه‌و كه‌له‌ی كه ئه‌یروانی به سه‌ر جاده‌ی كۆیه _هه‌ولێردا هه‌تا دنیا ڕووناك بوو به دووربین چاودێری ڕێگه‌كه‌یان كرد بۆ سه‌لامه‌تی په‌ڕینه‌وه كه تاریك داهات شوڕبوینه‌وه‌و به ناو ئاواییه‌كدا ئه‌ڕۆیشتین ڕوخێنرا بوو، یه‌كپارچه بنه ژاڵه بوو نزیكه‌ی (١٠)ولاخی به‌رزه بار كرا بوو له ته‌قه‌مه‌نی كه گه‌یشتینه سه‌ر جاده قیره‌كه یه‌كێك له ولاخه‌كانمان په‌كی كه‌وت و هه‌رچیمان كرد ڕاست نه‌بوه‌وه، به ناچاری باره‌كه‌ی دابه‌شكرا به‌سه‌ر ئه‌وانی تردا ، و تا ڕاده‌یه‌ك له ته‌نگانه‌دا بووین گیان به‌وه بوو دوژمن له‌و كاته‌دا نه‌هات ٠كه ماوه‌یه‌ك دوور كه‌وتینه‌و له‌و شوێنه یه‌كیكمان گه‌ڕایه‌وه بۆ ئه‌و جانتا بچووكه‌ی كه لێی جێمابوو ڕه‌بیه‌كه‌ش زۆر نزیك بوو لێمانه‌وه سه‌گه‌كانیان به گه‌رمی پێمان ئه‌وه‌ڕین چه‌ند ته‌قه‌یه‌كیان كرد تومه‌ز هاوڕێكه‌مان لایتی لێ دابوو ٠

كه ڕۆژ بووه‌وه له شوێنێكدا ماینه‌وه تا ئێواره زۆر نه‌گونجاو بوو چاریش نه‌بوو هه‌ر چۆنێ بوو گوزه‌را .گیان به‌وه بوو نه كۆپته‌ر هاتوو نه هیزیش ده‌ر چوو ده‌نا تیا چونمان زۆر مسۆگه‌ر بوو، ڕۆژێكی زۆر ناخۆش بوو هیچ زانیارییه‌كمان ده‌رباره‌ی ئه‌و ناوچه‌یه له لا نه‌بوو ولاتێكی چۆڵو هۆڵ ته‌نانه‌ت چۆله‌كه‌یه‌كیشی تیا نه‌بوو ٠

٨|١٨

خۆری مابوو گه‌یشتینه سه‌ر زێ له ئاستی ئاوایی (په‌ڵكانه) نزیك به‌م شوێنه چه‌ند كه‌سێكمان بینی كه چاویان پێمان كه‌وت ڕایان كرد وایان زانی ئێمه جاشین له سه‌ر زێكه‌ش چه‌ند كه‌سێكمان بینی له ئیشی كشتوكاڵه‌وه ئه‌هاتن زۆرمان لا سه‌یر بوو، به به‌له‌م په‌ڕیمانه‌وه له ناو ئاوه‌كه‌دا به‌له‌مه‌وانه‌كه كه ئه‌ویش جێ متمانه‌ی ده‌لیله‌كانمان بوو ده‌ستی كرد به حه‌یران چڕین خه‌ریك بوو له ئاستی بواره‌كه تێپه‌ڕین باش بوو هه‌ر چۆنێ بوو گرتییه‌وه و هه‌موومانی به چه‌ند جارێ په‌ڕانده‌وه ته‌نها( كه‌ر)ه‌كه‌مان نه‌بێ وتی : ئه‌ویش به‌یانی ٠كه په‌ڕیمانه‌وه‌و گه‌یشتینه لای ئه‌م

هاوڕێ تازانە هەستمان بە خۆشییەکی زۆر کرد وتیان بەیانی تەماتەوبامێی زۆر مان هەیە شلەو برنجتان بۆ ئەکەین ئەو قسەیە بۆ ئەو کاتە زۆر زۆر خۆش بوو ماوەیەك بوو لەگەڵ شلە و برنجدا لەیەك دابڕابوین . بەیانی زوو دەورە دراین و ئەوەندە لێمان نزیك بوونەوە بەسەر لێوی زێکە وەبووین لەناو تۆقە قامیشێکدا تاکو پاش نیوەڕۆ نەمانتوانی قومێ ئاو بخۆینەوە تاکو پێشمەرگەیەك وتی: کێ مەتارەی باغەی پێیە بمداتێ و بەستیە قامیشێکەو هەر لەجێگەی خۆیەوە شۆڕی کردەوە بۆناو زێکەو هەمومانی تێر ئاوکرد. هەمان ئەو کەسە بوو کە لە کانی خاکی ئاوەکەی بۆ هێناین ئەمە سەرەتای دەسپێکردنی سەختییەکانی خەباتی ئەم قۆناغە تازەیە بوو. بۆ ئەم کۆمەڵە کە ئەیانەوێ بچنە ناو ئەو ژیانەوە ،کە لەمەو پێش تاقی نەکراوەتەوە بەم شێوە تازەیەیە . چەند ساتێك بوو چەند ژیان ئەیەویست خۆی بنوێنێ ئەوەندەش مەرگ ئەیەویست بە زۆر خۆی بسەپێنێ ئەو کاتانە بوو کات لە خەیاڵماندا ڕاوەستاو ئەبینرا و تەم لە کۆڵ نەئەبوەوە .کە درەنگێ دوژمن کشایەوە وەکو ئەوە وا بوو جارێکی تر پێمان بوترێ ئەم جارەش بە قەرز ژیانتان ئەدەینەوە بەڵام ئەبێ پێی بزانن و لە بیریشتان نەچێ ئیتر ئێوە لە دنیایەکی تردان زۆر جیاوازە لەوەی پێشوو ئەگەر ئاگاتان لە خۆتان نەبێ لە چاو تروکانێکدا لە دەستان ئەچێ بە ڕۆیشتنی ئەوان هەستمان بە لاچوونی بارێکی زۆر قورس ئەکرد لە سەرمان .

دەمەو خۆرئاوا کەوتینە ڕێ بە ناو (حاجی جەرجیس)و(دەرماناوا)و(پەڵکانە)دا تێپەڕین و کە گەیشتینە سەر جادە قیرەکەی( شوان)ئەو کەسەی کە ناوی بۆ هەڵگۆزاین لە سەر زێکە ڕۆیشتبوو بۆ تاقیکردنەوەی سەر جادە کاتێ ئێمە گەیشتینە سەر جادە خەریك بوو بیکوژین لێمان گۆڕا. کەمێ دوای پەڕینەو ئەوەندەمان زانی ئەوانەی پێشەوە چنگ لە سەر شان یەکێکیان لەو لاوە هێنا لامانا دایان بە زەویدا و یەکسەر دەستیان نایە سەر دەمیا و بووە نیخە نیخ هەرکە

دەستیان لە سەر دەمی لائەدا پڕبە دەم هاواری ئەکرد (هۆ باوە هۆو) کاتێ دەلیلەکان هاتن ناسییانەوە وتیان ئەمە شێتە خەمتان نەبێ بەرەلای کەن ئەوان چاکیان ئەناسی هەتا ماوەیەکی زۆر بەتەنها لەو ولاتە چوڵەدا بوو دواتر وەکو بیستمان ڕژێم کوشتی ٠

ماوەیەکی زۆر لای ئەم برادەرانە ماینە چەند بلێی کاتەکە ناسك بوو ڕژێم هەموو کارتێکی بەکار ئەهێنا بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە مابونەوە و ناوە ناوەیش خیانەت ئەکرا کەچی ئەمانە هەموو شوێنەکانی خۆیان نیشانی ئێمە دا نابێ ئەوە بۆ ئەو ڕۆژگارە بە کەم بزانین و چاکەیان لە بیر کەین بۆ ئەو ڕۆژگارە خواردن مەسەلەیەکی زۆر گرنگ بوو ئەوانیش خواردنیان زۆر کەم بوو ئەوەیش هەبوو ئێمە بووینە شەریکە بەشیان هەر ماوەیەك ئەمانیان برد بۆ شوێنێکی تازە یان ڕۆژێکیان لە شوێنێکەوە ئەیانبردین بۆ شوێنێکی تر و وتیان بە یارمەتیتان تۆزێ ئیشمان هەیە لێرەدا بوەستن کەمێ درەنگ هاتنەوە گەر چی زۆریش دوا نەکەوتن بەلام ئێمە هەتا بلێی دڵە کوتێمان بۆ هات کە هاتنەوە زۆر بە قوڵی و لە ناخەوە هەناسەی ئارام بونەوەمان هەڵکێشا ٠بۆ بەیانییەکەی لە قۆڵی تەکیەوە دوژمن بەرەو لامان هات بەلام باش بوو بە دییان نەکردین تەواو نزیك بووینەوە لە جادەو لە خوار (باوە فەتیی)یەوە ماینەوە و هەر بەیانی زوو جاشەکان تەواو تەکیان لێمان هەڵچنی و خۆمان سازدا بۆ شەڕو دەستە دەستە بووینەوە تاکو دوای نیوە ڕۆ مانەوە باش بوو لەو حەدە زیاتر نەهاتن. هەر خەریکی کوشتنی کەروێشکی ئەو خەڵکە قوڕبەسەرە بوون، درەنگانێ کە ملیان شکاند ئێمەیش وردە وردە بەرەو جادەی چەمچەماڵ جولاین و لە خوار (تەکیە)وە دامان لە جادەو کەمێ ڕێمان کرد من وا بۆی چوم کەمێ خوارترمان گرتبێ و بەقسەیان کردم ڕومان کردە سەرو تر و وایش بوو ئیتر کەوتینە سەر ئەو ڕێیە کە خۆمان مەبەسمان بوو. ئەو شەوە تا بەیانی ڕێمان کرد٠

٨/٣١ دنیا ڕۆشن بووبووەوە کە گەیشتینە (خاڵدان )هەر چوار لای ئاواییەکە گەڕاین شوێنێ وامان دەس نەکەوت بە دڵمان بێ بە ناچاری سەروی ئاوایمان هەڵبژارد و وتیان ڕەبیەکە بە سەر سەرمانەوەیە نابێ تا ئێوارە کەس لە شوێنی خۆی بجوڵێ و خۆی دەرخا ئیتر هەر کەسەو شوێنێکی بۆ خۆی هەڵبژارد زۆربەمان لەناو ژاڵە دا خۆمان شاردەوە من لە ناو بنجەژاڵەیەکدا تاکو خور لە زەردە دەرنەچووم بێ نان و بێئاو و بێچایی وبێ ئاودەسکردن. ئەوەی لای ئێمەجێی سەرسوڕمان بوو ئەوە بوو کاتێ لە ئەنفالەکەدا ئەم ناوەمان جێ هێشت دنیا قوڕو قوڕاو بوو کەچی ئێستە خۆڵی جادەکان ئەڵێی کلە و زۆر جوان داریشە کە ماوەیەکی زۆر کەم پێش ئێمە سەیارە تێپەڕیوە و ئێمەیش هیچ زانیارییەکمان دەربارەی ناوچەکە لا نییە ،و کە هاوڕێکانمان لە سەر جادەکە خواحافیزییان لێ کردین وتیان لەو بەر جادە دەلیلیان ناردوە بە جیهازەوە چاوەڕوانتان ئەکەن . بەوە زۆر دڵمان خۆش بوو تومەز ئەمانە هەمووی هەر خەیاڵە و هیچی وانییە ولەگشتی ترسناکتر ئەوە بوو چەند ڕۆژێکی کەم پێش گەیشتنمان بەو شوێنە دوژمن کێوماڵێکی زۆر وردی کردبوو ماوەیەکیش مابووەوە خۆمان و بەختمان کە زووتر نەهاتین نزیك خۆر ئاوا لە شوێنەکانمان هاتینە دەرەوە و هەمومان توشی سەرئێشە هاتبووین و هەبوو ئەرشایەوە بە گشتیی خراپ بووین. خواردنیشمان پێ نەمابوو ،چەند کەسێکمان زیاتر بەرەو سەرەوە هەڵکشابوون کەوتبون بە سەر باخێکدا کە یەکمان گرتەوە قۆخ و هەنجیریان بۆمان هێنا بوو ئەگەر لە بیرم مابێ ئەویش هەمان کەس هێنای کە ئاوەکەی هەڵکیشا کە یەکەم قەپمان دا لە و قۆخە ڕەنگە درۆ نەبێ بڵێم تامەکەی گەیشتە هەموو گیانم و تا ئەمرۆ ویڵم بە دوای قۆخێکدا ئەو تامەی هەبێ هێشتا دەسگیرم نەبووە ئیتر نازانم من نەخۆش بووم و نەخۆش هەمیشە حەزی لە ترشی و مزرییە یان جەستەمان خواردنی پێویستی تیا نەما بوو، یان خۆی هەر وا خۆش بوو. ماویەك لە خاڵدان دور کەوتینەوە یەکێکمان وتی (ئیستە سەحانێ

نانەوڵەکــەی داوێــت لــە بــەردەما نــەویێ) کــە وای وت خــەریك بــوو گشــتمان دەسکەینەگریان ئیتر نازانم مەسەلەکە بیرکردنی گەرمیان و ئەو خەڵکە باشە بوو یان یادی ئەو خەڵکە ئازایەی داویێ بوو یان هەر بیری نانەوڵەکە بوو یـان هـەر زۆر برسـی خواردنی تر بووین و ئەوەندە ناوساجیمان خواردبوو تەواو بێزار بووبووین یا نەخۆش بووین .یان بیری ئەو ڕۆژگارە زیرینەمان ئەکرد کە لە دەستمان چووبوو بەزەیمان بە خۆماندا ئەهاتەوە زۆرمان نەمابوو بگەینە (ئاوەکەی باسەڕە)خەریك بوو بچینە نـاو ڕەبیەکەوە باش بوو سەگەکانیان وەڕین و گەڕاینەوە .بیرمان لەوە ئەکردەوە جـاری پێشو کە دامان لە باسەڕە لە گەڵ ئێستە زۆر جیاواز بوو، ئاوەکە زۆر کەمی کردبـوو کە پەریمانەوە یەکێکمان وتی (ئیتر خەمتان نەبێ لەمـەو لا مـن شـارەزام ئـەوە وەك هـەواڵێکی زۆر گـرنگ وا بـوو بـەردەوام هـەر ڕێمـان کـرد، بـە خـواری (سـەنگاو)دا تێپەڕبووین و لە جادەکە دوا کەس پەڕیمەوە ٠

١٩٨٨/٩/١تـەنها هـەنگاوێ دوور لـە قیرەکـە بـەردێکی سـپیم بەرچاو کـەوت بـێ ئەوەی کـەس ئاگـای لـێم بـێ نوشـتامەوە و زۆر تامەزرۆیانـە ئـەو بـەردەم مـاچ کـرد چـونکە ئـاواتم خواسـتبوو جـارێکی تـر ئەگـەر بگەڕمـەوە گـەرمیان یەکـەم شـوێنێ سەرەتای یەکەم بستی گەرمیان بێ تێرتێر ماچی کەم نایشـارمەوە لەگەلیشـیدا زۆر گریام ٠لای خواری (کرپچنە) مان گرت و خەریك بـوو لـە ئاسـتی ( ژاڵـەی ڕەوات) لـە جادەی سەنگاو _هەزارکانی بپەڕینەوە سەرمان تەقی بـە ڕەبیەیەکدا زۆری نـەمابوو بچـینە ناویـەوە بـە بـڕوای هـەمومان زانیـان بـەڵام خۆیـان دەنگیـان نـەکرد ئـیتر گەڕاینەوە بۆ ناو ژاڵە و لە نـاو کەلاوەکانیـدا یـە ێکمان کـەمێ بـرنج و کـەمێ ئـاردی دۆزییەوە ئەوە بۆ ئـەو ئـان و سـاتە زۆر بایەخـدار بـوو بـە بـەرد کەروێشـکێکیانیش کوشت و سەریان بڕی بەرەو دەربەنەکەی بنارەکە بوینەوە بـە دەم ڕێـوە یـەکێکمان یەك دوو بنجە تەماتەی دۆزییەوە و چەند تەماتەیەکی لێکردەوە و لەسـەر حەوزەکـە لەسـەر پارچـە نایلۆنێـك کـە پێشـتر دۆزیبومانـەوە ئاردەکـەمان کـردە هـەویرو

کەروێشکەکەمان پاك کرد بێ ئەوەی خەمی سڕینەوەی شوێنەوارەکەی بخۆین و لە بیرم نەماوە لە دەربەنەکە خەوتین یان نا دەمەو بەیان بە ساج هەویرە بێخوێکەمان کردە نانی ساجی و برنجەکە یشمان بە بێ ڕۆن و بە بێ خوێ کردە چێشت و کەروێشکەکەیشمان بە تەماتەکەو وا بزانم تۆزیکی زۆر کەم ترشەوە کردە شلەکەی لەوەدا بوو دەسکەینە نان خواردن حەرەسەکە وتی دوو زەلام کەرێکیان پێیەو بەرەو ژوور هاتن وتی: ئەرەوەلاّ هاتنە سەر حەوزەکە و وا بزانم سەیری شوێنەواری هەویر شێلان و کەروێشك پاك کردنەکە ئەکەن. ئەوجا زانیمان ئەوە یەکەم هەڵەمان کردووە، پاش کەمێ تر وتی وردە وردە بە شوین پێکەماندا هاتن ئەوەندەی نەبرد وتی: ئەرەوەلاّ گەیشتنە لامان .تەواو شپرزە بووین، بەلاّم بە هیچ نرخێ دەسبەرداری چێشتەکە نەبووین و هەرچیمان هەبوو هەڵمان گرت و ڕۆیشتین بۆ پتەوی دەربەنەکە ،و بلاّوەمان کردو هەر یەکەمان ڕۆیشتە بن دارێ و لەو کاتەدا یەك دوانیکمان بوو بە شەڕیان، زۆر چاوەڕوان بووین دەرنەکەوتن جارێ تر گرد بوینەوە ونانی خۆمان خوارد ٠

که خۆرئاوا بو لە ژێر پردەکەی نیوان هەزارکانی و کیلە بەرزەوە بەرەو خوار بووینەوە بە بێ جیهازو بە بێ زانیاری ٠ ئەوەی ئەو کاتە زۆر ئێشی پێ گەیاندم و ئێستەیش هەر لە بیرم نەچووە ئەوە بوو کە دامان بە لای (دەرەوار)دا وتیان بیگەیەنن کەس جگەرە نەکێشێ و کەس دەنگ بەرز نەکاتەوە ئێرەبارەگای فەوجی تیایە هەر کاتێ ئەکەوێتەوە بیرم ئێشی ئەو کاتەم پێئەگەیەنێ بیرمان کردەو بەم شەوە تاریکەیش ئەبێ بەو پەڕی وریاییەوە لێرەوە تێپەڕین ڕۆژی خۆی بە خەویش دوژمن نەیئەتوانی ئێرە گلاّو کا ئیتر مردن چۆنە ٠ گەیشتینە (کونە شێر) ی لای خۆری بەیانی (مەسۆیی بەرگەچ)کە دۆڵێکی تا ڕادەیەك قایم بو چەند ژێر کاچ و ژێر بەردێ وای هەبوو بۆ ئەو ڕۆژەی ئێمە زۆر گرنگ بوو. ئەو شوێنە چەند فەرشێکی جوانی تیا قایم کرا بوو بە ئومێدی ئەوەی دوژمن دەستی پێ نەگا یەکسەر فەرشە

جوانەکانی خۆمانم هاتە بەرچاوی خەیاڵ کە هی تۆماڵیمان بوو خێزانەکەم خۆی دروستی کردبوو هێشتا زۆر تازە بوون لە گەڵ هەموو ماڵەکەدا بە جێما بێ ئەوەی وەکو ئەڵێن کەوچکە چاییەکی لێدەر کەم ، کە کاتێ لە گەڵ هێزەکەدا هاتینە(قولیجان)پێشمەرگەکان هەمویان ڕژابوونە ئەوێ هەر یەکەو پێویستییەکی بۆ ڕێ لێ هەڵئەگرت خۆشم هەر سەیرم ئەکرد و خۆم لێیان تێنەگەیاند و ئەوانیش نەیانئەزانی ماڵی منە، تەنها یەکێکیان زانی و تورڕ بوو لێیان وتی : ئەوە بۆ وا ئەکەن نازانن ئەوە خاوەنەکەیەتی ٠

ورده ورده خەیاڵ ئەڕۆیی بۆ دوور تر و بۆ لای خەمی گەورەی نەمانی ئەو هەموو خزم و کەس و کارە ٠ ڕەنگە هەموویشمان لەو کاتەدا وەك یەك نەبووبین ٠ بەلأم بۆ من زۆر جیاواز بوو، چونکە ئەو فەرشانە هی هەر ماڵێك بوایە هەمووی هەر ناسیاو و خانەخوێ بوون ٠خەڵکی ئەم ئاواییە خەڵکێکی زۆر باش بوون خانوو بەرەی ئەم ئاواییە لە هی زۆربەی شوێنەکانی تر جوانتر بوو زۆریان دووقات بوو زۆریش وەستایانە دروست کرابوون بە مەرجێ لە زۆربەی ئاواییەکانی کەمئاو تر بوون٠

لە سەرپێشنیاری من ، دوو مە فرەزە جیا کرایەوە یەکێکیان بەرەو ( کەڵۆزلوغمان )ئەوی تریشیان بەرەو (چەمیلەکان)و (کوردەمیری حاجی حسەین)و بە یەکگەیشتنیشمان سەر کانییەکەی (قولیجانی سەرحەد)بێ ٠ من و دوو هاوڕێکەم هەر بەدۆلا شۆڕ بووینەوە چووینە سەر (چەمی مامران)ئەوەی لەوچەمەدا لامان سەیر بو شوین پۆستاڵ و کەپری بچووك بچوکی زۆر سادە بوو یەکسەر حاڵی بووین دوژمن ئەو شوێنە گەڕاوە. بەلأم نەمانئەزانی کەی و چۆن؟

لە چەمی مامران سەرکەوتین و ڕۆیشتینە (کەڵۆزلوغمان)و یەکسەر بۆ ماڵی (لالە حەمۆمین)کە خانە خێی هەمیشەیم بوون وکاریگەری ڕۆژی خوا حافیزیەکەم لە گیانا هەر مابوو کە تەماشام کرد (جێزێ)ك گەنمی زەرد دانراوە بە بێ خاوەن هەتا توانیم گریام ئیستە بیر ئەکەمەوە هەندێ قسەم ئەکرد لەوە ئەچێ لەو کاتەدا

جەڵەوی هۆشم لە دەس دابێ لە گەڵ ئەوەیشدا کە ئەمزانی نەک ئەم ئاواییە بەڵکو سەراپای وڵات چۆڵ وهۆڵە کەچی بانگم ئەکرد (هۆ خاوەن ماڵ کێ لە ماڵە )سەرەتا وام ئەزانی هەر خۆمم دوایی بیرم کردەوە دوو هاوڕێشم لە گەڵایە گەرچی لەوەو پیش زۆر شەرمم ئەکرد لای خەڵکاو بە دەنگی بەرز بگریم هەردوو هاوڕێکەم کە بۆیان دەرکەوت حاڵی من لە چیدایە وتیان: با بڕۆین بە ڕۆحێکی تەواو برینداروەوە ئەوێمان بەجێ هێشت هەرکە لە ملەی ئاوایی سەرکەوتین تەماشامان کرد بە ڕێکەی (کوردەمیری حاجی حسەین)دا چەند کەسێ چەند کەرێکیان پێیە و بە ڕێکەی قولیجاندا بەرەو خوار ئەبنەوە ئەوە وەک ئەوە وا بوو خوا لە ئاسمانەوە بۆ ئێمەی ناردبێ چونکە ئیتر ئەمان ئەبوونە کلیلی کردنەوەی دەروازەی ئاواتمان و بە مەراز گەیشتنمان .

هەردوو هاوڕێکەم بە ڕاکردن بەرەو لایان ڕۆیشتن و منیش کەمێ لەسەر خۆ بە قەناعەتی خۆم ئیتر من سەری گڵۆڵە بەنەکەم دەس کەوتووە هیچ پەلە کردنی ناوێ هەتا من گەیشتم سەنگەریان لە یەک گرتبوو هەم یەکتریان نەئەناسی و نە لە یەکتریش حاڵی ئەبوون من ئەوانم ناسی و ئەوانیش منیان ناسی گەیشتینە یەک ئێمە ئەوپەڕ خۆشیمان بوو ئەوانیش کەمێ لێمان دوودڵ بوون . چونکە بە هۆی گاڵتە کردنەوە چەند کەسێ لەو کاتەدا دووره پەرێزییان گرتبوو لە هێزەکان ئەمانیش وا دیار بوو زۆریان لا گرنگ بوو، بزانن ئێمەش وەک ئەوانین یانا کە تەماشامان کرد مانگایەکیان سەربڕیوەو خستویانەتە ناو هەگبەیەکەوەو بە سەر یەکێ لە کەرەکانەوەیە بردمانیانە خوارەوە بۆ تەنگە تاوێرەکەی سەر (چەمی لاهێز) بەرانبەر دزە ڕێکەی نیوان قولیجان و کەلۆزلوغمان ئەوێیان کردبووە حەشارگە کۆمەڵێ بوون بۆ ئێمە هەموویان هەر جوان بوو زۆر خوشەویست بوون وا ئەهاتنە پێش چاومان کە لە ئێمە زۆر گرنگترن

·جگـەری مانگاکـەیان برژانـدو کـەمێکمان لێـی خـوارد و تێمـان تـەقان بـۆ سـەر کانییەکەی قولیجان ئەو کانییە کە بۆ یەکەمین جار لە تەمەنمدا یەکـەمین تینـوێتی شـکاندم جگـە لـە بـاوك و بـاپیرم کـە ئـەوانیش بـە هـەمان شـێوە هـەر لـە دوورەوە کەسەکەی سەر زێ کە مەتارەکەی پڕکرد وتی هەرچەند باسـی خۆشـی و شـیرینی و سازگاری ئەم ئاوەت کرد وا دەرچوو پرسیم دەنگوباسـتان وتیـان هـیچ وتیـان ئـەی ئێوە وتمان هەواڵی خوشمـان پێیـە ئـیتر بـە خـەیاڵ بیهێنـە پـێش چـاو ئـەبێ چۆن خۆشییەك دروست بووبێ هەمومان بۆ گێرانەوە دوای ئەو خۆشحاڵییە کەمێ گلەییان کرد بۆچی لەو هەموو گۆشتە کەمێکمان بۆ ئەوان نـەهێنا بـوو هەقیشـیان بـوو ئێمـە هەم لە خۆشی پەیداکردنی هەواڵی ئەوانەی کە هاتووین بۆ لایـان و هـەم ئەقڵیشـمان پێی نەشکا ئەوان چایی خۆیان خواردبوەوە ئێمـەیش چـایمان خـواردەوەو کەوتینـە ڕێ و هەر لە (ملەی قەورسانەکە)سەرمان بردە بان و ئاوایی دەرکەوت گریـانێکی زۆر بە کوڵ سەری لێ دام هەر ئەوە نەبوو گیانم دەرچێ ڕەنگە زۆر ڕاست بکـەم کـە ئـەو کات و ساتە پڕ بە دڵ حەزم کردبێ گیانم دەرچـێ بـەڵام وەکـو پێشـینان فەرمویانـە گیان لە شوێنێ سەختایە و بە ئاسانی دەرناچێ دەنا هەق بوو زۆر هـەق بـوو گیـانم دەرچووایە تا توند تر ئەگریام ڕۆحم زیاتر مەستی گریان ئەبو پێی خۆش بـوو زیـاتر بگریم وا هەستم ئەکرد تا توند تر بگریم ڕۆحم زووتـر ئەگاتـە ئـەو مەملەکەتـەی کـە ئازیزانی لێیە مەلی خەیاڵ وەکو گـورگی بەچـکە خـوراو بـە وینـەی بروسـکە ئەگـەڕاو سەری ئەکرد بە گشت شوێنەوارێکی خاڵی یادگارییەکانا تەنها لەحزەیەك ئـارامی نـە ئەگرت کاتێ چوومە سەر شوێنەواری کەلاوەی ڕووخـاوی ماڵەکـەم دۆزەخـی دەروون ئەوەندەی تر ئاوی سەند و لای خۆم بە ئاشکرا هەستم بە قرچەی ناخم ئەکرد بۆسـۆ و بۆکروزی ناسۆری لێ هەڵئەستا و واشم ئەبینی هاوڕێکانم زۆر ئاگایان لـەو دنیایـەی من نەبێ،لەم خانوەدا خۆم و خێزانەکەم و سێ کچەکەم ژیانێکی زۆر ساکارانە بـەڵام ئاسودە ئەژیاین و نەك خۆیشمان بـە عەیبـدار نەئـەزانی کـە خـاوەنی هـیچ سـامانێك

نـەبووین و هەرچـیمان هـەبوو مـاڵی بـاوکم بۆیـان ئـەناردین وەکـو ئـەڵێن هـەتا شقارتەکەیش کە خۆیان حەزیان ئەکرد هەرچییان هەیـە بینێـرن بـۆ ئێمـە و زۆریـش شانازییان ئـەکرد بـێ خۆهەڵکێشـان کـە کوڕیـان شـەرەفی بەشداریکردنی هەیـە لـە خەباتی ڕەوای نەتەوەکەیدا لە جیاتی خزمەتی ماڵێکی بچکۆلانەی تایبـەتی ، خـۆی خزمەتی ماڵە گەورەی کوردایەتی ئەکا هەر ئەوەیشە هۆی کەمدەستییەکەی .

ئینجا کەوتمە گەڕان بەسەر یەکە یەکەی ماڵەکاندا و هەتا تـوانیم فرمیسـکم ڕشـت و بێ دەوارو بێ پرسە کەران پرسەم دانا ، بڕوا ناکـەم هـیچ کەسـێ چـەند بـەتوانا بـێ بتوانێ وێنەیەکی دەقاو دەقی ئەو ساتەی دەرونی لێوانلێو لە کەف و کوڵی هەڵچوون و خەم و کوێرەوەری و ناسۆرو مەینەتی لەسـەر کاغـەز یـان هـەر شـتێکی تـر تۆمـار بکات. کە لە کاتی وادا پەیدا ئەبێ خۆزگە ئـەخوازم ئێسـتە بـێ یـان لەمـەو لا بتـوانم کەمترین حاڵەتیم بۆ بخرێتە سەر کاغەز .

لەو ساڵدا کە ڕژێمی پاشایەتی تەخت و تاراجی تیکدرا ، لـەم ئاوایـیە بچـکۆلانەدا هاتمە دنیاوە ئەو دنیایەی کە نەتەوەکەم بچووکترین کیـان و مـافی لـەودا نییـە و لـە ڕۆژگارێکی زۆر دێرینەوە بەشی هەر مەرگەساتە ٠جگە لـەخۆم باوکیشـم و باپیریشـم هەر لەم ئاواییەدا لە دایك بوون هەروەها هەموو کەس وکارەکـەم کـە هاتمـە دەرەوە یەکسەر لێرە گیرسامەوەو تاکو ئەنفالی دڕندەکانی بـەعس بـۆ مـاوەی هەشـت سـاڵی ڕەبەق هەر لێرە بووم لێرە بوومـە خـاوەنی خێـزان و لێـرە یەکـەمین (قوتابخانـەی شۆڕش) م کردەوە کە هەم دروست کردنەکەی و هەم سەرجەم پێداویستییەکانیشـی لە سەر حیسابی خۆم بوو، لـە گـەڵ خێزانەکەمـدا کـە زۆر نزیکـی منالبوونیشـی بـوو شانمان دایە٠بـەری .دیـارە بـێ بـیر کردنـەوە لـە کـەمترین دەسـکەوتی تایبـەتی کـە چاوەڕوانم کردبێ لەو ڕێوە بگاتە دەستم هەم وەستا بەلاش و هـەم مامۆسـتا بـەلاش بووم٠

زۆریش شادمان و بەختەوەر بووم کە حەدم نەبێ خەریك بووم لاسایی (مەلا کاکە حەمەی سەیفولاّ) م ئەکردەوە کە لە تاوی لاویدا عاشقی ڕێبازە پیرۆزەکەی بوو بووم، و نیازم وابوو هەموو تەمەنم تەرخان کەم بۆ خویندەوارکرنی خەڵك و هەروەها بە هەمان تین عاشقی ڕێبازە پیرۆزەکەی فەیلەسوف و سەرکردەی مەزنی ولاّت و گەلی دێرینی هیندستان(غاندی) بووم و بە گشت دلّێکمەوە حەزم ئەکرد ئەو شیعرە بەرزەی مامۆستا قانع لە خۆما پیادە کەم کە ئەفەرموێ(رۆلّە تەماعکار مەگرە بە برا خۆت بسوتێنەو ببە بە چرا ) تا ڕادەیەك ئەم شیعرە بوو بە دروشمم و ڕەنگە باجێکی قورسی ڕەنگدانەوەکەشیم دابێ کە تێمدا تەواو بەرجەستە بوو بوو ٠

چۆن دنیایەك بو ئاوایی تەنها هەر کەلاوەی چۆلّ و هۆلّە تەنها یەك کەسیش دیار نییە مەگەر خواو دڕندەکانی بەعس بزانن لە ژێر کام لمی بیابانی چۆلّی بێبەزەیدا بن . ولاّت هەمووی وێرانەیە زۆربەی ئاواییەکان چەند جارێ شۆفلّیان لێدراوە لەتێك دیوار بە پێوە نەماوە هەرکەسێ بگیرێ چارەنوسی مەرگە . وا ئێمە بە شەو ئەویش بەو پەڕی سلّکردنەوە ئەوجا ئەتوانین خۆمان بکەین بە کەلاوەکاندا و تەنانەت کونە پەپویش نەماوە ببێتە هاوخەممان ٠بە ودلّە چەند جار کولاوەوە ڕێی (قولیجانی خوارین )مانگرتە بەر ماوەیەك ڕێمان کرد تا گەیشتینە (تەنگ قەلاّی سور) و لامان دایەوە ئەو کەسەیش کە وەکو من شارەزا بوو ئەویش خەلّکی هەمان ئاوایی بوو. لە پێشەوە بوو لە پڕێکدا دەنگی نەما زۆرمان لا سەیر بوو، زۆری نەبرد دەرکەوت کەوتوەتە ناو گۆمێ ئاوەوە کەمێتر ڕۆیشتین و لەولا تر لە بن کاچێکدا ماینەوە و کتێبێکم دۆزییەوە کە هی نوشتە کردن بوو ٠

٩/٤ بەیانی کەوتینە گەڕان و ڕۆیشتینە ئەو قولیجان و کەمێ گەڕاین هیچ شوێنەوارێکمان نەدۆزییەوە و بەرەو (چەم قامیش)کەوتینە ڕێ و ماوەیەك ڕۆیشتین لە پڕێکدا دو پێشمەرگەمان بینی و ناسیشماننەوە کێن، هەر چەند بانگمیان لێکردن لە جیاتی وەلاّم بە پەلە دور کەوتنەوە لە شوێنیان ڕۆیشتین و ئەوەنەمان زانی لە

دۆڵەکەی بەردەممانداں و ئیتر بوو بە جەژنمان و گەیشتینە یەك و خەم باری کردو هەر تێر نەئەبووین لە پرسیارو گفتوگۆ ناتوانم وەسفی ئەو شادییە بکەم.

ئێمە لەو ئان و ساتەدا تێیا ئەژیاین بەڵام وا هەستم کرد لێپرسراوی ئەو کاتەی ئەو کۆمەڵە یا دەستەیە خەمبار بوو بە هاتنەکەمان ئەو کاتە زۆرم لا سەیر بوو چونکە هۆکەیم نە ئەزانی ·

ئەو کاتە ئێمە گەیشتینە لایان شەهید مەجید کە لە ڕاپەڕینەکەدا شەهید بوو بە ساج نانی گەورە گەورەی ئەکرد، و شەهید کاك ئەحمەدی حاجی ڕەشیدیش نانەکەی لە سەر ساجەکە لا ئەدا کاتێ ئەبژا ، لە هەموویان بە تەمەنتر بوو. یەکەم سات و ئان گەیشتمە لایان زۆر خۆییانە و خزمانە چاك و چۆنی لە گەڵا کردم و وتی (جوابم ناردوە بۆ باوکت وە حاجی سەعیدا وتم بێژە مەلا ڕەحیم بەڕێوە دڵی هیچ نەکات ) دواتر بۆم دەرکەوت مەبەستی لە حاجی سەعید باوکی شەهید کامەرانە ڕەشە ئەو کامەرانەی کە چەند باسی ئازایی و ڕوخۆشی و ئاقڵییەکەی بکەی هەر تەواو نابێ ئەو منی زۆر باش ئەناسی بەڵام من نەمئەزانی ئەم پیاوە بەڕێزە کێیە و لە ڕوویشم نەئەهات بپرسم کێیە؟ جار جارە پێیان ئەوت ابو شەهاب واتە ئەحمەد لە دڵی خۆمدا وتم هەبێ و نەبێ ئەمە کاك ئەحمەدی حاجی ڕەشیدە کە وەك تۆپە کەل ناوی کردبوو لە بەر ئازایی و پیاوەتی و زۆر زۆر دڵسۆزییەکەی هەروایش بوو عەقڵ و ئازایەتی ئەم کەڵە پیاوەبووە هەوێنی داستانی مەزنی تێکشکاندنی نزیکەی دوسەد تانك و زرێپۆش و حەفدە شۆفلێ بوو لە ناو ئاوایی هۆمەرمل دا پێش ئەنفال کە هەق وایە هەموو ساڵێ بە جوانترین شێوە یادی بکرێتەوە و هەرچی گەورەکانی وڵاتە تیایدا ڕاوەستێ و لێکۆڵینەوەی لە سەر بکرێ و لە ئەکادیمیە سەربازییەکاندا بخرێتە بەرنامەی وانە وتنەوە.

ئەوێرم بڵێم مەگەر داستانێکی تری ئەم گەرمیانە بێ پشتە هاوتەقای بێ کە ئەویش داستانی تێکشکاندنی نزیکەی چل و پێنج دەبابەکەی بان سەرقەڵایە لە

ساڵی ١٩٩١كە ئەویش بووە مایەی بە یەكجاری نائومێدبوونی ڕژێم لەوەی ئیتر بتوانێ وەكو جاری جاران حوكمی كوردستان بكات.

هەر لێرە مامە قالەم ناسی كە ئەویش یەكیك بوو لە پاڵەوانەكانی ئەم داستانە هەروەها شەهید كامەرانە ڕەشیش یەكێكی تربوو لە پاڵەوانەكانی ئەم داستانە ، ئەویش هەر لێرە بوو كە هێشتا برینەكەی ساڕێژنەبوەوە جگە لە نان كردن ئەو نیوەڕۆیە برنجێكی جوانیان لێ نابوو كە شلەكەی لۆبیای وشكەوەكراو بوو. لە ڕاستیدا چاوەڕوانی شتی وا نەبووین و ڕنگە بە بیستن بوایە بڕوامان نەكردایە،شتێكی تر كە ئەویش بۆ ئێمە چاوەڕوان كراو نەبوو ئەوە بوو قەیسییەكی زۆریان ساوی بووەوە و لە بەرۆ ئەیانكرد بە هێڵەكا و بە شێوەی شەربەت ئەیانخواردەوە هێلەكەكەش ئەوەندە زەردەواڵەی تێ ئاڵابوو، بەڕۆژ هەروا ئاسان نەبوو لێی نزیك كەویتەوە .

بۆ بەیانی ئەو كەسەكەی تر كە خەڵكی یەك ئاوایی بووین ڕۆیشت بە شوێن ئەوانی تردا كە لە كونەشێر بە جێمان هێشتن و پێمان وتبوون دوای ئێمە بڕۆنە (هەنجیر زەرد) ی لای كوردەمیری حاجی حسەین دوای ئەوەی ئەو و یەكێكی تر پشت پایان هەڵكرد پێشمەرگەیەك دەورو بەرمانی ئاگر تێ بەردا لە لای ئێمە زۆر سەیر بوو. نەمان ئەزانی هۆكەی چییە و حەزیشمان نە ئە كرد پرسیار بكەین دواتر بۆمان دەركەوت بۆ ئەوەیە دوژمن لە دوورەوە دوكەڵەكە ببینێ وا تێبگا هێزێكی تری خۆیان لەو ناوەیەو ئیتر نەیەن و لێمانەوە دوور بن ئەوانەی هەنجیر زەرد دوكەڵەكەیان چاو پێكەوتبوو لەو شوێنە نەمابوون و وایان زانیبوو دوژمن گەیشتووەتە ئەوێ . بۆیە ئەوانەی چووبوون بە دوایاندا بە حاڵێكی زۆر خراپ دوزیبوونیانەوە ، كە گەیشتن یەكێكیان چاوی زۆر زۆر ئاوسا بوو هیچی نە ئەبینی دەستیان ڕانە كێشا و وێنەی دەروێشێكی كەمەنكێش هەر ئەڵهای لێپرسراوی یەكەمی ئەكرد لەوەو پێشیش هەمیشە وەكو ویرد ناوی بە سەر زمانیەوە بوو

باوەڕی وا بوو هەر بگاتە لای چاك ئەبێتەوە ، هاتنی ئەم هێزە تازە ئەوانی خۆشحاڵ نەکرد چونکە لە لایەکەوە کێشەی متمانە هەبوو لە لایەکی ترەوە کێشەی خواردن و لە لایەکی تریشەوە کێشەی ڕاهاتن و قاڵ بوون دەمەو خۆرئاوا لەگەڵ مامە قالەدا ڕۆیشتین بۆ هێنانی بەتانی و لێفە و ڕاخەر بۆ ئەم هێزە تازە ٠ دەمەتەقێیەکی وا گەرممان ئەکرد هەر کەس گوێی لێبوایە ئەیووت لە زۆر زووەوە هاوڕێن باسی ئەو کاتەی بۆ ئەکردم کە ڕژێم ئەو جارەیان دایکمی ناردبوو لە جیاتی باوکم بۆ هێنانەوەی تەرمی کوژراوەکانی دوژمن کە بەشێکی زۆریان جاش بوون وتی سەیرم کرد یەکێ لە ژنەکان نەك گریانی نایە بەڵکو جار جارە پێئەکەنێ بە یەکێکم وت سەیرە ئەو ژنە کەسیشی کوژراوەو گریانی نایە ئەویش وتبووی ئەوە دایکی مەلا ڕەحیمە حکومەت ناردوویەتی وەکو وەفد وایە کەسی نەکوژراوە ٠

زۆر جار کێشەیەك دروست ئەبێ و تا ڕادەیەك چارەسەری نییە بەڵام خواوڕاسان ڕێکەوتێك دێتە پێشەوە خوی چارەسەر ئەبێ هەر ئەو ڕۆژە کە هێزە تازەکە گەیشت شەوەکەی ڕژێم لێبوردنی دەرکرد لە (١٩٨٨/٩/٥) لێپرسراوی یەکەم وتی (بە خوا زۆر باشە )و یەکسەر کۆبونەوەیەکی بەهێزەکە کرد و وتی (ئەوە ڕژێم لیبوردنی دەرکردوە ئێمە ڕێ لە کەس ناگرین تەسلیم بێتەوە تەنیا تکایەکم هەیە شوینەکانمان کەشف مەکەن ) بۆم دەرکەوت پێی خۆش بوو بەشێکیان تەسلیم بیتەوە چونکە بەکەڵکی ئەوە نە ئەهاتن بەشێکی زۆریان ڕۆیشتنەوە ٠ یەکێ لە پیێشمەرگەکان وتی کاتێ لێپرسراوی یەکەم پرسیاری کردبوو ئەم هێزە کە بە ڕێوەیە کێ و کێن و کە وتبوویان مەلایشیان لە گەڵە وتبووی (بە خوا زۆر باشە بۆ سەرقەڵا سودی لێ وەر ئەگرین ئیتر من بوومە بەشێ لەوان کە لەوەو پێش خۆزگەم پێ ئەخواستن کە هان لە ژیانێکدا ڕاستە هەموو کەس پێی ناکرێ و زۆر ستەمە بەڵام زۆر سەربەرزن ٠ ڕۆژانە ئەوان چیپان ئەکرد منیش هەر ئەوەم ئەکرد کە بە پلەی یەکەم کۆکردنەوەی ئازوقە بوو لە پاش ئەو دروست کردنی حەشارگە و کۆکردنەوەی

ڕاخەر و بەتانی و قاپ و قاچاخ پاشتریش شاردنەوەی ئازوقە و دواتریش دۆزینەوەی دۆستی جێمتمانەی تەواو بۆ دابینکردنی خوارد ن و گشت پێداویستییەکان ولە دوا دوایی گشتیشیدا دروست کردنی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەڵ سەرکردایەتی ناو شار.

کاتێك کە ڕژێم لێبووردنی دەرکرد ئەوە هەلێکی زێڕین بوو بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ جارێکی تر چاویان بە دیداری پێشمەرگە شاد بێ بە بیانووی ئەوەوە گوایە ئەڕۆن بۆ هێنانەوەیان لەم سەرو وەختانەدا بوو ڕۆژێك نۆرەی قاپشۆردنم بوو، زۆر چڵکن بووم هەر ئەوەی سەر زێ هات و وتی: مژدەم بدەرێ دایکت و خێزانەکەت هاتن سەرەتا وام زانی گاڵتەم لەگەڵ ئەکەن ئەوەندەی نەبرد دەرکەوتن ئەوەش وەکو یەکەم ڕۆژی ئێمە هەر بە ڕێکەوت پێشمەرگەکانیان دیبوو بەڕاستی هەقی خوی بوو داوای مزگێنی بکا چی لەوە خۆشتر ئەبێ هەم دایك و هەم خێزانت بێن بۆلات لە کات و شوێنێکی وادا کە قەت چاوەڕێ نەئەکرا( بۆکان )کە لە ئەنفالەکەدا تەمەنی (٤٠)رۆژ ئەبوو کاتێ لێك دابڕاین کەمێ گەورە بووبوو .بەڵام ئەو دوو شەوەی پێشو کە بە ڕێوەبوون و لە قولیجان خەوتبوون مێشولە دەم و چاوی ونجڕ ونجڕ کردبوو ئەو شوێنە ئەوکاتە تیا بووین کەڵۆزی (هاوینەی عەزین)بو و. کە دراوسێی کەڵۆزی (تووەکەی مەحمو قولاو)ە کە لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا بنکەی پێشمەرگە بوو، ئەوەی زۆر پێویستە بوترێ ئەو هەڵویستە مەردانەیەی کاك (محەمەدی مامە ڕەسوڵ )ە کە خزمی شەهید (وەستا فاتیح)ە کاتێ دیبووی وا دایکم و سیوەیل و میمکە سوڵتانی دایکی مام وریا هەر خۆیانن کەسیان لە گەڵدا نییە و دڵنیاشە بۆ کوێ ئەڕۆن وتبوی (هەڵبەتە من مردمە ) هەڵبەت بۆ ئەو ڕۆژە ئەوە لە دەستی هەموو کەس نەئەهات لە بەر درندەیی دوژمن ئیتر بە جێی نەهێشتبوون تاکو ئێمەیان دۆزییەوە. هەر لەم شوینەدا بووین دایکی شەهید (کامەرانی مامۆستا هیدایەت ) هات بۆ لامان ئەو شەوە لامان مانەوە و بەیانی گەڕانەوە تا نزیکی کاکە برا لە گەڵیاندا ڕۆیشتم و

کەرێکمان بۆیان پەیدا کردو دۆشەکێکی ئیسفەنجمان لە جیاتی کۆپـان بـە سـەریەوە قایم کرد ٠

ڕۆژانە خەریکی کۆکردنەوەی خواردن بووین چوینە ئاوایی (هە وارە قوڵـە) چـەند کـەرێکمان پـێ بـوو، لامـان دا و بارەکانمـان خسـت و لـە نـاو ئاواییەکـەدا چـەند کەروێشکێکمان کوشت و لێمـان نـابوو برنجەکـەیش دەمـی کێشـابوو زۆری نـەمابوو دەسکەینە نان خواردن کاتێکمانزانی ژنێك و چەند منـاڵێکی ڕوتەڵـەی تـەواو بـرژاوی بەر خۆری گەرمی ڕۆژگاری نەبوونی بە چەند کەرێکەوە بەرەو جێیـەکی دوور ئـەڕۆن کە لێمان پرسین وتیان ئەڕۆین بۆ (سپێسەر) تاوێکی بـاش تاسـە بردمییـەوە ئەمانـە بێباوك و برا بەم ڕێ دوورەدا و بەم شەوە چۆن ژیانێکە  چۆن ڕۆژگارێکە دڵ چۆن لە جیاتی جارێ سەد جار هەڵنەقرچێ و برینەکانی نەکولێتەوە و شادی چۆن بار نەکا و خەم چۆن بارگەو بنە دا نـەنا زۆر هـەوڵیان دا بـڕۆن نەمانهێشـت  دوای نـان و چـایی لێیاندا و ڕۆیشتن کە پێچیان کردەوە جارێکی تر بارانی فرمێسك دایکـرد ئـاخر چـۆن دا نـەکا هـەزار نـەفرەت لـە دڕنـەکانی عـەرەب و جاشـە خۆفرۆشـەکان بـە تایبـەتی ئەوانەی ئەنفالیش نەیتوانی دەرونی نامەردانەیان تۆزێ بگۆرێ و دیمەنی ئەم خێزانە ماڵوێرانە ویژدانی نووستویان لە خەوی خیانەت ڕاچڵەکێنێ ئەو دیمەنـە ئەوەنـەی تـر شێرگیری ئەکردین لە سەر خـەبات و ڕقـی پیرۆزمـان ئەوەنـەی تـر ئەسـتوور ئـەبوو، بەلاّم با شتێ بڵێین قەت بە بیرماندا نەئەهاتەوە ئـەو جاشـانەی کـە لـە سـەربازەکانی دوژمن زیاتر پەلاماریان ئەدایـن کاتێ کورد ڕزگار ئەبێ نەك بە سزای گەل ناگەیـەنرێن لەوەش تاوانتر ئەکرێنە پیاو ماقوڵ و دێوەخانانەیان بـۆ ئەبرڕدرێتـەوە و هەریەکـەیان چەند (حیمایە)یەکیانیش بۆ دائەنرێ نەوەکا دوژمنانی ناحەز دەستیان لێ بوەشـێنن و هەڵسەنگاندنی لێوەشاوەیی بەرپرسان لـە دەمـی ئەوانـەوە ببیسـرێ و هەرکەسـێ ئەوان ڕایان لێی نەبێ ئەم حکومەت و حیزبانەش ڕایان لێی نـەبێ هـەر ئـەوان وەکـو ڕۆژگاری پێشوویان واسیتە بۆ خەڵك بکەن بەلاّم ئەبوایـە بمانزانیایـە لـە قسـەی خـۆ

فرۆشێکەوە کە هەموو تەمەنی هەر بە جاشی تەواو کرد کە یەخەی کوردێکی زۆر دڵسۆزی گرتبوو کە ئەیزانی هات و چۆی ئێمە ئەکا و لە هەردوو شۆڕشی تازەو شۆڕشی ئەیلوولدا هەر تێکۆشەر بووە پێی وتبووی ( ها فلان کەس ئێستەش لە سەر کەرییەکە ماوی ) ئەمیش زۆر ترسا بوو خۆی لێ گیل کردبوو وتبووی (کەرێتی چی؟ ) خوفرۆشەکەیش وتبووی (خۆت گێل مەکە ئەزانم خەریکی چیت کەرە بەیانیش ئەگەر کورد بووە چشتێ هەتا تۆ وە چرکە چرك دوو مامرە مردارۆ بوویان بۆ سەر ئەبڕی من دوو شەکیان بۆسەر ئەبڕم ئەوکاتەیش هەر من هام لە پێشەوە ) ٠

کەسێکی بە تەمەنمان تیا بوو لە سەرەتای پەیدابوونی یەکەم دەستە پێشمەرگەوە خەریکی خەبات بوو ماوەیەکیش لە زیندانەکانی بیر تاریکەکانی عەرەبدا ئەشکەنجە درا لە گەڵیا ڕۆیشتین بۆ (چەمی سەیفولاَ مردو)ی خوار (سەیبەیخان ) بۆ ئەو شوێنەی ماڵەکەیان لەوێدا شاردرابوەوە ،لە تەنگێکدا هەندێ گەڕا ئەلبومێکی دۆزییەوە وێنەی زۆری تیا بوو هیچیان زۆر بۆی کاریگەر نەبوون بەلاَم کاتێ چاوی کەوت بە وێنەکەی ئەو مامەیەم کە خۆی و خێزانەکەی و (٧)منالَی ئەنفالە، یەکسەر بانگی لێ بەرز بوو ئەوەندە باوکە ڕۆی کرد تا شل و کول بوو بڕوا ناکەم لە ژیانیا جارێکی تر وا گریا بێ هەردووکمان دووبە دوو تا توانیمان گریاین و لە کاتی نووسینی ئەم چەند دێڕەیشدا جارێ تر ئەو کۆنە برینە هەم کولایەوە و ڕەنگە توند تریش ٠

قەت نەمزانی بوو ، سەگ گەنم ئەخوا کە چووینە کەلۆزێکی خوار سەیبەیخان سەگێك کە بە حالَ نوزەی ئەهات دەمی لە ناو گونێیەك گەنما بوو قاوماندا و دەمەکەیمان بەست و چەند (نەوو) واتە لەبادێکی دانەخراومان دۆزییەوە کە خاوەنی هێشتا ڕای نەخستبوو هەڵمان گرت و کە گەڕاینەوە ئەو کەسە یەکسەر تەسلیم بووەوە بە مەرجێ ڕۆژی دەرچوونی لیبوردنەکە هەموومان بە تایبەتی سەرگەورەکەمان هەوڵی زۆری لە گەڵی دا بەلاَم هەر گاڵتەی پێ ئەهات زۆر لەوەوە

دوور بوو، چونکە تا بڵێی دڵسۆز بوو کاتێ خوا حافیزی ئەکرد یەکێکمان خوا حافیزی نەئەکرد ئەیووت بەخوا کڵاوە ماوەیەك ئەوە بەردەوام بوو لە لایەکەوە گریان و لە لایەکی ترەوە پێکەنین بوو کە ئەو ڕۆیشت ماوەیەك گشتمان بێدەنگ بووین .

١١/١٠/ ٨ ١٩٨ هاتنی کۆپتەر بووبووە کارێکی ڕۆژانە ، ئەگەر ڕۆژێك نەهاتایە سەیر بوو! لە سەر (چەمی ئاوەسپی) لە خوار ئاوایی (خان)ەوە لە دۆڵێکی قوڵدا بووین کۆپتەرەکان زۆر سوڕانەوە تومەز تووشی کاك ئازادی سەگرمە و هاوڕێکانی هاتوون و لە ئەنجاما سێ پێشمەرگە ( شێرکۆ و هەڵکەوت و شێرزاد)شەهید بوونە و کاك ئازادیش زۆر بە خەستی بریندار بووە. لە گەڵ برایەکیدا و ئەگەر شێرەکەی تەنگانە( شەهید حەمەڕەش ) وچەند کەسێ تر نەبوایە ماوەیەکی باش بە کۆڵ دوری خستبوەوە و لە ژێربنجە تەرویەکدا شاردبویەوە کاتێ کۆپتەرەکان دووبارە گەڕانەوە و هەرسێ تەرمەکەو باری هەر چواردە وڵاخە کوژراوەکە کە چەك و جیهازو تەقەمەنی و پارەو خواردن و پێخەو بوو ئەویشیان برد دوای ئەم کەتنە کۆپتەرەکان ئەوەندەی تر هاتنەکانیان گەرم بوو کە خەریك بوون ئەگەیشتنە ڕایەکی وا کە نەخشەکەیان بگۆڕن سنوری قولیجانەکان و کوردەمیرەکان بووبووە سنوری هەمیشەیی کۆپتەر و ڕژێم زۆر مەبەستی بوو بزانێ لە کوێداین و چۆن ئەژین ،لە خانەوە گواستمانەوە بۆ (عەلییان تازە) زۆرمان مابوو بگەینە کەلاوەکانی ئاوایی (عەلییان کۆن) پشیلەیەك زۆر کەساسانە ئەیمیاوان کە لە هاوار ئەچوو کە لێی نزیك بووینەوە کارێکی وای کرد بە بێ زمان هەموو قسەیەکی خۆی کردو هەستی هەموومانی هینایە جۆش و هەر خەم نەبێ بیرمان لە شتێکی تر نەئەکردەوە بۆ ئەو هەر ڕێمان ئەکردو خەریك بوو لە ئاوایی دەر ئەچوین، و کە بۆی دەرکەوت نیازمان وایە جارێکی تر بیسپێرینە تەنهایی ئەمجارەیان لە جاری پێشو بە کولتر بانگی لێ بەرز بوەوە و ئەوەندە کاری تێمان کرد ( شەهید مەجید)دابەزی و هەڵیگرت و نایە

بەرکۆی خۆی و ئیتر کپ بوو تا گەیشتینە (سەرکانی )لای سەرووی عەلییانی تازە و بە درێژایی ئەو ماوەیە کە لەوێ بووین ئەم پشیلەیەو سەگەکە لێمان دوورنەکەوتنەوە بە ڕۆژکەی ئێمە خۆمان ئەشاردەوە ئەوانیش خۆیان گوم ئەکرد و کە ئێمە گرد ئەبووینەوە ئەوانیش پەیدا ئەبوونەوە · ئەم ماوەیە کە لێرە بووین هەموو ڕۆژێ ئەڕۆیشتین بۆ ئەو دۆڵەی نیوان هەردو خان لەم سەرەوە سێ کاتژمێرو لە گەڕانەوەیشدا سێ کاتژمێرئەبوایە بە ڕێوە بووینایە خەریکی دروست کردنی (حەشارگە) بووین ،کە تەواومان کرد زۆر جوان شوینەواری ئیشکردنمان سڕییەوە و بێشکمان کرد بە جۆرێ وا مەگەر یەکێ بچوایەتە بەر کوونەکەی ئەوجا بۆی دەرکەوتایە ئەمە حەشارگەیە. لە ناوەوە بە لەبادی باش ڕاخرابوو لەدەورووبەریشی حەشارگەیەگی گەورەمان دروست کردبوو پڕمان کردبوو لە هەمو جۆرەکانی خۆراك·

دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر خەریکی دروستکردنی ئەو حەشارگەیەی لای خان بووین و زۆر ماندووی کردین ڕۆیشتین بۆ (تەنگ قەڵای سور)بۆ ئەوەی هەم وچانیك بدەین و هەروەها خۆمان و کەلوپەلمان بشۆرین · شەکرمان نەبوو دووانمان ڕۆیشتن بۆ شەکر ئەوەندەی نەبرد بە پەشۆکاوی گەڕانەوەو وتیان (خۆتان بوەستن جێش و جاش هات )زۆر ناخۆش بوو بە تەمای ئەوە نەبووین خۆمان بەست و چووینە شوێنەقایمەکانەوە کۆپتەرەکان زۆر سوڕانەوە بەڵام بەدییان نەکردین بۆ ئێوارە زۆر بە وریاییەوە ڕۆیشتینە ناو قولیجان و تێیا نەماینەوەو ڕۆیشتین بۆ (تەنگ بانە چەرمو) لەودیو قولیجانەوە و کەرەکانمان بەرەڵا کرد بە ڕووکاری (کەوری بزێل)دا ڕۆژی دوایی من و دووانی تر کە هەرسێکمان بەر غەزەبی کابرایەکی نەگونجاو کەوتبووین هەرسێکمان بە جیا لە کونێکدا بووین و ئەوانی تریش لە کونێکی تردا لە سەر پێشنیاری من کەسمان نەخەوتین و هەر خەریکی هەڵکەندنی دیوی ناوەکەی بووین ، و ڕوکاری پێشەکەیشیمان بە تاوێر هەڵچنی و خۆڵی هەڵکەندنەکەیشمان

ئەکردە دیوی دەرەوەی ئەو تاوێرە کە هەڵچنرابوو تا وای لێهات داپۆشی و تەنها کونێکمان تێدا هێشتەوە بۆ هاتوو چۆ پاش نیوەڕۆ گوێمان لێ بوو دوژمن گەیشتە قولیجان و هەر تەقەی چینکۆو دەرگا ئەهات لەوە ئەچوو بۆ خەو ئەیانخستە ژێریان و دڵنیا بووین بەیانی ئەکەونە کیو ماڵکردن و کابرای نەگونجاو وتی شوێنی تر هەیە بۆی بچین منیش وتم شوێنی تر شارەزا نیم یەکسەر تورە بوو و وتی (ئەی بۆ لە قولیجان خۆت بە نەوشێروان ئەزانی )هەتا توانی نارێك جولاًوە لە گەڵما ٠ بە ناچاری لەو شوینە ماینەو ٠

١١/٢ بەیانی زوو قاوەڵتیمان کردو شتەکانمان شاردەوە ئەوانیش کە لە کونەکەی تر بوون هاتن بۆ ئەو کونەی کە ئێمەی تیا بووین وتیان ئەوەی تر کەشفە ویەکسەر کوپتەر ئەیبینێ هەموویان هاتنە ژورەوە تەنها یەکیك نەبێ نازانم لەسەر چی مانی گرتبوو ئەیوت نایەمە ژورەوە باش بوو لە دواییا هاتە سەر ڕێ و هاتە ژورەوە من لەبەر ئەوەی هەم ناڕەحەتی ئەو کابرایە بووم و هەمیش چاوساغی ئەو ناوچەیە بووم وام حەز ئەکرد پاسەوانییان بکەم و نەخەوتم ئەوان گشتیان خەوتن و من تا نیوەم هێنابووە دەرەوە و خەریك بوو خەو ئەیگرتم تەنانەت جارێکیش وەنەوزم دا و ڕاچڵەکام و یەکسەر کشامەوە بۆ ناو کونەکە و وا هات بە خەیاڵمدا بەم شێوەیە خەوم لێ ئەکەوێ و دوژمن دێتە سەرمان و کاتێ چاو ئەکەمەوە هان بە سەر سەرمەوە وام زانی هەر بە ڕاست وایە و زۆر ترسام هەستی شەشەمی ئینسان زۆر جار بە جوانی ئەکەوێتە کار و چۆن پێشبینی ئەکا وا دەرئەچێ، یەك کەمێ دوای ئەوەی کشامەوە بە لای دەستی ڕاستما سێ جاش و دوو قوات خاسە کە لاقی مزەلییەکەیان هەڵدابوەوە هاتنە خوارەوە وکەوتنە بەرانبەرمان و لە کونەکە ورد بونەوە، و دیارە لەو بەرەوە هیچیان پێ بە دی ناکرێ و ڕوویان وەرگێڕا،و یەکیکیان بانگی کرد وتی لەیرەوە مەیەن و پیشتریش کاتی چوونە خوارەوە یەکێکیان وتی پێنجوێنە پێنجوێن ئیتر نازانم مەبەستی چی بوو کاتێکمان زانی لە سەردا نزیکەی

چل کەسێ بە شوێنەکەماندا هاتنە خوارەوە ،و بووە قەرەباڵغییەکی زۆر و یەکسەر شتەکانی ناو کونەکەی تریان دۆزییەوە و یەکێك وتی (سەیدی هەزەنی بەتانییاتهوم ) و لەبەر خۆیەوە ئەیوت (بەھ بەھ بەھ بەھ )وا ڕێکەوت جیهازەکە هاتە سەر ئەو تاوێرە کە ئێمە لەژێریا بووین و زۆر بە چاکی گوێمان لە خشەکەی بوو. نەك قسەکان یەکێك لە جاشەکان وتی (سەلیم بە شەرەفم ئەم بەیانییە لەیرە بوونە ) و ئەوی تریشیان وتی (خۆزگە لەیرە بوایەم )نازانم مەبەستی چی بوو، کە کابرا بە عەرەبی وتی گەورەم ئەمە بەتانییەکانیانە ئەفسەرەکە زۆر بە پەلە و کەمێ بە شپرزەیی و تۆزێکیش بە تورەییەوە یەکسەر وتی ( یەلا ) یەکیك هات بۆ ئەو کونەی ئێمەی تیا بووین و زۆر کەمی مابوو بگاتە ناو کونەکە ئەو پەرەکەی چوار مەتری مابوو گوێمان لە هەناسەی بوو بەڵام خوا دەلیلی داماوانە شەهید کاکە نازانم چۆن ڕادیۆکەی لە خوارەوە لە بیر چوبوو کە هەمیشە بە دەستییەوە بوو کابرا کە ڕادیۆکەی بینی هەڵی گرت و پێوە خەریك بوو لەو کاتەیشدا ئەفسەرەکە وتی ( یەلاّ کاکە )وا دیار بوو جاشەکان هەر خەریکی موشە بوون وێنەی هەندێ گیانداری چڵێس و موشەك ئێمە لە ناو کونەکەوە زۆر جوان ئەوانمان ئەبینی کە شتەکانمانیان ئەدا بە شانا تاکو ئێوارە لە کونەکە نەهاتینە دەرەوە کە خۆر چووە دەم کەل بە دودڵییەوە هاتینە دەرەوە وام چاوەڕوان ئەکرد، لە شوێنێکەوە چاودێریمان بکەن و هەر بە دەرچوونمان یەکسەر بەدیمان بکەن و بەیانیش دوای ئەوەی کە ئەفسەرەکە تێی خوڕین و بەناچاری ملیان شکان زۆر چاوەڕێی ئەوەم ئەکرد بە دزیشەوە بێ بگەڕێنەوە ئەیانم ناسی چۆن ماڵێکن کاتی هاتینە دەرەوە بەشێکی زۆرمان ئەرشایەوەو سەریەشەیەکی توندی گرتبوو نەگونجاوەکە چاوساغمان بوو بە هەردەیەکی زۆر سەختا بردمانی خەریك بوو ملمان بشکێ ئەو شەوە زانیم زاتی چۆنە ٠ گەیشتینە تەنگ قەڵای سور و بە پەلە شەربەتێکمان خواردەوە لە جیاتی

نانی نیوەڕۆ و نانی ئێوارەش و کەوتینە ڕێ و ڕۆیشتین بۆ حەشارگەکەی لای خان و کەمێ ئەشترساین نەوەکا دۆزرابێتەوە و لوغمیان لە دەورو بەری دانابێ .
نازانم چیمان هەڵگرت و کەوتینە ڕێو دەمەو بەیان گەیشتینە (هەسەن پرچن)و کتریمان نایە سەرو دووانمان ڕۆیشتن بۆ شوێنێکی بەرز کە کەمێ لە خۆمانەوە دوورە، ئەوەندەی نەبرد بوو بە هەڵەداوان گەڕانەوەو شەقێکیان دا لە کترییەکەو ئاگرەکەیان کوژانەوەو، وتیان سەیری ئەو گردانە کەن گشتی هێزە و کەوتینە ڕاکردن بەو ڕۆژە ڕووناکە بەڵام لە خوابەزیاد بێ کۆپتەر نەهات ئەگینا تاقمان دەرنەئەچوو نیوەڕۆ گەیشتینە (تەکیە کۆن )واتە ڕەمەزان مامکە بە شوێن پۆستاڵەکاندا وادیار بوو، ماوەیەکی کەم بەر لە گەیشتنمان لەو شوێنە بوونە لەوەشدا هەر خوا و هیمەتی پیاو چاکان پاراستینی · درەنگانێ دوژمن گەڕایەوە و ماتۆڕێکیان پێ بوو وا حاڵی بووین ماتۆڕی یەکێ لە هاوڕێکانی خۆمانە کە لە شوێنێکدا قایمی کردبوو زۆر زۆر خۆشی ئەویست و لە لامانا وەستا بوو زۆر بە کزییەوە وتی ئەوە ماتۆڕەکەی منە بە جورێ وتی هەمومانی خەمبار کرد ڕۆیشتینە خوارەوە بۆ چەمەکەی ئەو دیو ئاوایی و لە پەلێکیدا کە کەمێ لە چەمەکە بەرز تر بوو، هەریەکەو ئاودرێکمان دیاری کردو پاکمان کردەوە و بنجگمان لای خۆمانا دانا و ئەوەندەی نەبرد کۆپتەرەکان هاتن هەریەکەو لە ئاودری خۆیا گرمۆڵە بوو و بنجگەکەی دا بە سەر خۆیدا باش بوو نەمانیبینی خۆر زۆر کەمی مابوو بەو دیوی پەلەکەدا لە سورکە یەکی بەرزەو خۆمان غل کردەوە· گەیشتینە (تەڵە بی) کە لە زۆر کۆنەوە چۆڵ کرا بوو، وا دیار بوو هەر بە جاش و جێش و بە پاڵپێوە نان ڕوخاندبوویان ،لەم نزیکانەدا وا باس ئەکرا یەکێ لەوانە کە بەشدار بوو لە ڕوخاندنەکەیدا خاوەن پۆستێکی باش بوو بەوەش تێری نەئەخوارد داوای پۆستێکی زۆر بالآتری ئەکرد ئیتر نازانم ئەوە وا بوو یان هەر بوختان بوو شوێنێکی زۆر دوور و لا کەوتبوو ئەگەر زۆڵە کورد چاوساغی دوژمن نەکا عەرەب بە خەویش ئەو شوێنە

نابینێ نەفرەت لەوەی (خو و ڕەوشتی کەوی هەیە و هاوڕەگەزی خۆی ڕائەکێشێ بۆ ناو داو) لێرەش وچانمان نەدا و کەوتینە ڕێ و چاوساغەکانمان کەمێ ئەترسان بە ئاسانی (ئەلأوری)نەدۆزنەوە، بەلأم باش بوو دوزیبیانەوە ئیتر هەناسەی خۆشیمان هەلکێشاو وەکو ئەوە ی دەسکەوتێکی زۆر گەورەمان دەسکەوتبێ چاوساغەکە، وتی: نەجاتمان بوو کەوتینە ڕێ بۆ(چەم سێگلأن )و تەواو بێخەم بووین ئەگەر زۆر ماندو نەبوایەین و ئەو کابرایەمان لە گەلّ نەبوایە حەزمان لە گۆرانی بو ماوەیەك ڕێمان کرد و شۆڕ بوینەوە و خەریك بوو ئەگەیشتینە یەکەمین تۆقە قامیش لێمانیان خوری( کورە زەلام کێن کوژریان ) شتێکی زۆر چاوەڕوان نەکراو بوو.

ڕۆژێك تا ئێوارە لە کوناو شەوێ تا بەیانی ڕێ بکە، و ڕۆژێ تر نیوەی ڕاکردن و نیوەی ڕێکردن و خۆشاردنەوە لە عەسرێکی درەنگیشەوە تا ئێستە کە دەورو بەری( کاتژمێری ٢) شەوە هەر ڕێکردن و ئێستەش وا هاتینە سەر سفر کە ئێمەش وەلأمان دانەوە دەنگی یەکێکمانیان ناسی و بە ناوی خۆیەوە بانگیان کرد کاك (...) تۆی ئەمیش دەنگی ئەوی ناسی و هەرچۆنێ بوو دوای ئەو نائومێدییە هاتینەوە سەر خۆشییەکەی کەمێ لەوەو بەر ، کە تەماشامان کرد ئەمانیش کۆمەلّێ تری هاوڕێکانی خۆمانن ئەوانیش خۆیان بۆ ئێرە کوتاوە. وا بزانم هێشتا نەگەیشتبووینە یەك زۆر تامەزرۆیانە وتیان (شەکرو چایتان هاپێ )دیار بوو ئەوانیش وەکو ئیمە زیاتر کەیلی چایی بوون ، ئێمەیش یان چایی یان شەکرمان پێ نەبوو، ئەوان پێیان بوو لە لای ئەوانە بوو کە لە پەلەکەی ئەو دیومان بوون و زۆریش نزیك بوون بەلأم هەردوولامان ئەوەندە شەکەت بووین کەسمان نەمانتوانی بڕۆین و لێی خەوتین لەو کاتەدا ئەگەر بەپارە دەسکەوتایە هەرچەنیان داوا کردایە بۆ چاییەك ئەماندا .

بەیانی کە هەلّساین دەستمان کرد بە دروستکردنی ناو ساجی و پێش خۆرئاوا سیانمان ڕۆیشتین بۆ گەڕان بە دوای مالّی باوکی یەکیکمانا کە لەو ناوەدا

شاردرابوەوە و وتی ئەگەر بیدۆزینەوە هەموو شتێکی تیایە و باش بوو دوزیمانەوە بە فەردە شەکرو برنجی تێیا بوو. جگە لە ڕۆن و ئاو تەماتە و شتی تریش ئەمڕۆ کۆپتەرەکان هەم هاتنەوە بەلآم باش بو لێمانەوە دوور بوون، دۆزینەوەی ئەو خواردنانە یەکجار گرنگ و کاریگەر بوو دڵمان خۆش بوو وتمان بەخوا باشە ماوەیەکی باش لێرە ئەحەسێینەوە و ئەو هەموو ماندویەتییە لە گیانمان دەر ئەچێ ئەو خەیاڵەمان هەر زو لێتێك چوو کابرای نەگونجاو بێ هیچ هۆیەك یان پێویستییەك وتی ئەگەڕێینەوە و هەمومان کپ بووین و کەسیش نقەی لێوە نەهات گەر چی هەرهەموومان زۆرمان پێ ناخۆش بوو، بە دەم ڕێوە چووە گژ من و یەکێکی ترا بەبێ هۆ هەموو پێشمەرگەکان هەتا بڵێی پەست بوون بەلآم نەشیان ئەتوانی هیچ بڵێن کەوتینە ڕێ لای (ڕەمەوان)چاومان بە بەراوێ کەوت و نەوەستاین تاکو حەشارگەکەی لای خان هەر بە گەیشتنمان من و یەکێکی تری نارد بۆ تەنگ بانەچەرمو بۆ ئەو شتانەی کە جێمابوون گەر چێ هیچ پێویستیش نەبوو، یان ئەکرا کاتێکی تر بوایە ناچارین برۆین کە گەیشتینە نزیك قولیجان لە(قەرکە) ەوە ڕۆیشتین و هەر نەڕۆیشتینە قولیجان نەوەکا کەمینی لی مابێ شتەکان وەك خۆی بو بارمان کرد و گەڕاینەوە لە ڕێ چەند جارێ بارە کان کەوتن و بارمان کردەوە زۆر ماندوی کردین و هەردوکیشمان بێزار لە دەست ئەو کابرایە ٠

نازانم چەنێ شەوی مابوو گەیشتینە حەشارگەکەی (ئەردەلآن) و باری هەردوو کەرەکەمان داگرت و لێی خەوتین نەنان نە چایی چۆنی ئەگوزەرێنی بیگوزەرێنە ئێمە ئەمە حاڵمانە و دو پێشمەرگەمان کە ماوەیەکە بۆ شوێنێ ڕۆیشبوون ئەوانیش گەرابوونەوەو لەو دیومانەوە بوون بێئەوەی ئاگامان لە یەکتر بێ کاوڕێکیان دۆزیبوەوە و سەریان بڕیبوو بە بێ نان دوو ڕۆژ هەر لێیان خواردبوو داشبڕابوون و جیهازیشیان پێ نەبوو کە دنیا ڕووناك بووەوە بارمان بار کردو ڕۆیشتین بۆ حەشارگەکەی لای خان ٠ ئەو چەند ڕۆژە کە لەوێ بووم خەریکی وەرگێڕانی ئەو

کتێبە بووم کە لە (گەرەوان )ەوە هێنا بووم لە گەڵ (منجد)ێکی گەورەدا بۆ ئەو ڕێ دوورە زۆر ئاسان نەبوو.

لەم چەند ڕۆژەدا کەلێرە بووم پێشنیارم کرد بۆ لێپرسراوی یەکەم کە ڕێیەك بکەینەوە لە( سەرقەلاّ )وە وەکو بنکەی هاوکاری و ئەویش زۆری پێ باش بوو ، کاك سمایل خانی دەلۆیش وتویەتی سۆپەرەکە لە خزمەتتاندایە بۆ هەر کارێ کە پێویست بکات . بنکەی هاوکاری بۆ ئەو کاتە لە زۆربەی ئیشەکان پێویست تر بوو بۆم دەرکەوت منیش نەموتایە ئەو ئەیوت لە بەر ئەوەی ماڵی باوکم لەوێ بوو هیچ گومانێکیشی لە سەر نەبوو، تەنها ئاوایش بوو نەڕوخا بوو بواری هات و چۆیشی خراپ نەبوو. بۆیە منیان نارد بۆ لای کاك ئەحمەد کە لە ڕۆحی منا هەمیشە ئامادە و ئەزەلییە چونکە ئەو لە گەڵ دەستەکەیا لە سەروی (هۆمەرمل)ەوە بوون و لە سەرقەلاّوە زۆر نزیك بوو کەوتمە ڕێ و لەو دۆزەخە ڕزگارم بوو ئەوە خۆشییەك و ئومێدی ڕۆیشتنیشم بۆ( سەرقەلاّ) خۆشییەکی تر کە (٨)ساڵە لێی دابڕاوم و دیداری کەس و کاریش کە زۆر زۆر پەرۆشیانم چونکە تا بڵێی گەورەییان لە سەرمەو جگە لەوەی ئەو چەند ساڵە کە من ماڵ بووم وەکو باسم کرد تاکو شقارتەکەیشم لە سەر ئەوان بوو ئەمجارەیش مناڵەکان و دایکیشیانی هاتە سەر کە لە ئەنفالەکەوە لای ئەوان بوون جێی خۆیەتی ئەوەش بڵێم جگە لەوەی کە باوکم بوو خۆیشی هەمیشە لە کوردایەتیدا نەك دانەبڕاوە بەڵکو چەند بواری بۆ ڕەخسا بێ لە پێشەوە بووە بۆیە هەرچی لە توانایا بوو خستییە کار بۆ خزمەتی من و ماڵ و مناڵم چونکە گەورەترین ئاواتی ئەوەبوو ڕۆژی ڕزگاری کورد ببینێ بەلاّم جێداخە بەشیکی زۆر کەمی بینی کاتێ هەواڵی کشانەوەی هێزەکانیان پێ دابوو لە کاتی کۆڕەودا یەکسەر (جەڵتە) لێی دابوو بەرگەی ئەو هەواڵە دڵتەزێنەی نەگرتبوو ئەوانەی کە ئەو چەند ڕۆژەی شەڕەکانی بەرەی کفری و خورماتوو دیبویان گەرچی پێشمەرگەی شارەزوور و سلێمانیش بوون ئێستەیش هەم شایەتی شادمانییە بێسنورەکەی و لەشساغییەکەی

بۆ ئەدەن هەم شایەتی جەڵتە لێدانەکەی · جارێکیان یەکێك لەو چەند کەسەی ئەوکاتە بە دیار ڕوداوەکەوە بوو وتی ئامادەی چاوپێکەوتنم لە گەڵ هەر ڕۆژنامەیەك یان تەلەفزیۆنێك کە داوام لێ بکرێ بە مەرجێ ئەو بەڕێزە خەڵکی ئەم ناوچەیەش نەبوو پێشتریش باوکمی بۆ تەنها جارێکیش نەدیبوو وا چاوەروان ئەکرا ئەوە گەرمیانییەکان بیانوتایەو بیشیانکردایە ئەوان زۆر بە وردی ڕابوردووی خەباتی کوردایەتی ئەو شارەزان و ڕەنگە هەندێ بەڵگەیشیان لا بێ لەو بارەوە ئەگەر مەبەستیان بێ و بیانەوێ با لە دوای هەموو کەسێکیشەوە بێ وەکو ڕێزلێنان هاوسەرەکەشی کە ئەویش جگە لەوەی خێزانی ئەوە خۆیشی خاوەنی خەباتە، بە تایبەتی دوای ئەنفال تاکو ڕاپەڕین و دایکی دو پێشمەرگەی پارتیزانە و دو برای شەهید ·

ڕۆژێك بریار درا من و ئەو کەسەی سەر زێ بڕۆین بۆ سەرقەلاّ و کاکە ئەحمەدی سەرکردە زۆر بە نهێنی چەند هێلکەیەکی کولاّندو چاوەڕێی ئەوە بووین تاریکی دابێ ، شەهید( کامەرانە ڕەش )ی هۆمەرمل کە پێشمەرگەیەکی زۆر قارەمان وتا بلّێی ژیر بوو بە ئەسپایی هاتە لام و بە ئاوازەوە وەکو گۆرانی وتی (بەخوا ئەزانم بۆ کوێ ئەڕۆی ؛ ئەڕۆی بۆ سەرقەلاّ) زۆر سەرسام بووم بەو زیرەکییەی و وتم (شەرت بێ ئەگەر بووینە حکومەت بتکەینە ئەمن" ئاسایش" ) ·

شەوی ١٨و١٩ /١١ خۆمان کرد بە سەرقەلاّ دا ئەو سەرقەلاّیە کە شانازی ئەکات لە گەڵ ئاوایی سەربەرزی (برایم خان) هاوسنوورە کاتێ گەیشتینە ئەوبەری چەم گوێمان لە دەنگی منداڵ و قاز بوو هەردووکیان زۆر کاریگەر بوون و بە هەست و ناخمدا بە ئارەزووی خۆیان ئەچوونە خوارەوە ختوکەی ڕۆحیان ئەدام ڕۆیشتینە بەر دەرگای ماڵی خالّۆی هاورێکەم( کابرای سەر زێ )دەرگایان لە ناوەوە داخرا بوو ناشکرێ لە دەرگا بدەین چومە ژێر پێی و بە سەر دیوارا چووە ناو حەوشەو دەرگای کردەوە و منیش چوومە ژورەوەو دەرگامان داخست و ئەو لە دەرگای ژورەکەیانی

دا و کە خاڵۆ ژنی دەرگای کردەوەو بینی ئەمە ئەوەو ئەیشزانیٚ پێشمەرگەیەو ئاشکرایشە پیشمەرگەو ئەو شوێنە چەند جێی مەترسییە زۆری نەمابوو ببورێتەوە زۆریش هەقی بوو ئەم هاوڕێیەم برایەکی زۆر باش و شۆڕشگێڕی لە گەڵ دایکی و کۆمەڵێکیانا ئەنفال کراون ئەمەش خۆیەتی بە پێی خۆی هاتووەتە پای قەنارە ، باش بوو هاتەوە سەر خۆی بەخێر هاتنێکی زۆر گەرمی کردین و دوای کەمیٚ پیاوەکەیشی هاتەوە و زۆر مەردانەو جەرگ قایمانە ترسی نایە لاوەو بیٚ هیچ شڵەژانێك دەستی کرد بە ماریفەت و گەمەو گاڵتەی خۆی کە بەوە ناسراو بوو تا بڵێی خاوەن ئیرادە بوو ، گەرچی هەر دوو چاویشی نابینا بوو بەلاٚم چەنەها جار ئەبووە چاوساغی خەڵك و ئەیبردن بۆ شارەکان یان چاوساغی ئەو کەسانەی کە یەکەمجار ئەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی چونکە جێی متمانەی تەواو بوو، کاتێکیش ماڵیان لەئاوایی (بەکرە شەل ) بوو کە بە شەو بارە تەماتەیان ئەبرد بۆ شار ئەو وەکو چاوساغەکان لە جۆگاکان ئەپەڕییەوە و کاتێکیش لە شار ناسیاو ئەیدا بە لایا و ئەم خەریکی پارە ژماردن بوو، بە گاڵتەوە ئەیووت ئەزانی بیژمێری ئەمیش ئەیوت (خۆ کوێر نیم ) ٠

ئەم پیاوە نابینایە لە جیاتی ترس و ناوچاو بەیەکادان وتی (بڕۆم باوکت بێرم بۆ ئێرە)منیش زۆر پەلەی ئەو قسەیە بووم و لە ڕوویشم نەئەهات یەکسەر وتم (ئەی ئەتوانی )قابلەمەیەکی بچووکی هەڵگرت و گوایە ئەڕوا بۆ ماست کڕین و ئەوەندەی نەبرد باوکم و دایکمی هێناو هاتەوە ئەوەیە پیاوی تەنگانە و چاونەترس ٠ دوای کەمیٚ باوکم وتی (با بڕۆین بۆ ماڵ هیچ نییە مەترسن ) ئەو کاتە زانیم باوکم خاوەنی چۆن ئیرادەیەکە کە کەوتینە ڕیٚ حەزم ئەکرد چاوم لە هەموو دیمەنەکان تێر کەم چونکە من پەروەردەی ئەم ئاواییەم و زەمانێکیشە لێی دابڕاوم و ئێستەیش کە هاتوومەتەوە بە سەر شوڕی نەهاتومەتەوە بەڵکو بە ئەرکێکی زۆر شەرەفمەندانە ڕاسپێردراوم ، و وام لە جۆشی ئەنجامدانیاو یەکێکیش بووە لە ئاواتەکانم کە لە

ڕۆژگارێکی زۆر سەختا پێشمەرگایەتی بکەم ئەوەتا هاتە دی و لەوەیش خۆشتر نییە ئاواتێکت بێتە دی کە زۆربەی تەمەنت چاوەڕێت کردبێ وا ئەهاتە بەرچاوم کە خانووەکان نزم بوونەتەوە و تا ڕادەیەك بیرم لای ترس نەمابوو ، وەك ئەڵێن خۆم لە بیر کردبوو کە لە کوێدام هەستیشم کرد باوکیشم زۆر بێ منەتە لەو ڕژێمەی کە زۆربەی براو برازاو کەس و کارەکەی ئەنفال کردبوو ٠

کاتێ گەیشتینە ماڵ مناڵەکان نووستبوون بەڵام دایکیان چاوەڕێمانی ئەکرد زۆر جێی داخمە لە کاتی ئەم نووسینەدا حەزم ئەکرد زۆر بە وردی ئەو ساتانەم لە بیر بوایە وشە بە وشە چی وترا و چی کرا ئێستە تۆمارم کردایە و ئەوانیش ئەمناسن ئەزانن چەند ڕقم لە تەزویرە دەنا ئەمتوانی بە خەیاڵ وێنەیەکی جوانم بنەخشانایە ئومێد ئەکەم لەمەو دوا لە ڕێی ئەوانەوە کە ئەو کاتە لەوێدا بوون و ئێستە ماون شتێ لەو شەوە تایبەتە تۆمار بکەین ٠ ئەو شەوەو ڕۆژی دواتریش ماینەوە و شەوی دووەم گەڕاینەوە بە داخەوە ئەوەیشم لە بیر نییە کە گەڕامەوە هاوڕێکانم چییان ووت ٠

پاش ماوەیەکی تر من و هەمان هاوڕێ و لێپرسراوی یەکەممان جارێتر هاتینەوە بەهەمان شێوەی پێشو سەرتا بۆ هەمان ماڵ و دواتر بۆ ماڵی باوکم و زۆر نزیکی جەژن بوو باوکم لە جاری پێشو شاد تر ئەهاتە بەر چاوم چۆن بڵێی داری ئاواتی بەری گرتبێ و ئەو چەند ساڵەی کە لە هەردوو شوڕشی ئەیلول و شۆڕشی تازەدا ڕەنجی دابوو بە فیڕۆ نەچوو و ئەوە کەوتە بەر دیدەی ئەوانەی خاوەن مەسەلەن ٠ لێپرسراوەکە پرسیاری خەڵکی ئاواییەکانی کرد کێ لە سەرقەڵایە و وا وڵامیان دایەوە کە (کاك حەمۆمینی خەڵکی تەپە سپی ) لێرەیە ٠ ئەم وەڵامە بەجۆرێ کاریگەر بوو لێپرسراوەکە لە خۆشیدا وەکو ئەڵێن هەر خۆی لەبیر چوو ئەوەندە شاد بوو ناتوانم وەکو گەرمی هەستی ئەو کاتە تۆماری کەم ماوەیەك لەو شادییەدا ژیا کاتێ کەمەکێ جەڵەوی نەشئەی بێگەردی ئەو کاتەی گرتەوە دەست وتی ( ئێوە

ناترسن ئاگاداری بکەینەوە؟)ماڵی باوکیشم وتیان (خوا ئەکا ئێوە ناترسن خەمی ئێمەتان نەوێ) خوشکەکەم ئازا هەواڵەکەی گەیاندە کاک حەمۆمین و ئەویش ئەوەندە خۆشحاڵ بوو هەر باس ناکرێ ٠

کاک حەمۆمین یەکێك بوو لەو تێکۆشەرانەی پێش زۆر کەسێ لە دەوروبەری (١٩٧٦)پەیوەندی کردبوو بە ڕێکخستنەکانەوە و پیاوێکی زۆر دیارو جێڕێزی ناو خەڵك بوو مەردی تەنگانە بوو، کێوی ورە بوو چەند بڵێی بە تەگبیر بوو. هیچ کارێ لای ئەو قورس نەبوو، خاوەن بیرو باوەڕی پۆڵاین بوو کوردێکی بێ غەل و غەش بوو دنیا دیدەو خاوەن ئەزموون بوو کەسایەتییەکی زۆر بە هێزی هەبوو. لە هەموو ڕوویەکەوە جێی متمانە بوو، لەوانە بوو کە ڕاوێژی پێ ئەکرا دوو هاوسەر و چەند منداڵێکی ئەنفال کرا بوو پیاوێکی زۆر بە تام بوو قەت لە گفت و گۆی تێر نەئەبووی و وەکو دەریا وا بوو لێڵ بوونی نەئەزانی بە داخەوە دوای ڕاپەڕین بە هۆی ئەو هەموو خەمەوە کە هەیبوو، قەتیش دەری نەئەبڕی تووشی نەخۆشییەك هات و کۆچی دوایی کرد هەزاران ڕەحمەت لە ڕۆحی پاکی بە چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئازیزانیەوە سەری نایەوە ٠

کاک حەمۆمین هات بەڵام چی هات یەکپارچە شادی و خۆشی و ورەدارو ورە بەخش هات .کە ئەو گەیشت کەس نەیزانی خەم بۆ کوێ باری کرد ئەو ناوەی ڕۆشنا کردەوە ڕۆحمانی ڕۆشنا کردەوە هەرچی بنووسم هەر ناگاتە کەمترین ئاستی ئەو، وا باشە وازی لێ بێنم کە لێپرسراوەکە دەنگو باسی هەواڵی منداڵەکانی لێ پرسی ئەو دڵی ئەو و ئێمەی ئەدایەوە و وتی (خوا ئەکا ئێو خۆش ئەبن ئەوان تازە ڕۆین دەنگو باسی ئێوە چۆنە ؟ ) نەیهێشت کۆڕەکە خەمی لێ بنیشێ و یەکسەر چووە ناو باسو تەگبیری ئیش و کارەوە و دوای گفتو گۆیەکی زۆر هەڵساو ڕۆیشت و ئێوارە فیشەکێکی زۆری هێنا و تەگبیرەکە وا کرا خواردن پێداویستییەکان براکەم و هاوڕێکانی بیکڕن و لای بەراوەکەی ئەو دابنرێ و ئێمەیش بە شەو بێین و بیبەین ٠

بۆ بەیانیش هەرماینەوە و چاوەڕێی ئەوکەسانەمان ئەکرد کە بازنەی پەیوەندی نیوان ئێمە و سەرکردایەتی ناو شار بوون چێشتەنگاو وتیان وا تەوارییەکان هاتن مالآن ئەگەڕێن زۆر دامایین نەك لە بەر خاتری خۆمان بەڵکو بە هۆی ئێمەوە مالی باوکم و ئەو چەند کەسە کەمەی لە ئەنفال بە جێ ماون ئەوانیش تیاچوونیان مسۆگەرەو ڕەنگە ئاواییەکەیشی پێوە تەخت کەن کاتێکی زۆر ناخۆش بوو هەرچەند بلێی خەمبار بووین ،چاوەڕوانی دلتەزێنترین کارەساتمان ئەکرد لەم کاتەدا دایکم هاتە ژوورەوەو کەبینی ئێمە زۆر خەمبارین وتی (ئەوە بۆ وا بێتاقەتن ؟) لێپرسراوەکە وتی چۆن بیتاقەت نەبین ؟)دایکم بە ئومێدو یەقینێکی ئاینی تەواو وئاوازێکی زۆر خۆشی خەمرەوێنانەوە وتی (هەر گوێشی مەدەنێ خوا کەریمە بە خوا ئومیدم هەیە لە پەنای خوا و پیاو چاکانەوە هەر هیچ ناوێ) قسەکەی ئەوەندە خۆش بوو وامان زانی لە گەڵ قسەکەی ئەوا خواش دلی ناشکێنێ و هەر بەو جۆرە ئەبێ ،هەر وایش بوو نە هاتن ٠ فەرمودەیەك هەیە ئەفەرموێ( انما الاعمال بالنیات ولکل عمل ما نوی) من خۆم لە ژیاندا زۆر باوەڕم پێی هەیە ٠

دوای نیوەڕۆ دوو کەس هاتن کە ئەوانە بوون چاوەڕوانیان بووین و لە دووری مالێ سەیارەکەیان ڕاگرتبوو پرسیاریان کردبوو کێ لێرە ولآخی فرۆشتنی هەیە خەلکیش مالی باوکمیان پێنیشان دابوون چونکە ئەو ولآخی ئەکڕی و ئەفرۆشت گەرچی مەلا بوو لە ژیانیا تەنها ڕۆژێ نانی مەلایی نەخواردبوو هەرچەندە مامۆستا مەلا کەریمی بیارە مامۆستای بوو زۆریش هەولی لە گەلی دا ئەم ڕازی نەبوو

دامەزرێ، کە هاتن ڕۆیشتنە ژوورێکی تر من زۆر لام گەورە بوون بە وێنەی دەروێشێکی کەمەنکێشی جاران و شێخێکی خاوەن کەرامات زۆر تامەزرۆی دیتنیان بووم و داوام کرد ئەگەر ئەکرێ با تەنها لەحزەیەك بیانبینم و چاوم پێیان کەوت ئێستە هەردووکیان ماون و هەر ئەو جارە ئەو مالەیان بینی ٠

لەم جارەماندا ئامۆزایەکم کە تەنها هەر خۆی لە ئەنفالەکەدا دەرچوبوو داوای پەیوەندیکردنی هەبوو منیش وتم ئەوە تۆو ئەوە کاك(٠٠٠٠٠) بۆ ئەوەی لە قالبی تایبەتی بە دەر بێ ، گەمەو گالتەی زۆرە وتی (ئەترسم ڕۆژێ بێ بمانگرن ) لێپرسراوەکەیش هەرچەندە ئەیزانی بە گالتەیەتی وتی (مەرحەبایەکی ئیمڕۆ بە سەد مەرحەبای خۆشییان نادەین ،خوا ئەکا ڕۆژێکمان ئەبێ ئەو کاتە خۆمان ئەزانین چۆن چاکەی ئێوەیەل ئەدەینەوە ٠بەلام بە داخەوە نەك وا دەرنەچوو بەلکو مافێکی زۆر ڕەوای خۆیشی پێشێل کرا و تا ئێستە هەر بەو ئومێدەم هەلێکم بۆ هەلکەوێ تا ئەو مافەی بۆ ئەو و ئەو چەند کەسەی تریش وەرگرینەوە کە بە ئاشکرا مافیان پێشێلکرا ،ئەوەی ویژدانم ئازار ئەدا ئەوەیە بە ناوچاوی منەوە مافیان خوراوە ئەگەر نا وەك هاوڕێکانیان ئاخر خێر ئەبوون ٠

دوای نانی ئێوارە کەوتینە ڕێ وام لا باش بوو هەردوو هاوڕێکەم لە پێشەوە بڕۆن نیوانمان هەبوو. کاتێ گەیشتمە بەرمالی مام (ئەحمەد قادرە ) ئەو کەسەی کە مەترسیمان هەبوو پێمان بزانێ لەو مالەوە هاتە دەرەوە دەمانچەیەکی بە دەستەوە گرتبوو بە ڕووتی و لە گەلێ دەرچوونیا یەکسەر تەماشای لای چەمی کردو هەردوو هاوڕێکەمی زۆر بە جوانی بینی منیش خۆم کرد بە ژێر عەرەبانەی ئەو تراکتۆرەدا کە کەوتبووە نیوانمانەوە هەتا لە چاو بزر بوون هەر سەیری کردن دیارە بە هۆی سەگوەڕەکەوە زانی شتێ هەیە و واش ئەزانم هەستی بە شتێ کردبوو ٠ گەیشتینە مالی نابیناکە و هەگبەیەك پڕ کرا بوو لە شت لێمان نەوی جولەمان پێ نەکرد لێپرسراوەکە وتی ئەمە چۆن بار ئەکرێ بە لەپە ـوتێ کەمەی هەڕەیەکی داربڕینی دۆزییەوە لە گەورەکان و خستییە ناوکۆی هەگبەکە و خۆی بە تەنیا لایەکی ئێمەیش بە هەرسێکمانەوە لاکەی تریمان هەلگرت و وردە وردە لە حەوشەکە دەرمان کردو لە جۆگەکەی بەرمالیان پێی بردینە خوارەوە بۆ ناو زەلەکان و منالەکانی گەرچی ورد بوون بەلام زۆر ژیر بوون کەرە بەرەلای ئاوایە وێرانکراوەکانیان بەستبووەوە و لە

گەڵمانا بارەکەی بار کردو وتی (ئیتر خوا حافیزتان بێ )کەرەکانمان دا لە بەر و لە چەم کردمانە ئەو بەرو یەکێکمان لێی خورپین و دووانمان گەڕاینەو بۆ ناو دارەکان و چەند کەسێ بڕکەیەك گێسکی دانییان گیر دابوو خەریك بوو لە ناو (خڕەکە )دەرئەچووین لە سەر ماڵی خاوەن دەمانچەوە پلاجیکتۆرەکەیان سوڕا ند و ڕوویان کردە ئێمە و یەکێك لەوانە لە گەڵ گێسکەکاندا هاتبوو هەتا توانی ڕای کرد و هاوڕێکانی بە جێ هیشت گێسك و کەرەکانمان دا لە بەر و هەرچەندە دەنگیان مەترسی هەبوو ڕەبیەکان پێمان بزانن. باش بوو هیچ ڕوی نەدا و گەیشتینە لای هاوڕێکانمان لە کیمیاییەکە کە حەشارگەیەك بوو لە نیوان (هۆمەرمل)و(بەلەگە)دا ئاوەکەی ئەوەندە پیس بوو، هەرکە ئەتخواردەوە ئەبوایە یەکسەر ڕات کردایە بۆ سەراو کردن و پاشماوەی دانیشتنەکەیش بۆنێکی زۆر پیسی لێئەهات و ڕەنگە کەیشی ڕەش بوو لەم حەشارگەیەدا (١٢)مریشکمان هەبوو هێلکەیان ئەکرد ئەو هێلکانەو هەر شتێکی تر کەس نەیئەبینی تا دوای ڕاپەڕین یەکێکمان خۆی پێی لێنا هەمووی ئەو ئەیخوارد کە هەر لە حەشارگەی چێشتلێنانەکە ئەخەوت . هەر ئەو شەوەی گێسکەکانمان گەیاندە جێ بەیانی کە هەڵسای نەمابوون و گشتمان کەوتینە گەڕان هەرچەندە شەویش هەر ڕێمان کردبوو باش بوو دۆزیمانەوە و یەکێکیمان سەر بڕی و یەکێکمان چلفرای لێ دروست کرد .

١٢/١٧ شەوەکەی هەر باران بوو لە پڕێکدا ئاو هاژەی کردە ناو حەشارگەی خەوتنەکەمانەوە و هەر ئەوەمان پێکرا خۆمان دەرباز کەین و هەرچیمان هەیە بووە ژێر ئاوەوە تەنانەت ئەدیداسەکانی چەند کەسێکمان بەلاّم زیاتر نیگەرانی حەشارگەی خواردن و چێشتلێنانەکە بووین هەم لە بەر خواردنەکان و هەمیش گێسك و مریشکەکانی تێیا بوو شەهید کاکە ئەحمەدی هەمیشە خۆنەویست خۆی کردە ژوورا بۆ دەربازکردنی گێسکەکان چونکە هەم بیزمان بوون و هەم بەشی ئە دەستەیە بوو کە نەهاتبوون بۆی کە ئەو خۆی کردە حەشارگەکەدا شەهید کامەران

و یەکێکی تر خۆیان خستە ناو ئەو جۆگەیە کە ئاوەکەی لێوە ئەچووە ناو حەشارگەکەوە ،و لە حەیبەتا کفرێکیانیش کرد چونکە لە خنکانەوە نزیک بوو هەردوازدە مریشکەکەو چەند گێسکیك ئاو بردنی دوانیانمان گل دایەوە و یەکێکیان بە پەلە گەیشتە چەقۆداو ئەوی تریش مایەوە ٠ئاوەکە لە مریشکەکانی گەیاندبووە پردەکەی (قوری چایی ) و کاتێ سەرنشینانی سەیارەیەك مریشك و گێسکی بینیبوو ئاو لای دابو زۆر سەریان سوڕمابوو ٠ بە پێی پەتی و بەبێ پشتوێن و بێ جامانەو بێ تاقم و تفەنگ دەشتمان دا لە بەر بۆ چەند خانووەکەی هەردەکەی هۆمەرمل لەوێ ئاگرێکمان کردەوەو خۆمان وشك کردەوە و ڕۆیشتین بۆ حەشارگەکەی سەروی ئەم خانووانە کە گەیشتینە لای ئەوانەی کە شەو لەوێ بوون بۆمان دەرکەوت ئەوانیش بە درێژایی شەو هەر خەریکی ئاو دەردان بوونە ٠

جارێکی تر ڕۆیشتین بۆ سەرقەلاَ و وامان بە باش زانی خۆمان تەواو لە هەموو دیمەنێك بپارێزین کە شێوەی پێشمەرگایەتی پێوە بێ بۆیە من و ئەو کەسەی تر ئەم جارەو چەندان جاری تر بردمان و خزمەتی ئەوتۆمان کرد کەس نایکا و زۆر زۆر سپلە دەر چوو هەریەکەمان بە کراس و شەرواڵێکەوە ڕۆیشتین خەریك بوو لە و سەری پردەکەوە ئەهاتینە سەر جادەکە سەگێکی زۆر تێمان ئالاَ و هەر ئەوەمان پێ کرا خۆمان بە زەوییەکەوە نوساند بەو ئومێدەی لێمان دوور کەونەوە ماوەیەکی باش هەر بەسەرمانەوە کەڵەکەیان کردبوو بەردەوام ئەوەڕین و سەرمایەکی چاك چووە گیانمانەوە و کاتێ سەگەکان لە کۆڵمان بوونەوە و هاتینە ناوماڵەکان لە بەر ئەوەی گڵۆپێکی گەورە ئەیدایە ناو چاومانا ئاگامان لە بەر پێمان نەبوو کەوتینە ناو جۆگەیەکی چڵکاوەوە و کاتێکیش گەیشتینە نزیکی ماڵی باوکم چەند کەسێ لە هاوڕێ و هاوسێکان لە دەرەوە وەستا بوون بۆیە ئەولاترمان گرت و چوینە ناو مەرکەزە کۆنەکە و بیرم کردەوە کەس هاوڕێکەم ناناسێ و ڕێم نیشان دا لە شوێنێ ترەوە خۆی بگەیەنێتە ماڵ و ئاگاداریان بکاتەوە تادواتر خۆشم ئەڕۆم دوای ئەو

زۆری نەبرد براکەم کە زۆر زۆر پێمانەوە ماندو ئەبوو هات بە دواما وتی (بێڕێوە کەس وەدەشتۆ نییە ) ٠

گشت جارێ ڕوداوێ ئەهاتە پێشەوە جارێکی تر کە هاتینەوە لای مزگەوتە کۆنەکەوە و بە بەر ماڵی نابیناکەدا تێپەڕین و لەولاتر چەند منالێ ڕوبەڕومان هاتن و منیش لە ترسی ئەوەی بمناسن بەرەو دوا گەڕاینەوە زۆر جار مێشك باش نایپێکێ دەنا ئەبوایە بمزانیبایە ئەو منالأنە منیان هەر نەبینییە بەرەو مزگەوتەکە ڕۆیشتین و لە پڕێکا یەکیك دەرکەوت بەرەو لامان ئەهات ئەمجارەیان بە پەلە تر بەرەو لای منالەکان گەڕاینەوە و هەوڵیشمان ئەدا خێرایش بڕۆین بەلأم وا نا گومانمان لێ بکرێ لە ماڵی نابیناکە تێپەڕین و بە ترسێکەوە سووکە ئاوڕێکمان دایەوە تەماشامان کرد ئەوەی لای مزگەوتەکە خەریکە تەکمان لێ هەڵئەچنێ زۆر حەزمان ئەکرد ئەو هەنگاوەکانی خاو کاتەوە بەلأم تا ئەهات ئەو نزیکتر ئەبوەوە ،و ئەوەندەی نەبرد گەیشتە لاشانمان و خۆ حاڵەتی وا بە دەم ئاسانە بیهێنە پێش چاو لە بارو دۆخێکی وادا و تووشی هەڵوێستی وا بێی حالی دەروونت ئەبێ چۆن بێ ئیتر هیچ بوارێ نەما ئەوە نەبێ خۆت بدەیتە دەستی قەزاو قەدەر و ناشزانی ئەنجام چی ئەبێ وازمان لە هەمووی هێنا زۆر مەمنونین ئەو کەسە تێپەڕێ و تەنها وشەیەك قسەمان لە گەڵ نەکا کەچی گەیشتە لامان و بە ئەسپاییەکەوە وتی (خۆتان تێك مەدەن هیچ نییە هەر ئاسایی بڕۆن و هەریەکە چنگێ گوڵە بەرۆژەی کردە مشتمان ) کە سەیرمان کرد یەکێکە لەوانەی ناو شارمان و ئیتر هەناسەیەکی تەواومان دا و لە دڵە خورپە کەوتین وتی زانیم سەگەکان بە ئێوە ئەوەڕن یەکسەر هاتم بۆ بان چەمەکە ٠

شەوێکی تر هاتینەوە و لای مزگەوتەکە تووشی پیاوێك بووین، و ماوەمان نەبوو بگەڕێینەوە وتمان ئەمجارەیان ئاشکرا ئەبین دامانە لایاو من دەسم گرت بە ولایەی دەمو چاومەوە، کە کەوتبووەلای ئەوەوە هیچمان نەوت و تێپەڕین و ئەویش زۆر

ئاسایی بوو زۆر سەرم سوڕما کە لە ماڵ باسم کرد وتیان نەشتەرگەری چاوی کردووە

شەوێکی تریش کە هاتبووینەوە لە گەڕانەوەدا نزیک ئەو شوێنەی خۆم کرد بە ژێر عەرەبانەدا تووشی چەند کەسێ هاتین هەر ئەوە نەبوو شانمان بدا لە یەک، نە ئەوان ئێمەیان ناسی و نە ئێمەیش ئەوانمان ناسی ،بەڵام ئەوان لەوە ئەچوو گومانیان کردبێ ئێمە خەڵکی ئاوایی نین ، هەتا ڕۆین هەر بەریان ئەکردە دواوە گیان بەوە بوو تاریکە شەوێکی زۆر عەجایەب بوو ٠

شەوێکیان هەر لە خۆمانەوە دڵمان لێی دابوو، کەسێک ئەمانبینێ وتمان جلی سەربازیمان بۆ بێنن هێنایان بە (بێرییەکەیشیەوە) بەڵام لە جیاتی پۆستاڵ ئەدیداسمان لە پێدا بوو، یەکێک لە دراوسێکان لە هاتندا منی بینیبوو بەڵام تەواو دڵنیا نەبوو چاوەڕێی کردبو، لە سەر دەڕاسەکەی بەرماڵ لە گەڵ یەکێکی ترا کە دەرچووبووین بە جوانی ئێمەی بینیبوو بەڵام خۆی لێ ئاشکرا نەکردین کەسێکی باشیش بو،

هەر ڕووداوێ کە ئەهاتە پێشەوە ئەبوایە چارەسەری بۆ پەیدا بکرایە، شەوێکی تر کە هاتبوینەوەو ئەمانەویست دەرچین بەرانبەر دەرگاکەمان شوانێک لە سەر قەرەوێڵەیەک لە ناو ڕانەکەداوا پاڵ کەوتووە، کە رووی لە ئێمەیەو زۆریش لە دەرگاکەوە نزیکە و هەر لە ماڵ بێینە دەر ئەمانبینێ ، و ئەیشمانناسێ یەکێکمان نارد بە ناوی گەمەو گاڵتەوە خۆی دا بە سەریا و بەرچاوی گرت و ئێمەیش بە پەلە بۆی دەرچوین هەر هەستیشی ئەکرد ٠

خواردنمان هەر ئەو خواردنانە بوو، کە لە خەڵک بەجێمابوو، ماوەیەک لەبەر خۆر مابووەوە و باشیش هەڵنەگیرا بوو، بۆیە هەم کاتی بە سەر چوو بوو ، هەم تام و بۆن و ڕەنگی خراپ بوو بوو، بەڵام کە پەیوەندیمان بە ناو شارەوە کرد زۆر مەردانە کەوتنە خزمەتکردنمان بە جۆرێ کەس ناتوانێ لە بیری بکات ،و لە هەموو

جۆرە خواردنێکی تازەو باشیان بۆ ئەناردین و لەوەو دوا هەر جارێ لە یەکێکیان چێشت لێ ئەنرا و هەمیشە ئەو پرسیارە خۆی ئەهێنایە پێشەوە (چێشتی ئیمڕۆ لە تازەکەیە یا کۆنەکەیە ؟) جارێکیان لە سەرقەلاَ گەڕاینەوە پرسیار کرا چیتان خوارد هاوڕێکەم وەسفی ئەو برنجەی داوە کە خواردبوومان، یەکێکمان بە پەلە وتی لە برنجە تازەکە یا کۆنەکە ؟و پێشمەرگەکان دایانە قاقای پێکەنین ٠

سالّی ١٩٨٩ – ١/١٢ بەزمی هاتنەوەکانمان زۆرن هەر کۆتایی نایەن و زۆربەیشیان پڕن لە خەم یان ماندوبوون ، یان دلّەڕاوکێ شەوێکیان هاتین بۆ بەراوەکەی کاك حەمۆمینی ڕەحمەتی و بارمان بار کردو هەر ئەوەندەمان خۆش بوو پشت پێمان هەلّکرد باران دای کرد دنیای کردە قوڕ و زۆر خراپمان بە سەر هات تا گەیشتینە یەکێ لە حەشارگە کانمان، کە ماوەیەك بوو چۆلّمان کردبوو هەر ئەڕۆیشتین و ئەکەوتین لە جارو چەند جارا نەما و شەوارەیشمان کردبوو بەلاَم (کەرە گوێلەق)ی چاوساغ زۆر لەوەو دوور بوو هەلّەبکات. بەلاَم ئەوەی هەبوو ڕاست ئەڕۆیی و چەمانەوەی نەبوو شەوێکی زۆر تاریك بوو، لە کەنێکی بەرزەوە کەوتمە خوارەوە نازانم چۆن شوێنێکم نەشکا. ئەو نەبوایە مەگەر تا بەیانی قورەشێلەمان بکردایە بە هیمەتی ئەو گەیشتینە ئەو حەشارگەیە و وەکو ئەلّێن دەزوی وشك لە گیانمانا نەمابوو ، بە لەپە کوتێ شقارتەیەکمان دۆزییەوە بەلاَم ئاوەچۆڕەی کەل و پەل و دەسمان ئەویشی تەڕکرد و ئاگرمان بۆ نەکرایەوە هەر بە لەپە کوتە دوو دۆشەکی ئیسفەنجمان کەوتە بەر دەس و زۆربەی جلەکانمان داکەندو بە بێ جل گوایە خەوتین ئیتر خۆت بە خەیالّ ئەو خەوە بێنە پێش چاو ئەبێ چۆن بێ من خۆم کردە بەر بەلاَم هاوڕێکەم هەر بە کورتە شەوالّەکەوە هات بۆ لای هاوڕێکانمان کە چاویان پێی کەوت تاوێ باش پێی پێکەنین ٠

زۆر جار ڕووداوی وا ئەهاتە پێشەوەو لە بیری کەسدا نەبوو بەلاَم نیشانەی ئەوە بو ڕژێم چەند تەنگاو بووە بەو پێشمەرگانەی کە ماونەتەوە لە گەرمیاندا ڕۆژێ لە

ڕۆژان لە ئاواییەکی وەکو فەقێ مستەفادا (١٢ ) کۆپتەر نیشتەوە لە کاتێکدا ئەوەی بڵاو ئەکردەوە کە پێشمەرگە نەماوە ٠

١٩٨٩/١/٢١ئەو بەیانییە پاقلەی وشکمان کوڵاندبوو. کە لە باخەکانی هۆمەرمل هێنابوومان بە چاییەوە زۆرمان لێ خوارد و هێشتا کاتژمێر (٨)ی بەیانی بوو فاسولیا پێ گەیشتبوو زۆری نەما بوو برنجیش پێ بگا، ئەوەندەمان زانی کۆپتەر پەیدا بوو لێپرسراوەکەمان کەمێ لە سەرووی حەشارگەکەوە خەریکی چاودێری دوژمن بوو، هاتە خوارەوە و شەهید مەجید و شەهید کاکە ڕۆیشتبوون بۆ ملەی نیوان ئێمەو ڕوکاری بەلەگە و کەرەکانیش بەرەڵا کرا بوون من لە دەر کونەکەدا بووم ، ئەوەندەمان زانی کۆپتەرێ بە دۆڵەکەدا بەرەو لامان سەرکەوت و یەکسەر دەستی کرد تەقەکردن و پێشتریش هەر تەقەی ئەکرد و نەمانئەزانی تەقە لە چی دەکات، بوون بە دووان و هەتا توانییان تەقەیان کرد دابەش بوو بووین بە سەر سێ حەشارگەدا لێپرسراوەکەمان سەرەتا بانگی کرد وتی بە (ئار .پی.جی)یەکە لێیدەین ،و دوای کەمێ وتی لێی مەدەن لەناو حەشارگەکەی ئێمەدا یەکێکمان دای لە میل و یەکێ ترمان کوڕانە لە پشتەوە باوەشی لێی داو وتی تەقە مەکە بەشکو ئەوان هەر لە ڕەشی تەقە بکەن و نەیهێشت تەقە بکات، کەسمان بچوکترین ئومێدمان نەما بە ژیان بەڵام کەسیش خۆی تێك نەدا بە هەموو بیرکرنەوەیەك بۆی ئەچووی ئەبوایە کەسمان دەرنەچین مەرگ بەر دەرگای پێ گرتبووین بەڵام لە گەڵ خۆیا نەیبردین ؛ بە ئارەزوی خۆیان هەرچییان پێ بوو دایان باراند بە سەرماندا پەردەمان بە سەر دیوارەکەدا داکوتا بوو لە بەر خۆڵ هەمووی ونجڕ ونجڕکردبوو کەچی یەکێکمان بریندار نەبوو، ئەو دووانەمان کە ڕۆیشتبوون بۆ چاودێری ڕێی هۆمەرمل فریانەکەوتبوون بگەنە لامان هەر ئەوەیان پێ کرابوو تاقم و تفەنگەکەیان خستبووە ژێریان و لە سەردەم خۆیان دابوو بە زەویدا باش بوو بە دی نەکردبوون چەند هەناسەیەك بوو سنوری نیوان ژیان و مەرگ زۆر زۆر کەم بوو بەڵام ئەوەی لە

ئەقڵی کەسماندا نەبوو ئەوە بوو. وازیان  لیّ هیّنایین و بە جیّیـان هیّشـتین  ئیّمـەیش یەکسەر بۆی دەرچووین بەرەو ئەو کونەی کە لەو دیومانـەوە بـوو، کـاتیّ گەیشـتینە لای تەماشـامان کـرد دوو سـیّ کەسـیی زیاترنـاگریّ  لیّپرسـراوەکەمان گەیشـتە ئـەو باوەڕەی کە کاتی هەندیّ قسە هـاتووە، و بـیّ شـڵەژان و تیّکچـوون وتـی (بـرادەران کاتیّ ئیّمە پیّشمەرگایەتیمان هەڵبژارد شەهید بوونیشمان دانـا بـوو بـۆ خۆمـان ئـیتر ئەوە حاڵەکەیە وەك ئەبیینن دەرباز بوونمان نییە تەنها ئەو تکایەم لیّتان هەیە هـەتا تـەواو ئـەبن تەقـە بکـەن چـونکە دوایـی تەرمـەکانمان ئەبـەن بـۆ خورمـاتوو ئەگـەر مەخزەنـەکانمان پڕفیشـەك بـیّ میّـژوو لـە سـەرمان ئەنوسـیّ مانـای وایـە تەقـەمان نەکردوە و هەتا ئەشتوانن بڵاو ەبکەن هەتا بڵاو تر بین درەنگ تر تەواو ئەبین ) یـەك تۆزیّ دوای ئەمـە وتـی کـەس شـویّنیّ شـك نابـا زەلـیّ قـەرەمیّکی هـەبیّ و ئەوانـەی خەڵکی ئەو ناوە بوون وتیان ئەگەر بتوانن سەعاتیّ ڕابکەن هەیـە ئـەویش وتـی دەی ڕاکەن. هەروایە وت وەك ئاسك پیّشـمەرگە لەچـاو گـووم بـوو، مـن و لیّپرسـراوەکە و یەکیّکی تر کەوتینە دوای گشت و (بی.کـەی .سـی )ەکـە کەوتـە لای مـن ، کـاتیّ لـە خوار ڕیّکەی هۆمەرمل – بەلەگەوە چاومان کەوت بە چەند بنە زەلیّك بـۆ ئـەو سـاتە جوانترین دیمەن بوو ،کە ئەیتوانی شادییەك ببەخشیّ کە هیچ شتیّکی تر نەیئـەتوانی ببیەخشیّ ئەو بنجە زەلانە وەکو ئەوە وا بوو هاتبن بە پیریمانەوە بـۆ ڕزگارکردنمـان و بەتەنگانەکەمانیان زانیبیّ هەرچی وشە هەیە ناتوانیّ وەسفی ئەو شادییە بکـا. کـە ئەو ساتە بووە میوانمان حـەزمان ئـەکرد یەکـە یەکـە گشـت ئـەو بنجانـە مـاچ کـەین مەسەلەکە هەر ڕزگاربونمان نییە لە مـەرگیّکی مسـۆگەر ئـەی مانـەوەی ئـەو کۆمەڵـە پیّشمەرگە کە ڕژیّم گەورەترین ئاواتی نەمانمان بوو کەمە ؟

ئەوە چۆن لـە حەکایەتـە کۆنەکانـدا کابرایـەکی زۆر هـەژار چـەند کوپەیـەك لـیرەی ئەدۆزییەوە یان باز هەڵئەدراو ئەنیشتە سەر شـانییەوە ئەکەوتـە چـی خۆشـییەکەوە ئەوا ئیّمەیش کەوتینە ئەو خۆشییەوە ، ئیتر وەك ئەوە وابوو ڕزگارمان بـووبیّ بـەڵام

هاوڕێکانمان هەر ڕایان ئەکرد ئەوان شارەزا بوون هەر ڕۆیشتین تا گەیشتینە ئەو ژێر کاچە کە ماڵەکەی ( شەهید نازمە بچکۆل)ی تێدا بوو. هەڵیان چنی بوو دەرگایشان بۆ دانابوو، کە چووینە ژوورەوە یەکێکمان خۆی گەیاندە نرخی چەقۆ و پانەوە بوو هەر وتیان چیتە دەنگی نەکرد شەهید کامەران کەمێ بە دەنگی بەرز وتی چیتە بۆ دەنگ ناکەی ماڵت برمێ ئەوجا ئەویش تورە بوو وتی خەریکە ئەمرم بۆ بڕوا ناکەی ؟ بووە پێکەنین

کۆپتەرەکان هاتنەوە بەڵام ئەم جارەیان بوو بوونە (٥)کۆپتەر و زۆر نزم ئەسوڕانەوە ، باش بوو ئیمە گەیشتبووینە هەقە جێ و خەممان نەمابوو ئەمجارە خوا لێی لادابن بەڵام تەنگی بە دەستەیەکی ترمان هەڵچنی بوو ئەوەندە لە ناکاوا گەیشتبووە سەریان حەرەسەکە فریای ئەوە نەکەوتبوو بێتە خوارەوە بۆ ناو حەشارگەکە هەر ئەوەی پێ کرا بوو لە ناو چاڵی چاودێری کردنەکەدا خۆی مات کردبوو ئەو بنجگەیش کە تایبەت بوو بەو شوێنە دابووی بە سەر خۆیدا و کۆپتەرەکانیش چەند جارێ بە دەوری ئەو گردەدا سوڕابوونەوە کە حەرەسەکەی بە سەرەوە بوو بوو بە هۆی ئەوەوە کەرەکە لەترسی کۆپتەرەکان خۆی بۆ ناو حەشارگەی پێشمەرگەکان ئەکوتا و ئەوانیش ئەیاندا بە لوتیا و ئەیانگێڕایەوە و ئەمجارەیان بەرەو خوار ئەیدایە دەمی بە دۆڵەکەدا و جارێکی تر کۆپتەرەکان ئەهاتنەوە هەم کەرەکە ئەگەڕایەوەو ئەوە چەند جارێ دووبارە بوەوە ،بەڵام ئەم حەشارگەیە ئەوەندە جوان شوێن گومکێ بە شوێنەواری هەڵکەندن و قوڵنگەکاریەکانی کرابوو نەك لە ناو کۆپتەرەوە تەنانەت بە سەریشیەوە کەس گومانی نەئەکرد، بە داخەوە یەکەم ساتەکانی ڕاپەڕین کارێ وا نەکرا ئەو شوێنەوارە مێژوییە گرنگە هیچ نەبێ بە کامیرا وێنە بگیرێ تاکو بۆ ئەمرۆ بمێنێتەوەو شانازی پێوە بکرێ ئەبێ گلەیی لەو کلتورە بکەین کە لە شتی لەم بابەتەدا زۆر زۆر کۆڵین و

نەتەوەکانیش بۆ مێژو هەر ئەمانە بە گرنگ ئەزانن کۆپتەرەکان کە هیچیان لێ حاڵی نەبوو بوو وازیان هێنابوو .

جێی داخە وەك وتم کلتورێکی باشمان نییە لە بەڕێوەبردنی وڵاتی خۆماندا بە هۆی ئەوەوە چەندان سەدەیە ژێر دەستەین و دوژمن فەرمانڕەوامانەو بواری فێربوونیان نەداوین ، دەنا زۆر ئاسان بوو تەنها کامێرایەکی ڤیدیۆیی هەبوایە وێنەی هەندێ دیمەن و دیاردەمان بگرتایە ، بە تایبەتی بۆ ئەو شتانەی بە ئاسانی ناچن بە نەقڵەوە و گێڕانەوەیشی ئەمانەتە وەکو ئەو مریشکانەی هەمانبوو هەرکە کۆپتەر ئەهات و ئێمە بە پەلە شتەکانمان ئەشاردەوەو لە دوایشدا خۆمان ئەشاردەوە ئەوانیش هەروا فێر بووبوو ن کە ئێمە دیار نەئەماین ئەوانیش ئەچونە ژێر ئەو چیغەوە کە دابوومان بەسەر چاڵێکدا هەر تایبەت بوو بە ئەوان، یان کەرەکانمان لەودواییەدا فێربوون هەردوو دەستیان بنوشتێننەوەو لە گەڵ سەریاندا لە پێشەوە ڕەوانەی بکەن پشتیان کورکەن و بچنە ناو حەشارگەی دەم بچوکەوە و لەناوەوە ڕاست ببنەوە .

لە ژیانێکی زۆر نا ئاساییدا بووین هەتا بڵێی هەڵکردن لە گەڵیا قورس بوو، هەموومانیش یەك ئاستی بیرکردنەوەمان نەبوو بۆی ، هەبوو تیاماندا بێ لە هەرەسی مەعنەوییەوە جارجارە نزیك بووبێتەوە بۆیە هەندێ وتەی بەهێز بۆ کاتی وا زۆر باشە و، وتنیشی بەشی خۆی هەر بڕشتی هەبوو ، بەمەبەستەوە دروشمێکم هەبوو بۆ ورە پێدان ئەموت (ئەم قۆناغەی خەبات کە ئێمەی تێکەوتووین کۆلێژی کەڵەپیاوانە کێ ئازایە لێی دەرچێ بە سەر کەوتوویی _تەخەڕوج بکات )یان هەرکێشەیەك بوایە چەند گەورەیش بوایە ئەموت (کەی مشکیلەیە) زۆر دووبارەم ئەکردەوە تا ڕۆژێکیان پێشمەرگەیەك تەق دای لە جەرگی و وتی (ماڵت برمێ ئەی چی مشکیلەیە؟) زانیم تەواو پڕبووە وتم (هیچ شتێ مشکیلە نییە) . دوای نیوەڕۆ کاتێ خەمی کۆپتەرمان نەما لە ماڵەکەی شەهید نازم هاتینە دەرەوەو نازانم چیمان

خوارد ،بۆ نیوەڕۆ کات دەوروبەری (٢) ی پاش نیوەڕۆ بوو، گوێمان گرت لای خوارمانەوە دەنگ دێ و دواتر دوکەڵیش بەرز بووەوە ،بۆمان دەرکەوت دوژمن لای خوارەوەیشەوە هاتووە، زۆر لێمانەوە نزیکە و تەکیان لێمان هەڵچنیوە لێپرسراوەکەمان و دووانی تر ڕۆیشتن بۆ چاودێری ،و ئێمەش خۆمان ساز دا بۆ ڕوداو ئەوەندەی نەبرد ئەفسەرەکەو موستەشارەکە چوونە سەر گردێکی بەرانبەرمان و جوان لە ئێمەوە دیار بوون و وامان دانا ئەوان ئێمەیان بە دی نەکردبێ و سەربازەکانیش بەرەو لای ئێمە ئەهاتن تەنها شەش حەوت هەنگاوێکیان مابو بگەنە بەرانبەر(شەقی شەفە) کە ئێمەی تیابووین و یەکسەریش تەقە دەستی پێ ئەکرد لەو کاتەدا ئەو سێ کەسە کە ڕۆیشتبوون بۆ چاودێری لە بەرزاییەکەوە گەڕانەوە ڕێك کەوتنە بەرانبەر ئەفسەرەکەو موستەشارەکە ، ئەفسەرەکە بێرییەکەی بەسەر پەنجەیەوە بوو ئەیخولانەوە ، چاومان لێ بوو کابرای شاڵ لە بەر ئاماژەی کرد بۆ سێ کەسەکە و ئەویش بە دەس بەو ڕیتمەی کە ئەوەی ئەگەیاند بلێ حەی حەی تەماشای ئەم بەدبەختانە چۆن خوێنی ملیان ئەفڕێ ئەفسەرەکە ئەمەی بینی ئەوسەربازانەی گێڕاوە کە خەریك بوو ئەگەیشتنە بەرانبەرمان و لە ودیوی گردەکەوە بردنی و لە مەرگێکی لە سەدا سەد مسۆگەر رزگاری کردین لە کاتێکدا موستەشارەکە لەوە ئەچوو وای پێ خۆش نەبێ ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەکە ئەو ڕۆژە لەو شوێنەدا بووین هەتا هەتایە قەرزاری ئەو ئەفسەرەین چونکە ئەوە نەبوو هیچ گومانیکی تیا مابێ لەوەی ئێمە پێشمەرگەین و ئەوانیش ئەوەندە زۆر بوون و کات و شوێنیش ئەوەندە ناله بار بوو تیا چوونمان زۆر مسۆگەر بوو ٠

نوسینی بچوکترین مێژوو ئەمانەتێکی گەورەیە وا ئەزانم خۆ لادان لە هەر بەشێکی گێڕانەوەکەی هەم ناپاکییە لە ئەمانەت و بۆ ویژدان و ئاکاریش لەکەیە و لە دەسدانی بیلایەنیشە، لێپرسراوەکەمان کە بینی دەورە گیراوین و دەرچوونمان مەحاڵە وتی (من خۆم ئاشکرا ئەکەم و تەقەیان لێ ئەکەم و هەرچەنێ بتوانم ڕائەکەم

و ئەوانیش دوای من ئەکەون و لە ئێوە دوور ئەکەونەوە ڕاستە من ئەکوژرێم بەڵام ئێوە رزگارتان ئەبێ ) ئێمە ڕازی نەبووین ٠

جارێکیان لەم (شەقی شەفە)یەدا بووین بۆ ئاگرکردنەوە پێشمەرگەیەکمان بێشکەیەکی هێنا بۆ سوتاندن چونکە دارو چیلکەمان نەبوو هاوارێکی بێدەنگ لە ناخمەوە هەڵسا و زۆر پاڕامەوە لە هاورێکانم کە ئەو بێشکەیە نەسوتێنن وام ئەزانی لە گەڵیا هەموو ئینسانییەتم ئەسوتێ و ڕووزەردی ڕۆژی ئاخیرەت ئەبم بەرانبەر گشت منالە ئەنفالکراوەکان ،خۆهەڵکێشان نییە گەر بڵێم ئامادە بووم نەك جارێ سەد جار دەستی ئەو کەسە ماچ کەم ئەگەر ئەوە مەرجی وازهێنانەکەی بوایە، ئەوانیش گەورەیی خۆیان کردو دڵیان نەشکاندم ، هەر لەو شوێنەدا دوو جووت پێڵاوی منالانەی بچووك و تەتکەی یاریم بینی و لە دڵی خۆمەوە وتم ئەبێ خاوەنی ئێستە لە کوێ بێ ٠

ئێوارە لە گەڵ دەستەکەی تردا کە یەکمانگرتەوە وەك ئەوە وابوو لە زۆر زووەوە یەکمان نەدیبێ و ئەوەی تا ئێستەیش لێی تێنەگەیشتم ئەوە بوو لێپرسراوەکەمان وتی بەیانی ئەڕۆینەوە بۆ هەمان حەشارگە کە کۆپتەرەکان تێیدا تەقەیان لێ کردین سەیرەکە لەوەدا بوو شوێنی ترمان زۆر بوو نەمزانی حیکمەتەکەی چی بوو ؟هەموومان پێمان ناخۆش بوو بەڵام کەسیش هیچی نەوت تەنها یەکێکمان نەبێ تەواو هەڵچوو وتی (وەڵا ئەمە ڕاست نییە ) لێپرسراوەکەیش بە زەردە خەنەیەکی تایبەت و مانادارەوە وتی (بەخوا ئەگەر زانیمە گشتمان کوژرایینە بەیانی ئەبێ تا ئێوارە لەوێ بمێنینەوە ) کۆڕەکە کپ بوو، هەرواش بوو شەوەکەیش و بەیانیش تا ئێوارە لەوێ ماینەوە .

ئەڵێ ئەوەی لای بەنە خەیاڵە لای خوا بەتاڵە ، شەوی پێشوو پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی هاتبوون بۆ لامان کە حەشارگەکەیان لە نزیك (توکن ) بوو تا شەوگار زرنگایەوە هەر دەمەتەقێ کرا لە بارەی زۆر شتەوە ،بە تایبەت لە بارەی ئەوەوە

گوایە کودەتایەك بەڕێوەیە ولەم نزیکانەدا بەرپا ئەکرێ ڕۆڵی ئەم پارتیزانانە چی بێ بۆ شارەکان بە حیسابی کەلیخان زۆر مسۆگەرە دوای دووکوتی شەوگار چێشتی ئێوارە گەرم کرایەوە ، پێشمەرگەکان زۆر حەزیان لە قسەکانی شەهید ئەحمەد چوارشاخی بوو کە باسی دەسپێکردنی ئەنفالی قۆڵی داوێی ئەکرد، ئەو داوێیە ماوەیەك من ئەموت خۆزگە عەشیرەتیش وەك حیزب وا بوایە ئیستیقالە و ئینتیمای تیا بوایە من ئینتیمام ئەکردە ئەو عەشیرەتەوەوە کە هەم خەڵکەکەی و هەم کەرتی پێشمەرگەکانیان زۆر کەس خۆزگەی بە ئازایەتییەکەیان ئەخواست کاك ئەحمەد وتی( هاوڕێیەکمان موناقەشەی لە گەڵ جاشێکدا ئەکرد وتم کورە بیکوژە ئێستە کەی وەخت مناقەشەیە) .

باش بوو ڕۆژی سێیەم ڕۆیشتین بۆ قاتە قاتەکانی پشت (باوەشاسوار) و (دەروەن تاڵە) و تەواو نزیك بووینەوە لە شارەکە لە شوێنێکی بیناودا کە کەس گومانی لێ نەئەکرد بەڵام هاتنی ڕانێك نارەحەتی کردین ،لەوە ئەترساین شوانەکە بمانبینێ تاکو ڕانەکە لەوێ بوو کەس خۆی دەرنەخست ،و کەڕان نەما لە کون دەرچووین و( ڕاشی و دۆشاو)ی خۆمان خوارد بە نانەوە و کۆپتەر هات .بەڵام لیمانەوە دوور بوو ، بەڵام دەستەکەی ترمان کە چوو بوون بۆ (چەم شەرەف)خراپیان بەسەر هاتبوو بەدەس جاشەوە زۆر کەمی مابوو دەسەو یەخە ببنەوە تووشی ڕاکە ڕاکەیەکی چاك هاتبوون .

ئەو حەشارگەیە کەخەریك بوو تیایدا هەمومان بکوژرێین زۆر سارد بوو ناومان نابوو (قەندیل) و بۆ ئەوەی ئەو کارەساتەم لە بیر نەچێتەوە یەکەم کوڕمان کە دوای پێنج خوشك لە دایك بوو ناوم نا (قەندیل) کە ئەوەمان بەسەر هات وا پێویستی ئەکرد ماڵەوەمان ئاگادار کەمەوە بۆیە هەر ئەو ئێوارەیە ڕۆیشتم بۆ سەرقەلاو هەمان شەویش گەڕامەوە

بۆ بەیانییەکەی هێزێکی زۆری دوژمن هاتە (بەلەگە)و شەویش تیایدا مابووەوە دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن ئێمەیش چووینە بەلەگە و لە ناو ژێر زەمینی ماڵێکدا دەسنووسێکمان دۆزییەوە شیرین و فەرهاد بوو بە هەورامی وابزانم ئەوەی (خانای قوبادی)یە کە ڕۆیشتین بۆ ئێران دامە دەستی کاک حەمەی حەمە باقی لە (سەقز)لە سەری نوسرا بوو (مەلا محەمەد زنانەیی)شەهید کاک ئەحمەد وتی ئەوە مەلایەك بوو ئەسپێکی بوو هەمیشە هەگبەیەکی پڕلە کتێبی ئەنایە سەری و ئەهات بۆهۆمەرمل ٠

١|٢ ڕێکردنمان تەنها هەر بە شەو بوو مەگەر زۆر ناچار بوایەین دەنا ڕێکردن بە ڕۆژ هەڵەیەکی زۆر کوشندە بوو مەگەر چۆن ها ئەنا کارەساتی گەورەی وەکو ئەوەی کاك ئازاد و هاوڕێکانی بە دواوزە ئەبوو،گوڕەی سەیارەکی زۆر گەیشتە نزیکمان و بەو ڕۆژە رووناکە بە شپرزەیی بەو هەردانەدا کەوتینە ڕاکردن و تەواو ماندو بووین و گەیشتینە ئەو شوێنە مەبەستمان بوو کە کاك ئەحمەدو هاوڕێکانی شارەزای بوون و تا ئێوارە لەوێ ماینەوە قەناعەتمان وابوو لە دەستیان دەرناچین بەڵام باش بوو ئەمجارەیش سەریان دای لە بەرد و سەرشۆڕانە بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە، وامان دانا موجاهیدینی خەڵك بن کە بە ئارەزووی خۆیان بەو وڵاتە چۆڵەدا تەراتێنیان ئەکردو هەموو جارێ سەریەشەیەکیان بۆ دروست ئەکردین تا لە دوای ڕاپەڕین ئەو نامەردییە گەورەیەیان بەرانبەر کردین ٠

ڕژێم دەستی کرد بە بڕینەوەو هەڵکەندنی دارتەلی ئەو کارەبایە کە لە سەقەڵاوە ئەڕۆیشت بۆ (توکن )لە ڕاستیدا ئەوە (موخەریب) یی بوو نەك شۆڕشی کورد هەر ئەو ڕۆژە ئەوان دەستیان کرد بە هەڵکەندن و بڕینەوە ئێمەیش ئەبوایە بڕۆیشتینایە بۆ سەرقەڵا دەمەو خۆرئاوا بۆ یەکەمین جار لە تەمەنمدا ڕۆیشتمە سەر( جەوەڵ نادر شا )کە کاتی خۆی نادرشای ئەفشار ماوەیەك تێدا ماوەتەوە ئیتر نازانم ماوەکەی چەند بووە گوایە وتبێتی ( مەملەکەتی خوب وەلی ٠٠٠٠٠٠) کاتێ سەرکەوتم ئەوجا زانیم ئەو گردە بە چاو زۆر ئاسایی دێتە پێش چاو بەڵام زۆر لەوە

بایەخدار ترە کە کەسێکی ناسەربازی بۆی ئەچێ و ئەوسا ئافەرینم کرد لەو ئەقڵە سەربازییەی ئەو ڕۆژگارە کە ئەوەندە جوان توانیویەتی بەرزاییە ئیستراتیجییەکان دیاری بکا (نادر شا)و (قوشیلان)کە چەمەکە لە یەکی دابڕیون یەك زنجیرەن لە گەڵ(شاکەل)کە ئەویش هەر بە ناوی ئەوەوە ناو نراوە دیارە ئەم زنجیرە وەکو هێڵی بەرگری بووە (لالەقادری گوڵخاس)خەڵکی قولیجان کە تەمەنی (١١٥)ساڵ بوو ئەیگێڕاوە نادر شا کە جارێکیان لە بەرانبەر عوسمانییەکاندا ئەشکێ و بەشێ زۆری لەشکرەکەی تیا ئەچێ و خۆیشی ئەکەوێتە مەترسییەکی واوە بەدیلی بیگرن هەر خۆی و دووسواری لە گەلا دەر ئەچێ کە ئەگەنە جێگایەك ترسیان نامێنێ یەختی خۆی تاقی ئەکاتەوە داخوا بەختی پاشایەتی ماوە ئەخورێتە یەکێ لەو دوو کەسەی کە لە گەڵیا دەرباز بوونە فەرمانی پێ ئەدا کە هاورێکەی بکوژێ ئەویش بێ سێو دوو هەڵئەکێشێتە شمشێرو هاورێکەی ئەکوژێ لە دڵی خۆیا ئەڵێ هێشتا (ئیقباڵ) م ماوە ئەگەرێتەوە بۆ ئێران و لەشکرێکی تر کۆ ئەکاتەوەو جارێکی تر پەلاماری لەشکری عوسمانی ئەداو سەرکەوتنێکی باش بە دەست دێنێ ئەیگێڕایەوە گوایە نادر شا لەو هەڵاتنەیدا لە ئاواییەکی بچکۆلانە لائەداو ئەبێتە میوانی پیرەژنێ لەکاتی نانخواردندا لەبەر خۆیەوە نان ناخوا دەس ئەبا بۆ سەرەوەی ئەو خواردنەکە پیرەژنەکەیش پێی ئەڵێ (بۆ وا نان ئەخۆی ئێژی نادرشای پێش گشتی دەس ئەوەی بۆ سەرئەویش ئەپرسێ چۆن وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێ(نادرشاکە بەغدای گرت یەکسەر هەڵی کوتایە سەر غەوس و کردییە تەویلەخانە)ئەویش ئەڵێ (مادام ئەوەندە ئاقڵی دە وەڵامن نادر شام و ئەبێ پێم بڵێی چی بکەم بۆ ئەوەی لەشکری عوسمانی نەمگرن ) پیرەژنەکەیش پێی وتووە ژێر پێڵاو بە پێچەوانەوە بدەن لە پێڵاوەکانتان تا سەر لە دوژمن بشێوێنن لەوە ئەچێ زۆر بە درییەوەو بە بێ ئەسپ خۆیان کردبی بە ماڵی پیرەژنەکەدا بۆ ئەوەی کەس گومانیان لێ نەکاو بیانداتە دەستەوە ئەوانیش وایان کردووە ئەم حەکایەتە چەند پەندو ئامۆژگارییەکی تیایە ئەگەر بمانەوێ سودی لێ

وەرگرین یەکەمیان ئەوەیە ئەو پاشایانە زۆر باوەڕیان بە بەخت و ئیقبالٚ هەبووە دوەمیش ئەوەیە پرس وڕاوێژیان پێ عەیب نەبووە بەتایبەتی بە دنیا دیدەکان و ئەوانەی بە سالاٚ چوونە، جێی داخە ئەوە لای خۆمان زۆر کەم بەرچاو ئەکەوێ سێیەمیانیش بەکارهێنانی هەستی مەزهەبی خەلٚك لە لایەن عوسمانییەکانەوە چونکە نادر شا بەغدای نەگربوو تا غەوسی گەیلانی بکاتە تەویلە خانە چوا ەمیشیان ئازایەتی و کۆلٚنەدان وگەشبینی نادرشا لە کاتێکدا تەنها دوو کەسی بۆ دەرچووە گەشبین بووە، بەوەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئێران و پێنجەمیشیان زۆر وریایی نادرشالەوەی ژەهری بۆ کرابێتە سەر خواردنەکە لەو لایەی خۆیەوە لێی نەخواردبوو ، کاتێ بە وریاییەوە تەواو سەرکەوتینە سەر سەری گردەکە بۆمان دەرکەوت ئەو هێزە تازەیەی دوژمن زۆر لەوە زیاترە کە ئێمە دامان نابوو گەر چی کەم و زۆری هێزی دوژمن بۆ ئێمە مەبەست نەبوو، چونکە ئەرکی ئێمە بە گژاچوون نەبوو لەو قۆناغەدا بەلٚکو گەیاندنی ئەو پەیامە مێژوییە بوو بە دوژمن کە( تاریکایی شەو چەند بە هێز بێ ناتوانێ ڕۆشنایی مۆمێ بکوژێنێتەوە) ئەو پێشمەرگانە ڕۆشناییەکی بەتین بوون بۆحوجرەی تاریکی دەرونی کوردایەتی و شۆڕش کە دوژمن بە حیسابی بیری کورتبین و نەخۆشی خۆی سەراپای ڕۆشناییەکانی لە خاچ داوەو هەموو ڕێگاکانی گەیشتن بە ڕوناکی کردۆتە تەیمانتەنی چەقۆ ڕێژکراو .

٢/١٣ پێشینان فەرمویانە (کفندز باشە چێو لە ··· بڕخراوە) دوژمن گلەیی لێ ناکرێ هەرچەندە ئەوەیش خۆی فرۆشتبێتە دوژمن هەر گلەیی لێ ناکرێ بەلاٚم لەبەر ئەوانەی کە دەستی خۆفرۆشیان گرت و بردیان بۆ لای سەرکردەکان و سەرکردەکانیش لە سەر ڕۆشنایی ئەو هەلٚسەنگاندنانەی ئەوانەی تا دوێنێ ماندوی دەستی خۆفرۆشان بوون لە شەو و ڕۆژێکا بوون بە کراسی بەرو پشت پێکراو، نەك ڕێزیان لێیان گرت بەلٚکو کارێ وایان کرد ئەوان خاوەنی بڕیار بن دەربارەی تێکۆشەران و مانەوەیان و جێبە جێکردنی داواکارییەکانیان لە کاتی پۆستەکانیاندا

بەند بێ بە ڕەزامەندی ئەوانەوە ٠ بەشێك لە پێشمەرگەکان لـە زووەوە هـەر حـەزیان لە سەردانی هۆمەرمل بوکاتیێ ڕۆیشتن بۆ هۆمەرمل ئەوان بە ئەویێ و جاش بـەویێ لـە زۆر جـاردا وەك پێشـینان فەرمویانـە ڕاکـردن نیـوەی کەڵەمێردییـە کوڕانـە خۆیـان ڕزگارکردبوو، بەڵام لەوە دڵنیا نەبوون کە جاشەکان ئـەمانیان بینیـوە یانـا هـەر لـەو دڵە ڕاوکەیەدا بووین شەو لە ناو حەشارگەکەدا بووین ئەوەندەمان زانـی خرمـەی پـێ هات بە سەر حەشارگەکەوە و وەستا چاوەڕوانی تەقە کـردن بـووین ، و هـەر دەنـگ نـەبوو هـەمووومان بـێ هـیچ نەخشـەیەك بـە حەماسـێکی بێدەربەسـتانەوە بـۆی دەرپەڕیمان کـە چووینە دەرەوە سـەیرمان کـرد جاشـەکان نییـە کەرەکانـە بـەربوو بوونە و هاتوون بۆ لامان و لەو دوورییە یا ترسابوون یا بێتاقەت بوو بوون هـەمووومان دامان لە پێکەنین .

٢/٢٠ ڕۆژێکی هەتا بڵێی تاڵ و کارەساتبارو خەمهێنەر بوو بۆ ئـەو پێشـمەرگانەی لەگەرمیاندا مابوونەوە دەمـەو ئێـوارە لـە کـاتی پەیوەنـدیکردنی ڕۆژانـەدا هەرەسـی ئەشـکەوتەکەی (داری خلـە) ڕاگەیـەنرا کـە پـۆلێ پێشـمەرگە بوونـە قوربـانی خـاکی پیرۆزی نیشتیمان تەنها دووانیان دەرچوو ئەوانیش بۆ پەیوەنـدی کـردن چـوو بـوون دەنا ئەو دووەیش هەمان چارەنوس چاوەڕێی ئەکردن .

لـە کۆتـایی شـوباتی هـەمان سـاڵدا ڕۆژێـك بڕیـار درا هـەمومان خۆمـان بشـۆرین، شـوێنێك هـەبوو زەل بوو،لـە نیـوان چـەند بنجـە زەلێکـدا بـە نـایلۆن حـەمامێکی سەرپێیمان دروست کرد ،و بەتانیمان دا بە سەریا هەم بۆ دیار نـەبوونی ئـەو کەسـە خـۆی ئەشـۆری ، و هـەم بـۆ دەرنەکـەوتنی بریقـەی نایلۆنەکـە ئەگـەر شـتێ بوایـە هەرکەسـەو مـاوەی خۆنەشـۆردنی خـۆی لیـك ئەدایـەوە مـن یـەك مـانگ بـوو، لێپرسراوەکەمان سێ مانگ بوو شەهید حەمەڕەش سێ مانگ و نیوو بوو، گەرچی بـە ملیوانەکەیا وادیار بوو لەوەیش زیاترە .

٣/٣يەكێكمان تەسليم بووەوە وەك مشتەكۆڵەيەك بۆ هەناوى هەموومان، چونكە ئەو كەسە چەند باش بوايە ڕژێمەكە زۆر درندە بوو وازى لىێ نەئەهێنا، و ئەبوايە شتێكى بدركانايە و كەمترين زانياريش سەرى داوەكەى ئەدايە دەستى ڕژێمەوە لە لايەك خەمى دۆزرانەوەى حەشارگەكانمان بوو ،لە لايەكى ترەوە خەمى ئاشكرابوونى ئەوانەى هاوكاريمان ئەكەن و خەمى كەس و كارى ئەو پێشمەرگانەى كە لە گەرە باندا مابوونەوە. بە پەلە ئەو حەشارگەيەمان بە جێهێشت و ڕۆيشتين بۆ يەكێكى ترو ڕۆژى دواتريش بۆ (شەقى شەفە ) وكە خۆرچووە دەم كەل كەوتينە ڕێ بەرەو ( زينانەى ژوورين) هەتا گەيشتينە ئەوێ هەروا جوێن بوو بۆ ئەو كەسە ئەچوو كە تەسليم بوو بووەوە، تەنها شەهيد كاكە ئەحمەد نەبێ نەك هەر جوێنى نەدا بەڵكو پێداگيرى ئەكردو ئەيوت ( من ئێژم خيانەتمان لێ ناكا لەبەردو هۆ يەكەميان باوكى پياوێ باشەو ئاقڵە ئەگەر دەستى پێ بگا بە پارە چارەسەرى ئەكا و نايەلێ زەرەرى بۆمانبێت ،دوەميشيان زۆر باوەڕى بە ڕێكخستنە هەتا توانای هەبێ خراپەى لێ ناوەشێتەوە ) پياوى ئاقڵ لە ئەنجامدا دەرئەكەوێ و كتێبيش بۆ ئاخير ئەگيرێتەوە مەزەنەكەى ئەو دڵسۆزە دووربينە وەك خۆى هاتە دى باوكى فرياكەوت نە خۆى نە ئێمە زەرەرمان نەكرد خۆيشى زۆر پياو بوو ئەوەيە هێزى پێشبينى . باوكى ئەو كەسە مانگى ئەيلولى/٨٨ هات بۆ لامان و شەوێكى خۆشمان بە يەكەوە بە ڕێكرد و حەزى لە گاڵتە ئەكرد و كوڕەكەى لەوەوبەر نەخۆش كەوتبوو تەواو لاواز بوو بوو هەر بۆ خۆشى پێى وت (ملت ئێژى هينمە ) دواى ڕاپەڕينيش كاتێ شارى (خورماتوو) بە پاڵپشتى جاشەكانى موجاهيدين لە دەستى پێشمەرگە سەنرايەوە و هێزەكانمان لێى كشانەوە خەڵكێكى بێشومار دەستى ماڵ و مناڵيان گرت و بە پێ دەشتيان دا لە بەر لە پشتى شارەكەوە بەرەو ناوچەى داوێ و دواتر بۆ سەرقەلا و بارانيش بارەكەى قورس ئەكرد، ئەم پياوە سەيارەيەكى گەورەى هەبوو خستبوويە ئەو ڕێيە بە گازى خۆيەوە بەردەوام خەڵكى پێئەگەياندە سەرقەلا هەربۆ كوردايەتى

و بۆ خوا . ئەو شەوە زۆرمان لە کەر کەوتینە خوارەو گەیشتینە زینانە بەڵام کە لە ئاوایی دەرچووین شارەزاکەمان شەوارەی کرد و زۆر لامان تاقی کردەوە هەرچۆنێ بوو شوێنەکەمان دۆزییەوە ئەچووە سەر( ئاوەسپی ) زۆر لە خوار درکەی لای (قەواڵی ) یەوە چەند حەشارگەیەکی ئامادەکراوی ئەوخەڵکە بوو تا درەنگانێ لە دوای ئەنفال هەر مابوونەوە. لە بەر ئەوەی شەو زۆر هیلاك بووین بەیانی زۆر درەنگ هەڵساین و قاوەڵتیمان کرد جێگەیەك هەبوو لێیەوە تەماشای ئەو دەشتە جوانەی( پەتەکی )مان ئەکرد، موجاهیدین وەك ئەڵێن ڕۆن زۆر بێ..... چەور ئەکەن!! بە جۆرێ بلاوەیان کردبوو زۆربەی هەرە زۆری ئەو دەشتەیان داگیر کردبوو هەرچەند بلێی ئامێر و چەکی سەربازی هەمەجۆریان لە بەر دەستا بوو ڕۆژانە خەریکی مەشقێکی زۆر سەخت بوون و تەقەمەنییەکی زۆریان بەکار ئەهێنا، ئەم شوێنە زۆر نالەبار بوو بە کەڵکی ئەوە نەئەهات تیایدا بمێنینەوە بۆیە ئێوارەکەی کەوتینە ڕێ بۆ (دوڕاجی) و (١٢) ی شەو گەیشتین شەوی دواتر ڕۆیشتین بۆ دارهێنان دەسکی ڕەوڕەوەیەکی منالانەم بینی ڕەوڕەوەکەی (یەریڤان)م کەوتەوە بیر کە یەکەم منالمان بوو خۆم دروستم کردبوو لەوکاتەیشدا بیرم لەوە ئەکردەوە ئەبێ خاوەنی ئێستە لە کوێ بێ ؟.

خەوتن لە هەر شوێنێکدا شوێنەکە هەرچۆن بوایە زۆر ئاسایی بوو، ئەگەر لە نزیك حەشارگەکانی خۆمان نەبوایە زۆربەی جارەکان کونی گیاندارانی کێوی ئەبووە ئوتێلی تەڕدەست و بێمنەت ، شەوێکیان لە کونێکدا خەوتین گیاندارێکی ورد ئەیدایە پێمانەوە لە مێشولە ئەچوو بەلام مێشوولە نەبوو ،دواتر شوێنەکەی هەر سارێژ نەئەبوو تاکو ساڵێکیش هەر زەردکاوی لێ ئەهات و ترسمان لێ نیشت کە هەر چاك نەبێتەوەو بیکاتە نەخۆشییەکی پیس لێمان ئەو شەوە ئەمانوت (ماڵ لە خاوەن ماڵ حەرامە )خاوەن ماڵ ڕێوی بوو.

یەکێکمان لە شوێنێکی زۆر بەرزەوە لە (ئاشداخ) لای شوێنەکەی شەهید حەمە ڕەش کەوتبووە خوارەوە ڕەنگە ئەو کەسە ئێستە بیبەیتە ئەو شوینە خۆیشی بڕوا نەکات لەو شوێنەوە کەوتبێتە خوارەوەو نەیشمردبێ نەمرد بوو، بەڵام ساغایی کەم تێیا مابوو ڕۆژێکیان لە کاتژمێر (٣)ی پاش نیوەڕۆ وە کەوتینە ڕێ تاکو بەرەبەیان بۆ ئەوەی لە ئاشداخەوە بیگەیەنینە لای خۆمان و لەوێیشەوە بۆ (کفری)ئەوەی ماندوبوونەکەمانی ئەوەندەی تر زیاتر کرد لای ئەوان کێومالٚ ئەکرا لە لایەن دوژمنەوە بە دەستی بەتاڵ چۆن هاتین ئاوا گەڕاینەوە ،و لەوەش خراپتر بارانیش لەسەر ئەباری بە درێژایی ڕێگا .

٤/١ لە کەلێکەوە دوای (٤) ساڵ چاوم بە دیداری شاری (کفری)یەکجار ڕۆشن بووەوە کە زۆر تاسەی دیداریم ئەکرد ئەو شارەی ئەو کاتە لە هەموو شارەکانی کوردستان زیاتر لام خۆشەویست بوو گۆڕی هەردوو باپیرمی تێدا بوو، خۆیشم بەشێ لە سەرەتایی و ناوەندیشم لەوێ تەواو کردبوو زۆربەی هاوڕێی ئەوکاتەم لەو شارەدا بوو. هەرلەم مانگەدا مانگرتنێك لە (قەڵادزێ)کرا بۆ دەربڕینی ناڕزایی دژی ڕاگواستنی شارەکە و دواتریش ڕوخاندنی و ڕادیۆکانی وەکو (لەندەن )یش لە هەواڵەکانیاندا باسیان ئەکرد ٠ پێشینان فەرموویانە (ماڵ لە خۆی نەبوو میوانیش ڕوی تێکرد )حاڵمان زۆر خۆش بوو مێشوولەیشی هاتە سەر بەڵام چۆن مێشوولەیەك مێشوولەیەکی وا کە ناچاری کردین بەتایبەتی بڕۆین بۆ سەر مەوعید تەنها بۆ هێنانی کێشی سپی تەنك بۆ ئەوەی بیدەین بە خۆماندا نەك هەر بۆ خەو بەڵکو بۆ کاتێکیش کە دائەنیشتین لەوەدا نەبوو، ئەبوایە بەردەوام دەستت لەکارا بوایە دەنا حەسانەوەمان نەبوو نەك جارێ چەند جارێ لەو کاتەدا دەممان ئەکردەوە لە کاتی نانخواردندا خۆیان ئەکردە ژوورا خۆمان ئەمە حاڵمان بوو ،بەڵام زۆر بەزەیمان بە کەرەکاندا ئەهات چونکە ئەوان حاڵیان لە ئێمە خراپتربوو، لە بەر ئەوەی ئەوان دەستیان نەبو بۆیە هەر خۆیان ئەگەوزانەوە ،بە بەردەوامی یان هەر ڕایان ئەکرد بەو

ناوەدا بیستوبوومان لە کاتی گیا گەناندا مێشوولە هەیە نەك بەو جۆرە .هەر لەم مانگەدا باسی هاتنی (٥) هەزارماڵی عەرەب بلاوبووەوە بۆ سنوری (جەبارە )و( خدران) و( زەنگاباد ) دیارە بە هاندانی ڕژێم و هاوکاری مادی و مەعنەوی ئەو بۆ جێبەجێکردنی نیازە گلاوەکەی و خەیاڵە بلاوەکەی .هەر لەم مانگەدا باسی گفت و گۆی ڕژێم بلاو بووەوە زۆر بەهێزیی و هەروەها باسی ڕاگواستنی (خانەقین )یش، ئەم مانگە سەرانسەر زۆر بە کەمی بە شەو ئەمانتوانی بخەوین لە بەر مێشوولە .

٤/١٨ کاك( سەرکەوت )یان هێنا کە لە شاخ کەوتبووە خوارەوە وا هاتە پێش چاوم بەشێ لە پێشمەرگەکان کەمێ خۆیانی لێ بە دوور ئەگرن منیش زۆر حەزم لەم جۆرە هەڵوێستانەیە بە پێچەوانەوە هەر لە گەڵ ئەودا نانم ئەخوارد و هەمیشە لە نزیکی بووم و وام هەست ئەکرد تا زیاتر وابکەم بۆ کوردایەتی و مرۆڤایەتی و ئایینی قازانجی مەعنەویم زیاتر ئەبێ و زۆر ڕۆحم بەوە شاد ئەبوو .

٤/٢٠ بە (٤) پێشمەرگە کاك سەرکەوتیان گەیاندە دەستی( برادەرانی ناو شار) لەکفری و لەو سەرەوە شتی زۆریان بۆمان هێنا (مریشك، پرتەقاڵ، فاسولیا ،نۆك، نیسك ، شەربەت ، کەتان بۆ مێشوولە وجیهازێکی ڕاکاڵ ) بەیانی دوڵمەمان کردو (٤)مریشکمان خستە ژێری و مریشکەکانی تریش کە مابوونەوە لە بن سێبەرێك، جێگەیان بۆ تەرخان کرا لە لای پتەوی خۆمانەوە . باسی قەلادزێ هەر درێژەی هەبوو، زیاتر باسی هەڵوێستی (مەلا محەمەد) گەرم بوو، کە وتبووی (مەگەر بمکوژن دەنا لە قەلادزێی ناچمە دەرێ) . هەر لەم مانگەدا لە دەورووبەری خۆمان لە (چکچك ) کە زۆر نزیك بوو لە کفرییەوە بە جۆرێ بانگدان و تەقەی چەکوشی ئاسنگەری زۆر بە چاکی ئەهاتە لامان (١١١) قوتووی ئاوتەماتەمان لە ژێر زەوییا دۆزییەوە بۆ ئەو ڕۆژە شادییەکی زۆرگەورە بوو .

٤|٢٩ ئەو ڕۆژە لە سەرقەلا ئەگەڕامەوە هەمووان زۆر مات و بێدەنگ بووین و دیار بوو شتێ ڕویدابوو کە پرسیارمان کرد وتیان (٢) کەسمان گرتووە نەئەتوانین

بیانکوژین و نه ئەتوانین بەرەلآیشیان کەین چونکە دڵنیا نین لـەوەی پیـاو خـراپ بـن رژێم ناردبنی و لەوەیش دلنیا نیمان ئەگەر بەریان بدەین جێمتمانەن لەو دووبەینیەدا گیرمان خواردبوو پاش راوێژێکی زۆر پێ نرا بە جەرگاو ئازاد کران، بـەلآم هـەر دوای ئەوان لەو شوێنە دوور کەوتینەوە و کەل وپەلەکانمان شاردەوە .

٥/٦ نزیـك خۆرکـەوتن گوێمـان لـە( اللـه اکـبر) ی نوێـژی جـەژنی رەمـەزانی مزگەوتەکانی کفری بوو زۆر کاری تێکردین بـە دەسـتی خۆمـان نـەبوو، جـەژن رۆژی هاتنەوەو خڕبوونەوەی گشت ئەندامـەکانی خێزانـە لـە هـەرکوێ بـن ئـەبێ ئـەو رۆژە خۆیان بگەیەننە مـاڵ، بـە هـەر نرخێـك بـووە وا ئێمـەیش چـەند کەسـێکین دوور لـە هـەموو کـەس و کـارو ئـازیزان، و دوور لـە کۆمـەڵ ،و دوور لـە ئـاوەدانی ،و دوور لـە جەژنـە پـیرۆزە، و مـالآن گـەڕان ،و تەماشـای قـەدووبالآی منالـەکانمان، و خـواردنی خۆش، وشیرینی و دواتریش رۆیشتن بۆ شوێنی تایبەت ،بەو رۆژانەی جەژن دوور لەو خۆشییەی کاتێ ماڵە خزمێك لە دوورەوە دێ کە چاوەڕوانت نـەکردبێ دوور لەمانـەو زۆر شتی تریش وائـەرکی پـیرۆزی سەرشـانمان رائەپـەڕێنین ،و بـە ئازایشـی نـازانین بەلآم نایشزانین چی ساتێ تیائەچین و دوای ئەم کۆسکەوتنە گەورەیەش هێشتا زۆر زۆڵە کورد نەك هەر پەشیمان نەبوونەتەوە و ڕێگەی ناپاکییـان بەرنـەداوە بـەڵکو لـە سەخترین رۆژی ساڵیشدا ناهێڵن بۆ خۆمان تاوێك بێخەم پێی لێراکێشین و بە هەسکە هەسك بەدوامانەوەن ،و پێشبڕکێی ئەوەیانە کامیان خێراتـرە تـا سـەری براومـان بـە دیـاری بباتـەوە بـۆ راوچـییەکەی خاوەنیـان، زۆر جـار لـە جەژنەکانـدا برینـی کـۆن ئەکولێتەوە، بەلآم ئەمجارەیان کولانەوەیەکی زۆر تایبەتە لەم حاڵەدا بـووین ئـەوەی چاوەڕێمان نەئەکرد ئەوەبوو ئەمڕۆ بتوانین زۆر کەمیش بێ شاد بین هەر کەمێ دوای تەواو بـوونی نوێـژ رادیـۆ خۆشـترین هـەواڵی پێگەیانـدین ئـەویش بـۆ دۆزەخ چـوونی (عدنان خیرالله)بوو .

جاشەکان ڕۆژانە وەك سەگی پێ سووتاو تۆتکەیان نەئەکرد و بەو هەردانەدا ئەسوڕانەوە سێ جاش هەموو ڕۆژێ زۆر لێمان نزیك ئەکەوتنەوە تا ڕۆژێکیان ئەوەندە نزیك بوونەوە ئەوەمان نۆرەی چاودێری کردنی بوو خۆی ڕووت کردەو بۆ ئەوەی بە زەوییەکەوە دیارنەبێ کە چوو بۆ گێڕانەوەی کەرەکان لەوە ئەچوو هەندێ گومانیان کردبێ لەو ناوەین ڕۆژێ تر هەر ئەو جاشانە هاتنە شوێنی چاودێری لەوەو پێشمان هەر لەم شوێنەدا ئێوارەیەکیان گورگێ هاتە بەرانبەرمان و چەند هەوڵماندا هەر دوور نەئەکەوتەوە زۆرمان لا سەیر بوو گورگ بەو شێوە لە کۆمەڵێ نزیك بکەوێتەوە نەمانزانی تێ ئەگا ئێمە ناتوانین تەقەی لێ بکەین یان زۆر حەزی لە گۆشتی کەرەکان بوو یان چی هۆیەکی تر،جارێکیان کەرەکەمان جاشکێکی هەبوو بۆ هەرکوێمان ببردایە کەمترین هەلی بۆ بڕەخسایە ڕای ئەکردەوە بۆ لای جاشکەکەی ئەوەندە ڕای کردبوو ڕۆژێ یەکێکمان جاشکەکەی کوشت کاتێ دایکەکەی هاتە سەری و زانی گیانی تیا نەماوە بۆنێکی پێوە کردو ئەویش بە سەر ئەوا گیانی دەرچوو.

لەم ماوەدا کە لێرە بووین ڕۆژانە دەنگی تۆپباران ئەهات زۆر جار فڕۆکەیش ئەهات ،ڕۆژێکیان فڕۆکەیەك ئەسوڕایەوە زۆر خاو و زۆر نزم بوو ،ئەوە هات بە خەیاڵمانا ئەمە تاکتیکێکی تازەی ڕژێم بێ بەو جۆرە وێنەی ئەو ناوە بگرێ و دواتر لە تاقیگەی تایبەتدا وێنەکان شی بکەنەوە و بگەنە ئەوئەنجامە لە کوێی وێنەکاندا ئاماژەی تیایە بۆ بوونی مرۆڤ چونکە زانست زۆر بەرەو پێشەوە چووەو چاوەڕێی هەموو شتێکی لێ ئەکرێ .

لەم ماوەیەدا زۆربەی پێشمەرگەکان گرانەتایان گرت و منیش کاتی خۆی لە ناچاریدا و بە هۆی نەبوونی دکتۆرەوە لە قولیجان خۆم فێری دەرزی لێدان کردبوو لەو کاتەدا (ئالآ) مان مندالّبوو نەخۆش کەوت بۆ ئەم ڕۆژانەیش تا ڕادەیەك لە بەر ناچاری سوودمان لێی وەرگرت هەر دەستەیەك نەخۆشی هەبوایە ئەبوایە خۆم

ئامادە کردایە  بە جیهاز ئاگادار کراینـەوە کـە شـەهید جەوهـەر نەخۆشـە یەکسـەر کەوتمە ڕێ بۆ لایان، ئـەو کاتـە لـە دەوروبـەری گـەرمك بـوون لـە دۆڵێکدا ئاوەکـەی ئەچووە سەر ئاوەسپی کەڵێکیان کوشتبوو، بەشەکەی منیان دانابوو بۆ بـەیانی هـەر وا تۆپ بوو ئەیدا لە دەوروبەرمان گەیشـتینە ئـەو بڕوایـەی  کـە پێیـان زانیـووین کـە لەوێداین ، ئێوارە بارمان کرد و کـاتێ لـە دۆڵەکـە چـووینە سـەر تەماشـامان کـرد وا ئاڵادەکیان لە سەر گردەکەی لای سەرەوەمان داناوە و کردویانەتە نیشان و تەقە لەو ئەکەن ،کاتێ کەوتینە ئەو دەشتە ئەو شوێن مەشقی ڕۆژانەی موجاهیـدینمان بینـی هـەر یەکەیەك شوێنی خۆی جیا بوو ،هەر یەکەیەك ناوەکەی بە فارسـی  لـە سـەر دەوری پلاسکۆ نوسرا بوو، سنوقی بەتاڵکراوی هەموو جۆرە تەقەمەنییەك بـە جـێ هێڵرابـوو ئەوجا زانیمان ئەمانە چـی بایـەخێکیان پێدراوە لـە لایـەن ڕژێمـەوە ئەونـدە هـات و چۆیان کردبوو بەو ڕێگاو بانانەدا کردبوویانە خۆڵە پەتانی .

کاتژمێر ( ٢ ) ی شەو گەیشتینە (قوین پەڵك) و بارمان خست و لێـی خـەوتین کـە دنیا ڕۆشنا بووەوە چووینە ناو دارەکان کە لافاو تراکتـۆرێکی چـاکی خسـتبووە ژێـر زیخەوە هی ئەو خەڵکە بوو لـە کـاتی ئەنفالەکـەدا پێیـان بـە جـێ هێشـتبوون و لـەم دوایییەدا یەکێك لـەو موستەشـارانەی کـە لـە سـەرەتای شەسـتەکانەوە پیشـەی هـەر جاشێتی بوو ئەکەوتە ئەو ئاواییانەو لێـی ئەهێنانـەوە و لـە گـەڵ یـەکێکی تـری وەك خۆی تاوانبار کە خاوەن پیشە بوو لە شاردا ئەیانفرۆشت .ئەو ڕۆژە گەیشتینە قـوین پەڵك شەکروچایمان نەبوو لە سەر ئەو هیلاکییـە ،کاتـژمێر (٨)ی بـەیانی بـۆ مـاوەی یـەك کاتـژمێر تانـك و زرێپـۆش و سـەیارە ڕێـی کـرد ئـەوجا تـەواو بـوو هـەمووی موجاهیدین بوو بۆ مەشق و ڕێگەکەیشیان بە لاماندا تیپەڕ ئەبوو ، نیـوەڕۆ بڵاوەمـان لێ کردبـوو ئەوەنـدەمانزانی سـەیارەیەك بـە تەنیشـتمانەوە پەیـدا بـوو تـا ڕادەیـەك شڵەژانێك دروست بوو ناردمان بە دوای ئـەوانی تـردا تـا ئـەوان هـاتن ئـەو نـەما هـەر نەمانزانی چی بەسەر هات .

شـوێنمان گواسـتەوە بـۆ تـاوێرێ بـەرز زۆر بـە جـوانی شـاخەکەی پشـت شـاری خورمـاتوو بـە تایبـەتی ڕەبیەکـەی ئیمـام عـەلی دیـار بـوو ،کـابرای نـەگونجاو پۆپەشمینێکی سوری هەڵدا بوو شـەهید جەوهـەر زۆرهـەوڵی دابـوو لایبـا بـە قسـەی نەکردبوو منی ڕاسپارد و زۆر هەوڵم لە گەڵی دا هەر سودی نـەبوو ،تـا کـار گەیشـتە ئەوە شەهید جەوهەر بڕیارێکی دا و لە سەر داوای من وازی لێ هێنا .

بروسکەمان بۆ کرا لە مەفرەزەکەی خۆمانەوە کابراشم لە گەڵ خۆما بردەوە و لە کۆڵی ئەوانم کردەوە لەو شوێنەوە کەوتینە ڕێ و دەمە و بەیان گەیشتینە (پەڵکانە ) کە سەرمان کێشا دوو سەرباز بە یەکـەوە وەسـتابوون ئێمـەیش بـە ڕاکـردن گەڕاینـە دواوە پاش کەمێ بە پسکە پسك گەڕاینـەوە بـۆ چـاودێریان بـزانین چـی ئەکـەن بـە ئەسـپاییەکەوە سـەرمان کێشـا سـەیرمان کـرد ئەمـە دوو دار خورمایـە نیوەیـان بڕاوەتـەوە ، و زۆر لەیەکـەوە نـزیکن هـەم پێکـەنین و هـەم پەشـیمان بووینـەوە لەکاتژمێر یەك و نیوی پـاش نیـوە ڕۆ کەوتینـە ڕێ (٦) ی بـەیانی گەیشـتینە جـێ ، کاتێ گەیشتینە شوێنەکەمان کەسی لێ نەبوو جا ئیتر دڵت چی گەرەکە بە مەزەنەی خۆمان وامان دانا لەو شوێنە بن کـە شـەهید حوسـێن حەمـە سـەمکە پـێش تەسـلیم بوونـەوەی لـەوێ بـوو ، هـەر وایـش دەرچـوو ، ڕۆژی دوایـی خـۆم شـورد و کـەلو پەلەکانیشم شۆرد و ڕیشم تاشی و تفەنگەکەم پـاك کـردەوە لـە گـەڵ فیشـەکەکان و ئێوارەیش ڕۆیشتم بۆ لای شەهید کاك ئەحمەد ، ئەویش گرانەتای بـو، لـە شـوێنێکی تر ،نیوەڕۆ کۆپتەرێ تـەواو شـپرزەی کـردین و یـەکێکمان کوڕانـە کەرەکـەی دا بـە زەویدا ،لەم شوێنەدا سێ سەربازی هەڵاتوو مەردانە شەڕێکی باشیان کردبوو لە گەڵ کۆپتەردا پێش ئەنفال، کـاتێ لێرەدا بووین هەسـتم ئـەکرد دەرمانـەکانم لێـی کـەم ئەبێتەوە دواتر یەکێك خۆی باسی کرد هەمووی کردۆتە زامی کەرەکەیەوە کـە خـۆی بریندارى کردبوو لە دواین ڕۆژی ئەم مانگەدا شـەهید حەمـە ڕەش کرایـە لێپرسـراوی هەموو هێزەکانی گەرمیان کە کەمێ ئاڵۆزی دروست کرد .

٦/٤ ئیمام خومەینی کۆچی دوایی کرد ئەو شەوە یادی منالەکانم زۆر ئەکرد و شەوەکەیشی گەرم هەردووکیان ئازاریان دام رۆژی دوایی سیانمان لە پێشەوە رۆیشتن بۆ زەردەلو کردنەوە لە باخەکانی هۆمەرمل و لەو رۆژانەیشدا باسی دەرچوونی کۆمەڵێ جاشمان پێگەیشتبوو ،کە لە ناوچەدا ئەمێننەوە و زۆریش خراپ بوون من و شەهید کامەرانیش درەنگێ رۆیشتین بۆ لایان و زۆرمان نەمابوو بگەینە ئەوێ کۆمەڵێ چەکدارمان بینی رووەو ئەوان ئەرۆیشتن و لەو کاتەیشدا ئەوان بەرەولای چەکدارەکان ئەهاتن هەرچەند بە دەست ئیشارەتمان بۆیان کرد سودی نەبوو خەریك بوو بە تەواوی ئەگەیشتنە یەك و ئیتر دەستمان لێیان شۆرد و چاوەروانی تەقەکردنی ئەمانمان ئەکرد نەخشەکەمان گۆری خۆمان کوتا بۆ پشتیان و شوێنێکمان لێیان گرت دەرچوونیان مەحاڵ بوو ئەوەندەمان زانی گەیشتنە یەك و کەوتنە تەوقە کردن تومەز دەستەیەکی ترن ئەوانیش هاتوون بۆ زەردەلوو ، شەوی دواتر مشك هەراسانی کردین و دوو جار هاتنە سەر دەم و چاوم منیش لە هەموو شتێ زیاتر بێز لە مشك ئەکەمەوە .

رۆیشتن بۆ سەر مەوعید خەریك بوو ئەبووە ئەرکی هەموو رۆژە گەرچی زۆر مەترسیشی هەبوو ، دوو رۆژ دوای مشکەکان سیانمان رۆیشتن بۆ سەر مەوعید( سێ )پیاو خراپیان بینیبوو بە دوایاندا زۆر رۆیشتبوون بەلام فریایان نەکەوتبوون ئەو شەوە مەوعید تێك چوو .

(١١)ی ئەم مانگە کەوتمە ژێر خەمێکی زۆر قورس کاتێ پێیان وتم ئەبێ تۆیش برۆی بۆ ئێران بەهۆی ئەوەوە تووشی نەخۆشییەك بوو بووم هەمان نیشانەی کیمیاییەکەی شەوەکەی قزلو بوو کە با لە گوێتەپەوە هێنای بۆ لای ئێمەیش زۆر هەوڵم دا نەرۆم بەلام رازی نەبوون لەو ماوەدا بە تەواوی پەکی خستبووم بەلام من ئەو قۆناغە ئەوەندە لام بایەخدار بوو ئەوەم هەر بە خەیاڵدا نەئەهات بە هیچ شێوەیەك گەرمیان جێ بهێڵم. بەرەو ئاشداخ کەوتینە رێ لە لای ژووری (زینانە)ەوە

مابنەوە،لێرە کەسێك زۆر نارێك جولآیەوە لە بەرانبەر شەهید حەمەڕەش و ئەویش زۆر نارەحەت بوو بە تەنیا لێیدا وبەدیوی ئەودیوماندا ئاوا بوو، بۆ ڕۆژی دواتر موجاهیدین بەشێوەیەکی تەواو سەربازییانە بە چەند چەکێ هێرشیان ئەکردە سەر ڕەبیەیەك بۆ مەشق تانك و هاوەن و پیادە تێهەلکێش کرا بوو ئێمەیش لە سوچێکەوە تەماشامان ئەکرد ، هەر ئەمشەو گەیشتینە شوێنێکی دوور و ڕادیۆی (لەندەن ) باسی ژەهراوی کردنی خواردنی ئاوارە قوربەسەرەکانی خۆمانیان کرد لە تورکیا بە دەستی زۆڵە کوردێکی خۆفرۆش تەماشای ڕادەی ئەو خۆفرۆشییە، ئەو بێغیرەتییە هەموو ولآتانی دنیا سوالّ و سەدەقە یان کۆ ئەکردەوە بۆ ئاوارەی خراپ لێقەوماو کەچی لەوێش جاش وازیان لێ ناهێنێ لەو ڕۆژە زۆر ناسکەیشدا کە وەکو پێشینان ئەڵێن ماری ڕەش یەقیان بۆ ئەکردنەوە .

٦/١٥ لای (مەلاهۆمەر) کابرا ی نەگونجاو لە گەڵ یەکێکی تردا کەوتنە ڕێ بۆ لای شەهید حەمە ڕەش زۆری نەبرد ئەوەکەی تر گەڕایەوەو وتی کابرای نەگونجاو ڕای کرد . شەوەکەی گواستمانەوە بۆ لای (سپێسەر) و بۆ بەیانییەکەی کۆپتەر لە کاتی نانی نیوەڕۆدا هەمووی لێ شێواندین بەلآم ئەولامانی گرت و بەشەکەی تریشمان (٣) ی شەو گەیشتنە لامان دو ورۆژ دواتر دووجار کۆپتەر هات. شەهید حەمەڕەش بەجیهاز باسی چاوپێکەوتنی مام جەلالی کرد لە گەڵ لێپرسراوانی ئێران و بەشداریکردنی ژنانی کورد لە کۆنفرانسی( سۆسیال ئەنتەرناسیۆنال) و کۆبونەوەی مام جەلال و کاك مەسعود و کاك ڕەسول مامەند و منیشیان ئاگادار کردەوە برۆم بۆ سەرقەلآ بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەمەوە، کە من ئەڕۆم بۆ ئێران لە گەڵ شەهید کاك ئەحمەدو یەکێکی تردا بەرەو خوار گەڕاینەوە و خەریك بوو خۆر ئەکەوت گەیشتینە باخەکەی شەهید مامە قالەی زۆر خۆشەویست هەزار ڕەحمەت لە ڕۆحی پاکی بە تەواوی پەکم کەوت، بە هۆی ئەو ئازارە زۆرەی پشتمەوە و ئەو سەرکردە گەورەیە چەکەکەی بۆ هەلگرتم جا چۆن گیان دەر نەچێ ، بۆ ڕۆژی دواتر زیاتر بەرەو خوار

بووینەوە  لە کاتی گەرماکەی نیوەڕۆدا فەرموی تا شوێنێ ئەڕۆم زۆری پێ چو هەر نەگەڕایەوە ئێمەیش تووشی دڵە ڕاوکەیەکی زۆر هاتین و ترسمان لێنیشت کەوتبێتە کەمینی خۆفرۆشانەوە، دوای چاوەڕوانییەکی کوشندە دەرکەوتەوە بەڵام چی دەرکەوت ئەوەندە خواردنی نابووە شانەوە بە بیری کەسا نایەت ،یەك کەس و بەو گەرمایە بتوانێ ئەوەندە خواردن لەو ڕێ دوورەوە بێنێ دوای ئەوەی چووینە پیرییەوە و بارەکەمان لێی سەند و دانیشتین ماوەیەك مات بووم ، و لە لایەکەوە بیرم لە دڵسۆزی و خۆبەزل نەزانین و لە خۆبوردویی ئەم سەرکردە هەموو گیان هەر ئەخلاقە ئەکردەوە و لە لایەکی ترەوە زۆر خۆزگەم ئەخواست بۆ کامێرایەك بۆ وێنەگرتنی ئەو وێنە بێوێنەو دەگمەنە کە جارێکی تر دووبارە نابێتەوە تەماشای گەورەیی ئەو پیاوە بکەن لە لایەکەوە بەهۆی لە ئێمە گەورە تر بوونیەوە ؛ لە لایەکی ترەوە بەهۆی ئەوەوە لێپرساومان بوو لە لایەکی ترەوە لە ڕوی حیزبییەوە لە هەردووکمان گەورەتربوو ، لەلایەکی ترەوە نازی خزمایەتیشی هەبوو ئەیتوانی فەرمان بدا و هەردووکمان بنێرێ  لەو کاتەدا دوو هەست سەری لێدام یەکێکیان ئەوە بوو کەسێ بە تەمەنی باوکمانەوە کاریکی وای کردووە و لە بەرچاوی خۆمان کەوتین ،و ئەوی تریانیش ئەوە بوو زۆر خۆزگەم ئەخواست یان ئەو سروشتەم هەبوایە یان بمتوانیایە لاسایی ئەو سەرکردە خاکییەم بکردایەتەوە ، شەو خۆمان گەیاندە سەرقەلاَ و دوو ڕۆژ ماینەوە و کە گەڕاینەوە سەرەتا چووینە حەشارگەکەی نزیك گۆبان کە ناوە نهێنییەکە (تەپکەکان)بوو لەوێیشەوە بۆ حەشارگەکەی نزیك باوە شاسوار کە ناوە نهێنییەکەی (چکچك)بوو، هێشتا لە خەو هەڵنەسابوون هەرکە گوێیان لە دەنگمان بوو گشتیان بە یەکەوە هەڵسان و کردیانە پێکەنین واتە دایکی مناڵەکانمان بینیوە  ئەو ڕۆژە چەند کەسێکمان گۆشتی خراپیان خواردبوو حاڵیان زۆر باش نەبوو .

ئەمڕۆ خوا حافیزیمان کرد لەوانەمان کە لە گەرمیان ئەمانەوە دوو ڕۆژ دوای ئەوە بەو هاوینە گەرمە لە تەنگێکا بووین لە نیوان (توکن)و (عەزیزقادر)دا تابڵێی دنیا گەرم بوو سێبەرمان نەبوو کەرەکەیشمان کەوتبووە لای با کەوە و بۆنێکی زۆر خەستی لێوە دەر ئەچوو خواردنیشمان هەر هیچ پێ نەمابوو ئەوە جگە لەترسی هاتنی کۆپتەرو جێش و جاش، لێپرسراوەکەمان وتی ناو هەگبەکە بگەڕێن بەشکو شتێکی تیا بێ ،کە گەڕان چەند دانەیەك قەیسی وشکەوە کراوی تێدا بوو، ساویمانەوەو هەیەکەمان نزیکەی پەرداخێکی بەرکەوت ئەو ڕۆژە درێژەی هاوین ئەوە هەموو خواردنێکمان بوو ئەو کاتە پەیمانمان دا هەرکاتێ کەوتینە خۆشیان وەگو ڕەمزێك بۆ ئەم ڕۆژە هەموو جارێ لە سەر خوانی نانخواردن پەرداخێ شەربەتی قەیسی دانێین بەلام ئەو بەڵێنەیشمان چووە پاڵ بەڵێنەکانی تر ، ئا لەم حاڵە خۆشەداو لە ناکاودا نیوەڕۆ کۆپتەریش هات جا مرۆڤی ویژدان زیندوو بە خەیاڵ بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارەو هیچ نەبێ تەنها ئەو ڕۆژە وەك خۆی هەڵسەنگێنێ ڕەنگە بەس بێ بۆ سەختیی و مەینەتییەکانی ئەو قۆناغە کە بۆ ئەمڕۆ هیچ بایەخێکی نییە لای دەسەلاتدارانی ئەمڕۆ، ئەو خەبات و تێکۆشانە نەك وەك پرسێکی تاکە کەسی بەڵکو بۆ ئەرشیفی خەباتێکی تا ڕادەیەك تازە بابەت لە ولاتێکی بێ مرۆڤدا ئەکرا سودێکی لێوەربگیرایە .

ئێوارە کەوتینە ڕێ شەو گەیشتینە (پێنج ئەنگوست)بەلام زۆر ماندو چونکە لەنیوان هەردو و خاندا کەرەکەمان چەقی و دوژمنیش زۆر لێمانەوە نزیك بوو .

٧/٧ ئەو هاوڕێیانەمان کە ماوەیەکی زۆر بوو هەرهەوڵی هاتنیان ئەداو هەرجارەی ڕووداوێك پەکی ئەخستن گەیشتنە لامان، ئەو کاتە لای سپێسەر بووین شەوێکی خۆش بوو، لەو ماوە زۆرەدا ئەوە یەکەم جار بوو گۆڕانکارییەکی وا لە کەسەکاندا دروست ببێ ئەوانەیش بە گاڵتە نەگەیشتبوونە لامان . هەر ئەو کاتە هەواڵی کابرایشمان پێگەیشت کە تەسلسم بووەتەوە ئەوە خەمێکی زۆر گەورە بوو

بەتایبەتی بۆ ئەوانەی ناو شار و ئەوانەیش کە لە دوای ئێمە لە گەرمیان ئەبن چونکە ئەو هەموو نهێنییەکی ئەزانی و زۆریش ڕقی لە هەندێکمان بوو بەتایبەتی لێپرسراوی یەکەممان بەڵام زۆر باش بوو برایەکی کارێکی وای کرد نە ئەو تیا چوو نە ئێمە ، ئەم شوێنەی لای سپێسەر گەرچی زۆر دووره ئاوەدانیش بوو کەچی مشکێکی زۆر زۆری هەبوو شەو کاتێك لە خەو ڕاپەڕیم مشکێك گازی ئەگرت لە لێوم ئیتر هەر ئەوە نەبوو دڵ و دەروونم دەرچێ چونکە پیسترین گیاندار لای من مشکە هەر تفم ئەکرد بە بەردەوامی بۆ ماوەیەکی زۆر .

(١٣)ی ئەم مانگە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بوو لە توێی دوو بەردا بووین، لە زۆربەی ڕۆژەکانی لەوەو پێش خواردنمان کەمتر بوو تەنها تۆزێ لەو کولیچەیەمان هەبوو کە جاران ئەکرا لە کاتی بووك بردندا ،کە بریتی بو، لەو هەویرەی کەلول ئەدراو بە ئەستورایی بورمە و دواتر بە چەقۆ پارچە پارچە ئەکرا هەر پارچەیەکە بە درێژایی بەرووییەك و بەسەر هێڵەکا ئەهێنرا و لە ڕۆنا سوور ئەکرایەوە ، جەژن هەر وا ئەبێ نەتەوەیەکی گەورە بچوکترین قەوارەی نییە بەشێکی زۆری کە لە سەد هەزار زیاترە بێسەرو شوێنە و کەس نازانێ کراونەتە ژێر خۆڵی کام بیابانەوە بەشێکی تری ئاوارەی وڵاتانی دەوروبەرەو هەر ڕۆژێ تاوانێکی نامەردانەیان دەرهەق ئەکرێ لەو پەڕی کوله مەرگیدان بەشێکی تر کزۆڵەی ناو ئۆردوگاکانی سەگە هاربووەکەی (عۆجە)یە ئە مەیش ئێمەین لە نیوان دو بەردا نازانین چی کاتێ کۆپتەر ئەبێتە ڕۆحکێشمان .

٧/١٤ دڵتەزێنترین هەواڵمان بیست لە ڕادیۆی حیزبی دیموکراتەوە کە هەواڵی کۆستێکی گەورەی تربوو ئەویش شەهید کرانی شەهید دکتۆر عبدالرحمانی قاسملو و هاوڕێکانی بوو لە ڤییەننای پایتەختی نەمسا (ئۆتریش) داخی گەورەی تریش دەربازکردنی تاوانباران بوو بە هۆی بەرژەوەندی نیوان وڵاتانەوە، کە ئەمجارەیش قوربانییەکە هەر کوردە .

له( ١٩ )ی ئەم مانگەدا ژنانی کورد بەشداری کۆنفرانسی ئافرەتانی جیهانیان کرد له ولاتی (سوید)و له هۆڵی (گەل )کە( هێرۆخـان ) و (پـەروین خـان )وەکـو دوو ژنـی کورد ئامادە بوون رۆژی دواتر رۆیشتین بۆ (هەسەن کەنۆش)و شـتەکانمان وەرگـرت و گەڕاینەوە بۆ (پێنج ئەنگوست)و رۆژی دواتریش کەوتینە رێ و لە سەر (ئاوە سپی ) شەهید مامە قالە دیار نەما، دوای ماوەیەك دەرکەوت و جارێکی تـریش هـەم دیـار نەما، بە تەقەکردن دوژیمانەوە ژانی کردبوو بە هۆی ئاوەوە .

بـە گـوێرەی هەڵوێسـتەکانی وا دیـار بـوو ژژێـم ئاگـادار بـوو لـە هـاتنی ئـەو هاوڕێیانەمان و ئاڵ و گۆڕکردنی ئەو هێزانەی گەرمیان کە ماوەیەکی زۆر بـوو نـەگۆڕا بوون ،هەموو دەربەنەکان گیرابوون لە قەرەداخ . لـە کاتـژمێر ( ٥) ی دوای نیـوە ڕۆ کەوتینە رێ (١٢)ی شەوە گەیشتینە لای شـەهید حەمـە ڕەش و لێـی خـەوتین رۆژی دواتر رۆیشتین بۆ ئەو شوێنەی سەرکەوتی لێ کەوتە خوارەوە کە کەس بڕوا ناکا لەو شوێنەوە یەکێ کەوتبێتە خوارەوەو نەیشمردبێ شەهید حەمەڕەش وتی رۆژێ چـەند جاشێ لە ڕەبیەکەی سەر ئاشداخەوە هاتنە خوارەوە و زۆر لێما ن نزیك کەوتنەوە و یەکێکیان وتی (رقت لە یەکێ بێ لەو شوێنەوە بیخەیتە خـوارەوە ) مەبەسـتی ئـەوە بوو یەکسەر گیانی دەر ئەچێ وتی (خەریك بوو بڵێم کەوتە خـوارەوەو هیچیشـی لـێ نەهات ) یەکێکی تریان وتی (بە شەرەفم لەوێوە تا ئـەوێ خـەڵکی تیایـە) مەبەسـتی ئەو سنورە بوو کە ئەشکەوتەکەی ئێمەی تێ ئەکەوت ئەوەی نـەیبینێ نـازانێ چـەند سەختە ئەبوایە وەکو چۆن سواری کەر ئەبێ بەو شێوەیە سوار بوایەیت و هەر جارێ تـەکێکت بدایەتـە بـەرەوەو بـەو جـۆرە تـاکو تێپـەڕ ئـەبووی لـەو مەسـافەیە ئـەوجا ئەچوویتە ناو ئەشکەوتێکەوە دەمەکەی بچووك بوو بەڵام لە نـاوەوە فـراوان بـوو لـە دامێنی شاخەکەیشەوە تا سەر ئەکەوتی تەواو ماندو ئەبووی ئەوجا ئەگەیشتیتە ئـەو ئەشکەوتە دوژمن گومانیشی بکردایە و بهاتایەتە زۆر نزیکیشی نەیئەزانی چۆن بگاتە ناوی . شەهید حەمەئاخە خەڵکی خێڵی ئاخە بوو کە هاوسـنوری ئـەم شـوێنە بـوون

که چی ئەیوت نەمزانیوە شوێنی وا هەیە تا دوای ئەنفال من خۆم پرسیارم لە شەهید حەمەڕەش کرد، ئەمەت چۆن دۆزییەوە وتی (بە منالّی کە لە گەڵ مالّدا ئەهاتین بۆ تەکیەی پێنج ئەنگوست یەکسەر لە گەڵ هاوڕێی خۆمدا ئەکەوتینە گەڕان بەو شاخەدا زۆریش خولیای دۆزینەوەی شوێنی سەخت بووم ، بۆ ئەوەی بۆی بچم ئەو کاتە شارەزای ئەم شوێنە بووم و کە کەوتینە ئەم ڕۆژەوە یەکسەر کەوتەوە بیرم ) .

شەهید حەمەڕەش وتی (ڕۆژێ جاشەکان هاتن بۆ ئەم ناوە یەکێکیان ماکەرێکی پێ بوو ، لە هاوڕێکانی جیا بووەوەو چووە پەنایەك و دوای لێی گرت و کاری خۆی کرد دەنگم نەکرد تا تەواوی کرد هێشتا خۆی گرد نەکردبووەوە فیکەیەکم لێی کرد خراپ شپرزە بوو ، بەلاّم نەیئەزانی لە کوێوە فیکەکەی لێ کرا بە گشت لایەکدا هەر چاوی ئەگێڕا و دواتر هەلّم بۆی نارد کە من بومە چونکە ئەمناسی ) .

٧/٣١ لە سەر شاخەکەی پشتی ڕەوات نانی بەیانیمان خوارد ،کە شەوی پێشو لە سەر مالّەکانی ڕەوات بووین ،و بەر لە خۆر کەوتن شۆڕ بووینەوە بۆ ناو (قۆپی قەرەداخ) ڕێمان ئەکرد تەرمی سەربازێکی دوژمنمان بینی تۆزێ خۆلی بە سەرا کرا بوو ، بەلاّم هەردوو پۆستالّەکەی بە دەرەوە بوو ، نایشارمەوە زۆر زۆر خۆشحاڵ بووم خوشییەك لە ناخەوە خۆشحاڵ ئەبووم، نەك دانەیەك و بە کوژراویش بیدۆزمەوە بەلّکو حەزم ئەکرد هەرچی سەرباز هاتبوو بۆ شەڕکردن بەرانبەرمان هەر هەمووی بە دەستی من بکوژرایە ئەم ڕایەم زۆر بە ڕاشکاوی لای یەکێك لە سەرکردە گەورەکانی ئەم ولاّتەدا باس کردوەو پەشیمانیش نیم لێی و تا ئەمرم گەورەترین ئاواتم ئەوەیە هیچ نەبێ تۆلّەی دواین ئەنفال لەو نەتەوەیە بکەمەوە کە دەیان جار ئەنفالیان کردوین و هیچ نەماوە پێمانیان نەکردبێ و بە مافێکی زۆر ڕەوای خۆیشمی ئەزانم هەم لە ڕووی ئاینییەوە هەم لە ڕوی دنیاییەوە. دوای نیوە ڕۆیەکی درەنگ وردەوردە سەرکەوتین بۆ سەر ئەو شاخەی پشتی تەکێ و زۆر ماندو بووین ، تا

سەرکەوتین لە سەر شاخ شارەزاکەمان کە لە ئێرانەوە هاوڕێکانی تری گەیاندە لامان و ئێمەیشی بەرەو ئەویٚ ئەبرد بە جیهاز هاوڕێکانی وەرگرت و ماوەیەك قسەی کرد، بەلاّم لەترسی دوژمن ئەبوایە بە ئاماژە گفت و گۆ بکرایە لە یەك تێنەگەیشتن ، ئەم شارەزایە پێشمەرگەیەکی خاوەن بیرو باوەڕبوو زۆر ئازا زۆر دلّسۆزو چاونەترس و شارەزاو ئامادە بۆ گشت کار بوو لە کاتێکدا خەلّکێکی زۆر تووشی ڕەشبینی هاتبوو ، هەندێکی هەر بەتەواوی هەرەسی کرد کەچی ئەم و هاوڕێکانی لەو ڕۆژگارە سەختەدا نەك جاریٚ بەلّکو چەندان جار لە ئێرانەوە ئەرك ئەدرا بە سەریانا و ئەهاتنەوە و ئەنجامیان ئەداو ئەگەڕانەوە بیٚ ئەوەی بزانن ماندو بوون چییە؟ یان مەترسی چییە؟ یان خاوبوونەوە ئەوەندە هاتن و چوون تا لە ناو شارا کەوتنە بۆسەی ڕژێمەوە و پاش ماوەیەکی زۆر مانەوە لە زیندانندا بەر لێبووردنی گشتی کەوتن و ئازاد کران لەو پێناوەداو بۆ گەیاندنی پێشمەرگە بە ناوچەکان لێیان لاقی پەڕی،لە بەر ئەوەی هەموو دەربەنەکان گیرا بوون ناچار بووین لە سەختترین و بەرزترین شوێنەوە چووینە خوارەوە ، زۆر جار پەنامان بۆ پشتوێن ئەبرد و لێرەیش شەهید حەمەڕەش گەورەیی خۆی دووپات کردەوە لەتوانای سەرکەوتن و دابەزین و دابەزاندنی خەلّك لە شاخی زۆر سەختەوە .

هەرجاریٚ کە ئەچمە ناو دنیا بەرینەکەی خەیالّەوە و هەلّس و کەوتەکانی ئەو سەرکردەیە ئەهێنمەوە بەرچاوم کە بۆ هەر هەلّوێستیٚ کە ئەهاتە پێشەوە بە دەروون و پشویەکی یەکجار بەئارام و دلّێکی گەورەوە زۆر بە ئاسانی چارەسەری بۆ ئەدۆزییەوە، ئەو ڕۆژەی کەوتینە ڕیٚ ناوساجییەکی زۆر کرا بوو، وەکو یەك دابەشی کرد بە سەرمانا خۆیشی هەروەکو ئێمە بە بیٚ کەم و زیاد هەروەها برنج و ڕۆن و شەکرو چایی و هەر شتێکی تر کە بۆ ئەو سەفەرە دوورە پێویست بوو، یەکێمان کە لە خۆیەوە زۆر زۆر نزیك بوو ئەیوت من هیچ هەلّناگرم ئەویش وەکو چۆن دەریا لێلّ نابیٚ ئاوا ماوەیەکی دوور و درێژ هەر هەولّی لە گەلّ دا و ئەویش هەر سوور بوو لە

سەر ڕاکەی خۆی و ئەمیش هەر لە گەڵیا ڕۆیشت ئێمە هەموومان لەدڵەوە تەواو تووڕە بوو بووین کەچی ئەو ئەتوت مێشێکیش میوانی نییە تا لە ئەنجامدا قەناعەتی پێکرد خۆ هەموو کەسێکیش ئەزانێ لە ئازایەتیدا چۆن شێرێك بوو کە نەك لە پێشمەرگەیەکی زۆر نزیك لە خۆیەوە بەڵکو لەکەسی زۆرئازایش باکی نەبوو .

درەنگانێ دوای ماندوبوونێکی زۆر کە تەواو شل و کول بوو بوو ین بەلای خۆری ئێوارەی تەکێدا چووینە خوارەوە و ڕومان کردە ئاوایی (ئەسێل)لە کلکەی شاخەکەی سەر ئاوایی (سێوسێنان) کاتێ گەیشتین هەر دارو پەردویەك کە تا ئەو کاتە نەسووتا بوو ئاگریان تێبەردابوو، ئاگر نێڵەی ئەهات وا دیار بوو تازە لەو ئاواییە دەرچوو بوون هیچ نەوەستاین و خۆمان کوتا بۆ شاخەکە ؛ بەڵام کە لێی نزیك بووینەوە هێزیکی گەورە لە ڕێگەماندا بوو، لەوەیش ئەچوو جێگیر بێ بەناچاری گەڕاینەوەو لە ناو دۆڵێکی زۆر کراوەدا لە لای خۆرئاوای ئەسێڵەوە تا ئێوارە ماینەوە ئەگەر ئێستە خۆمانیش نەك خەڵك بڕۆینە ئەو ئەو شوێنە بڕوا ناکەم بچێتە ئەقڵمانەوە گیان بەوە بوو نە کۆپتەر هات نە جاش و جێشیش دەرچوو بۆ کێومالکردن ئەنا تیاچوونمان تەواو مسۆگەر بوو .

دوای ئەوەی بە تەواوی دنیا تاریك بوو لەو ئاستە ڕوومان کردە شاخەکە ، کە چاومان کەوت بەو هەموو گلۆپەی (ئەسر) و (باریکە) و(زەڕایەن)و (هەڵەبجەی تازە) و(عەربەت) و گشت ئاوەدانییەکانی شارەزور کسپەیەك لە ناخمانەوە هەڵسا بۆنی بۆکوڕوزی تامەزرۆیی لێ ئەهات بۆ ژیانێکی ئارام بۆ دانیشتن بە ئاسودەیی بۆ ئاوەدانی بۆ خەڵك بۆ خواردنێکی بەتام کە ژن لێی بنێ بۆ لە باوەشگرتنی منداڵی تینوی باوك بۆ بینینی هاوڕێ و دۆست . ڕۆشنايیەکانیان کاریگەرییەکی سەیریان هەبوو خۆشمان ئەوەمان چاوەڕوان نەئەکرد زایەڵەیەکی بێدەنگ لە ناخی هەموماندا لە ئاهەنگی خۆیدا بوو بەرەو خوار کشاین لە هەندی شوێندا بە ئاسانی خۆمانمان بۆ ڕانەئەگیرا لە ناو قەدی شاخەکەدا هەر کێ بۆخۆی شوێنێکی خۆش

کرد بۆ نیوەی شەویَ نەك شەویَ هەر زوو پێیان وتین هەریەکەو تا ئێوارە تەنها یەك مەتارە ئاوی هەیە بە تەمای یەك چۆڕ ئاو مەبن ئەبێ باش دەستی پێوە بگرن ئەو ڕۆژە بۆ ئاو حالّمان زۆر شڕ بوو ئەگەر خوێنەر بە خەیالّ بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارە بەو هەموو مەترسییەوە و لە شاخێکی وا بەرزی دابێ و مانگی ئاب بێ ئەبێ ئەوخولەکەکانی ئەو ڕۆژە کیسەلّ لە چاویانا چی جۆرە ئاسکێك بێ . ئەوەی ئەوەندەی تر بارەکەی قورس تر کرد هاتنی ئەو هەمو ڕان و گاگەل و تراکتۆرە بوو بە خەلکەکەوە بۆئەو بنارە، و نزیك کەوتنەوەیان لێمانەوە تا ڕادەی دلّە ڕاوکێ دەرکەوتنمان لەوانەوە کاتێ ئەوانە لە بنارەوە بەرەو پێدەشت گەڕانەوە هەناسەیەکی قولّمان هەلّکێشا هەمووی هەر ئۆخەیش بوو ، دەمەو خورئاوا بەولاپالّەدا بەرەو (وێلەکە) بووینەوە کەمێکمان مابوو لە لای سەرووییەوە ئاوێکی کەممان دۆزییەوە کە ڕاوچی بۆ کەو ڕێکیان خستبوو نازانم بلّێم وەك چی جوان بوو خۆش بوو ئاسودەیی ئەبەخشی ئاوێکی زۆرمان خواردەوە تینوێتیەکەمان لەوەدا نەبوو . دارەکانی وێلەکە هەنجیرێکی زۆریان پێوە بوو هەتا توانیمان هەنجیرمان خوارد بەرەو (عەربەت )کەوتینە ڕێ لە ژێر پردەکەی لای دەواجینەکانەوە چووینە ئەوبەر و ڕومان کردە خۆرهەلاّت و بەشێکمان تووشی سکچوون هاتبووین و زۆر کەم هێزی کردبووین و گیانمان بوو بووە ملمان و زۆرمان لە خۆمان ئەکرد بەلای چەند دەواجینێکی تردا تێپەڕین ،و سەگی یەکێکیان هەر ئەوە نەبوو کەلّپەمان لێ گیر کا ماویەك ڕۆیشتین و لە کام لوتکە زۆر بەرزە لەو زنجیرە دا لەوێوە سەریان خستین شارەزاکە جگە لە تاقم و تفەنگەکەی خۆی هی نەوەیشی هەلّگرتبوو کە پەکی کەوت و تۆزێ دلّمان بەوە خۆش بوو، گوایە بارەکەی قورس بوو کەمێ خاوی ئەکاتەوە یان لابەلا شاخەکە ئەبڕێ کەچی مەقەسی گەزی کرد بەرەو نوکی شاخەکە و شۆڕبووینەوە بۆ (پووشێن ).

٨/٣ که دنیا ڕووناك بووەوە بردینیانە ناو ڕەزەکانی پووشێن و هەندێ نانە ڕەق که لە زۆر زووەوە لەویدا جێ هێڵرابوو لە گەڵ هەندێ ترێ و هەڵوژەدا قاوەڵتی ئەو بەیانییەمان بوو، بۆ نیوە ڕۆ چووینە ژێر دار گوێزە گەورەکەی (گورگە یەر)و شارەزاکەمان تەپسی بۆ کردین که چێشتێکی زۆر چاوەڕواننەکراو بوو بۆ ئەو ساتەی تەمەن و تامێکی زۆر تایبەتی هەبوو، بەمێزیی ویستی پۆلاینی ئەگەیاند لە گەڵ بەگژداچوونی سەختیی خەبات و خۆبەدەستەوەنەدانی ڕەشبینی بە تایبەتی بۆ شارەزاو ڕێزانەکەمان .

درەنگانێ لە گورگەیەرەوە کەوتینە ڕێ بەرەو (نۆدێ) لەو نێوەدا شارەزاکەمان کەمێ ڕێگەی لێ تێکچوو، شەهید حەمەڕەش وای دانابوو لاماندواوە هەر وایش دەرچوو، ئەو شەوەیش هاتینەخوارەوە بۆ شارەزوور هەروا مشت و مڕێکی زۆریان کرد، لە سەر کانییەکی زۆر بچووك بەو شاخەوە لەوەیشدا قسەکەی ئەو بوو دوای ئێوارەیەکی درەنگ بەلای نۆدێدا تێپەڕبووین سەگەکانی ڕەبیەکە کارێکی خراپیان پێکردین، کەچی زەلام دەنگی نەبوو زۆر نەڕۆیشتین بە قەراخ ڕێکەوە لێی پاڵکەوتین بەیانی بەپاڵی شاخێکدا هەڵزنیاین و لە ناو دارەکانا خۆمان لە چاو گوم کرد ،و پێیان وتین نابێ بجوڵێین . هەندێ ترێیان بۆ هێنااین چێشتەنگاو شەهید کاك ئەحمەد وتی (ئەم شاخە ناوی (کەتو)وە خولە پیزە کاتی خۆی لەیرە دا بووە )قسەکەی تەواو نەکردبوو گریانێ سەری لێدام کاکە ئەحمەد چەند هەوڵی ئەدا و تانەی لێ ئەدام هەر چاری خۆمم نە ئەکرد ،خۆی پەیدا بوو بووخۆی لە هەقە جێی خۆیەوە هەڵقەلابوو بە من چۆن ڕانەگیرێ ئەوکاتە تەنها جەستەیەکی بێ ئیرادە لای ئەو کەڵە شەهیدەدا بوونیی هەبوو ،دەنا ڕۆح گەڕابووەوە بۆ ڕۆژگارێکی دێرین کە تیایدا هەر تاکێکی کورد ئەیتوانی لە دەوڵەت یاخی بێ دەسەلاتی ئەو چەرخ و زەمانە بێنیتە زەلزەلەت ،کەچی وا ئەمڕۆ تروسکایی چرای ژیان تەواو کزبووەو خەریکە ئەکوژێتەوە کورد زۆر کەساسە بەشێکی کەس نازانێ چیان پێکرا ،ئەوەیش

که ماوەتەوە چاوەڕوانی چارەنووسێکی نادیار ئەکا ،دوژمـن نیـازی زۆر خراپـە بـۆی بلویٚ تاقەبڕی ئەکا .

که خۆر لارۆ بوو کەوتینە ڕیٚ بە ولاتێکی چۆلٚ و هۆلٚ و کپ و بێسروەدا ،تەنانـەت چاومان بە مەلیش ناکەویٚ زۆر سـەیرە تـاکو مەلـەکانیش دوای ئـەو خەلٚکـە چـاویان بەرایی نەدا لەو ولاتەدا بژین وا دیارە پەیمانیان داوە تا ئەوان نەگەڕێنـەوە ئـەوانیش لە گەلٚ ئەم خاکەدا (شیر وشترو دیار عارەبەکەیە )یـان ئـەوەتانیٚ هـەموویان بەگـەل بـەرەو بیابانـەکان کۆچـیان کـردوە، و پـەڕوپۆی خۆیـان گۆڕیـوە تـا دالٚـە دەنـوك لارەکانی دڕندەکانی (عۆجـە)نەیانناسـنەوە ڕۆیشـتوون بـۆ سـۆراخی ئەوانـەی کەلـە قافلٚەکەی ئەو خوارە هەر چاو لە ڕێین بگەڕێنەوە ڕنگە بەڕۆژیش نەتوانن بسوڕێنەوە چونکە چاوە زەردەکانی مـرۆڤ خۆرەکـانی ئـەو سـەردەمە ئـەیانبینن و جـەلادەکانی دەست و مێشك بە شمشێر یان لیٚ ئاگادار ئەکەنـەوە و ئـەوانیش ئەبەنـە لای ئـەوانی تر، ئەمان هەر بە بۆن ولاتی دار بەڕوو و بەفرو گوێز ئەیانناسنەوە، گەر ئـەوان هـەر بەسەر زەوییەوە بن ئەمان یەکسەر ئەیانناسنەوە ،چونکە ئەوان غەریبن و غەریبیش دیـارە یـان تـۆ بلٚێـی دوای ئـەوان ئەمانیشـیان بـە دەردێکـی تـر نـەبردبیٚ . شـەو گەیشتینە سەر شوێنێکی بـەرز کـە هەوارگـەی یەکەیـەکی گـەورەی سـەربازی کـاتی شەڕی ئێراق_ئێران بوو، هەر عـەودالٚی هـەوالٚی هاوڕێیـانی شـارەزاکەمان بـووین بـە جیهازەکە هەر بانگی ئەکردن لە پڕێکدا دەنگیان لە ناو جیهازەکەدا پەیدا بـوو بـووە خۆشییەکی زۆر خۆش کەپرسیاری لێکردن لـەکوێن ؟ و ئـەوانیش ناونیشـانیان دایـە جیهازەکەی کوڕانەوە و دەستی کردە بانگە بـانگ و لـەو لامانـەوە وەلامیـان دایـەوە ئەوەندە نزیك بوون گەیشـتینە یـەك، بـەلام چـۆن بـە یـەك گەیشـتنێك ئێمـە سـەراپا جەسـتەو ڕۆحمـان تامەزرۆییـە بـۆ دیتنیـان و سوپاسـکردنیان و سەرسـامبوون بـە ئازایەتی و لە خۆبوردوییان ئەوان فریشتەی میهری کوردایـەتی بـوون هـاتبوون ئیمـە لـە مەملەکـەتی ئەهریمـەنی ئـەو ڕۆژگـارە وە ببـەن بـۆ مەملەکـەتی ئاهورامـەزدای

٨/٣ که دنیا ڕووناك بووەوە بردینیانە ناو ڕەزەکانی پووشێن و هەندێ نانە ڕەق کە لە زۆر زووەوە لەویدا جێ هێلڕابوو لە گەڵ هەندێ ترێ و هەڵوژەدا قاوەڵتی ئەو بەیانییەمان بوو، بۆ نیوە ڕۆ چووینە ژێر دار گوێزە گەورەکەی (گورگە یەر)و شارەزاکەمان تەپسی بۆ کردین کە چێشتێکی زۆر چاوەڕواننەکراو بوو بۆ ئەو ساتەی تەمەن و تامێکی زۆر تایبەتی هەبوو، بەهێزیی ویستی پۆلایینی ئەگەیاند لە گەڵ بەگژداچوونی سەختیی خەبات و خۆبەدەستەوەنەدانی ڕەشبینی بە تایبەتی بۆ شارەزاو ڕێزانەکەمان .

درەنگانێ لە گورگەیەرەوە کەوتینە ڕێ بەرەو (نۆدێ) لەو نێوەدا شارەزاکەمان کەمێ ڕێگەی لێ تێکچوو، شەهید حەمەڕەش وای دانابوو لاماندا‌وە هەر وایش دەرچوو، ئەو شەوەیش هاتینەخوارەوە بۆ شارەزوور هەروا مشت و مڕێکی زۆریان کرد، لە سەر کانییەکی زۆر بچووك بەو شاخەوە لەوەیشدا قسەکەی ئەو بوو دوای ئێوارەیەکی درەنگ بەلای نۆدێدا تێپەڕبووین سەگەکانی ڕەبیەکە کارێکی خراپیان پێکردین، کەچی زەلام دەنگی نەبوو زۆر نەڕۆیشتین بە قەراخ ڕێکەوە لێی پاڵکەوتین بەیانی بەپاڵی شاخێکدا هەڵزنیاین و لە ناو دارەکانا خۆمان لە چاو گوم کرد ،و پێیان وتین نابێ بجوڵێین . هەندێ ترێیان بۆ هێناین چێشتەنگاو شەهید کاك ئەحمەد وتی (ئەم شاخە ناوی (کەتو)وە خولە پیزە کاتی خۆی لەیرە دا بووە )قسەکەی تەواو نەکردبوو گریانێ سەری لێدام کاکە ئەحمەد چەند هەوڵی ئەدا و تانەی لێ ئەدام هەر چاری خۆمم نە ئەکرد ،خۆی پەیدا بوو بووخۆی لە هەقە جێی خۆیەوە هەڵقەلابوو بە من چۆن ڕاتەگیرێ ئەوکاتە تەنها جەستەیەکی بێ ئیرادە لای ئەو کەڵە شەهیدەدا بوونیی هەبوو ،دەنا ڕۆح گەڕابووەوە بۆ ڕۆژگارێکی دێرین کە تیایدا هەر تاکێکی کورد ئەیتوانی لە دەوڵەت یاخی بێ دەسەڵاتی ئەو چەرخ و زەمانە بێنیتە زەلزەلەت ،کەچی وا ئەمڕۆ تروسکایی چرای ژیان تەواو کزبووەو خەریکە ئەکوژێتەوە کورد زۆر کەساسە بەشێکی کەس نازانێ چیان پێکرا ،ئەوەیش

که ماوەتەوە چاوەڕوانی چارەنووسێکی نادیار ئەکا ،دوژمن نیازی زۆر خراپە بۆی بلویێ تاقەبڕی ئەکا ٠

که خۆر لارۆ بوو کەوتینە ڕێ بە ولاتێکی چۆڵ و هۆڵ و کپ و بێسرووەدا ،تەنانەت چاومان بە مەلیش ناکەوێ زۆر سەیرە تاکو مەلەکانیش دوای ئەو خەڵکە چاویان بەرایی نەدا لەو ولاتەدا بژین وا دیارە پەیمانیان داوە تا ئەوان نەگەڕێنەوە ئەوانیش لە گەڵ ئەم خاکەدا (شێر وشترو دیار عارەبەکەیە )یان ئەوەتانێ هەموویان بەگەل بەرەو بیابانەکان کۆچیان کردوە، و پەڕوپۆی خۆیان گۆڕیوە تا داڵە دەنوك لارەکانی دڕندەکانی (عۆجە)نەیانناسنەوە ڕۆیشتوون بۆ سۆراخی ئەوانەی کەلە قافڵەکەی ئەو خوارە هەر چاو لە ڕێین بگەڕێنەوە ڕنگە بەڕۆژیش نەتوانن بسوڕێنەوە چونکە چاوە زەردەکانی مرۆڤ خۆرەکانی ئەو سەردەمە ئەیانبینن و جەلادەکانی دەست و مێشك بە شمشێر یان لێ ئاگادار ئەکەنەوە و ئەوانیش ئەبەنە لای ئەوانی تر، ئەمان هەر بە بۆن ولاتی دار بەڕوو و بەفرو گوێز ئەیانناسنەوە، گەر ئەوان هەر بەسەر زەوییەوە بن ئەمان یەکسەر ئەیانناسنەوە ،چونکە ئەوان غەریبن و غەریبیش دیارە یان تۆ بڵێی دوای ئەوان ئەمانیشیان بە دەردێکی تر نەبردبێ . شەو گەیشتینە سەر شوێنێکی بەرز کە هەوارگەی یەکەیەکی گەورەی سەربازی کاتی شەڕی ئێراق_ئێران بوو، هەر عەوداڵی هەواڵی هاوڕێیانی شارەزاکەمان بووین بە جیهازەکە هەر بانگی ئەکردن لە پڕێکدا دەنگیان لە ناو جیهازەکەدا پەیدا بوو بووە خۆشییەکی زۆر خۆش کەپرسیاری لێکردن لەکوێن ؟ و ئەوانیش ناونیشانیان دایە جیهازەکەی کوژانەوە و دەستی کردە بانگە بانگ و لەو لامانەوە وەلامیان دایەوە ئەوەندە نزیك بوون گەیشتینە یەك، بەلام چۆن بە یەك گەیشتنێك ئێمە سەراپا جەستەو ڕۆحمان تامەزرۆییە بۆ دیتنیان و سوپاسکردنیان و سەرسامبوون بە ئازایەتی و لە خۆبوردوییان ئەوان فریشتەی میهری کوردایەتی بوون هاتبوون ئێمە لە مەملەکەتی ئەهریمەنی ئەو ڕۆژگارە وە ببەن بۆ مەملەکەتی ئاهورامەزدای

ڕۆژگاری دێرین . بە تووڵە ڕێیەکی باریکدا ئێمەیان بەرەو خوارکردەوە بە بستیش نەمان ئەتوانی لێی لادەین چونکە نەك ئەملاو ئەولای تووڵە ڕێکە بەڵکو سەرجەم ناوچەکە کێڵگەی لوغم بوو، گەیشتینە شوێنێ وا دیار بوو قۆناغێ بوو بۆ خۆیشیان لەکاتی ئە مسەرو ئەو سەرکردندا هەندێ مریشکی سوورەوە کراویان پێ مابوو خواردمان، ئێمە چەند ڕۆژی دوا کەوتبووین بۆیە ئەوانیش خەریك بوو هەم خوا دنیان پێ نەمێنێ و هەمیش نائومێد بن و بگەڕێنەوە و ئیتر چاوەڕێمان نەکەن یەکێکیان ژانی کرد.

بەیانی بە( ڕومانە) چەند ماسییەکیان بۆ کوشتین و برژاندمان و برنجیشیان کردو مەلەی خۆمان کرد، هەستێکی زۆر تازە لامان ڕوا وەکو بڵێی ئیتر لەمەولا نۆرەی ژیانە وا کەوتینە سنوری ئەوەوە، بەڵام ئەوە تەنها مژدەی نهێنی بوو کە ڕۆح پێی ئەداین دەنا هێشتا کاروان نەگەیشتۆتە مەنزڵ ،دوای نیوەڕۆ بە وڵاتێکی چۆڵا کەوتینە ڕێ هەمووی هەر تەقەمەنی بوو ،لە هەموو جۆرێ چاڵی بە شۆفڵ دروست کراو بۆ تانك و تۆپ و هەموو جۆرە ئامێرێکی جەنگی و سەنگەری زۆر و ڕەبیەو ڕێگەی سەرپێی دروست کراو تایبەت بە ئیش و کاری سەربازی دوز ڕۆژ لەوەو بەر بە (موبرە)و(مامە خەلان)و ئاوی (تەنکە بوار)دا گوزەرمان کرد .

٨/٥ لە سەرووی (نۆرك)ەوە بە دۆڵێکی سەخت و شاخێکی سەخت و پشتەوشکێندا سەرکەوتین ،زۆرمان نەمابوو شەهید کاك ئەحمەد لە پێش هەموومانەوە بوو نوێژی دابەست و تا دوا پێشمەرگە گەیشتە لای تەواوی کرد بە مەرجێ نەك ئەو شەوە کە لە تەنگانەیەکی زۆر گەورەیشدا بووین ئێستە کە وڵات ئازادەو ئەو شوێنە بەشێکە لە وڵاتی خۆمان و هەرکاتێ بەشەو و بە ڕۆژ هەرکێ بیەوێ ئەتوانێ بێ هیچ ترس و دەردە سەرییەك بۆی بچێ ئێستەیش کەس ناتوانێ لەو شوێنەدا نوێژ بکات ، کاتێ تەواو نزیك بووینەوە شەهید حەمە ڕەش پێی وتین ئەمە شاخی (سوورکێو)ە،و دوا شەومانەو دوا خاڵی پەڕینەوەمانە هیچ چارێکی

ترمان نییه، ئەمشەو ئەبێ هەر بپەڕینەوە بە هەر نرخێك بووە، ئەگەر تووشی شەڕهاتین و بریندار بوون هەوڵ بدەن بەو دیوا بە تەپاوتل خۆتان غل کەنەوە ئەو دیوی شاخەکە ئێرانە . وتیشی زۆر بە ئەسپایی ڕێ بکەن با بەردی ژێرپێتان نەکەوێتە خوارەوە، تاوێرێکی گەورە کەوتە خوارەوە شەهید کاکە ئەحمەد چۆکی دایە بەری و نەیهێشت بکەوێتە خوارەوە و دەنگی بێ بەڵام ئازاری چاکی بۆی بوو ، هەمیشە وا بوو خۆی ئەکردە قوربانی ، سەربازەکان زۆر لێمانەوە نزیك بوون (١٢)ی شەو لە حاڵێکی دەروونی تایبەتدا دامان بە لایانا باش بوو دەنگیان نەکرد و بەو دیوا شۆڕ بووینەوە و هەر وەکو شارەزوور لێرەیشەوە ڕۆشنایی گڵۆپی ئاوەدانیەکی زۆرمان بینی مەگەر هەست (تعبیر)ی لێ بکات هەستی ئەو ئان و ساتە

کە لە (سورکێو) چووینە خوارەوە دۆڵێکی قوڵ بوو چنارێکی یەکجار بەرزیان هەبوو لە ژیانمدا باخی وا سەرسوڕهێنەرم نەدیوە، وتیان ئێرە (چەم پاراو)ە لەوێیشەوە بۆ ئەو ڕەبیەی کە یەکێك بە خۆی و جیهازەکەیەوە لەوێ چاوەڕوانمان بوو لەوێیشەوە بۆ ڕەبیەیەك(پادگان)ێ تر گەیشتبووینە ناو پادگانەکە و عدد جیهازەکە هەر بانگی ئەکردن ئاگایان لێ نەبوو لە دواییدا کە ئاگادار بوونەوە تێیان خوڕین و وتیان (کیست ؟) عددجیهازەکە وتی (دوست)ئیتر ئەویان ناسییەوە و زانییان کێین چونکە ئاگادار بوون . بردینیانە ژوورەوە و چاییان بۆ لێنائین و هەرچەند هەوڵمان دا لێی گەڕێن مەلاکەیان هەر هەڵساند و بۆم دەرکەوت هەموویان تورکمانن منیش بە تورکمانی قسەم کرد لە گەڵیاندا زۆریان لە لا خۆش بوو، دوای ئەوەی وچانێکی باشمان دا وتیان بۆ خۆتان و بۆ ئێمەیش واباشە عێراقییەکان نەزانن لێرەوە هاتوو چۆ ئەکەن بۆیە بڕۆنە خوارەوە باشترە کە کەوتینە ڕێ بە منیان وت تۆ مەڕۆ هەر لە بەر ئەو دەمەتەقێ کورتە، نەتەوەکانی دنیا زمان و خاك و نەتەوەی خۆیان ئاوا خۆش ئەوێ .

٨/٦ تـازه خـۆر پرشـنگی زێڕینـی بـه ئـارامی و بـێ جیـاوازی ئەبەخشـیـیه هـەموو گیاندارو بێ گیانێکی ئاواییه بچکۆلانەکەی (بلەکێ)ئێمەیش له دنیایەکی سـەیردا کـه هەرخۆمان ئاگامان لێی بـوو بـه قـەتاره چـووینه خـوارەوه، هـەق وایـه ئـەو کۆمەڵـه خەڵکه که ئەو بەیانییه بووینه میوانی ئەو خاکه هـەتا هەتایـه ئـەو ڕۆژەمـان لـه بـیر نەچێ بۆ ئیمه زۆر ناسروشتی بوو خۆرکەوتبوو کەچی کـەس بـه شـپرزەیی نەکەوتـه کۆکردنەوەی کەلوپەلەکان، بـه پەلـه بیـان باتـه ژوورەوەو جـارێ تـر چـاوێ بگێـرێ نەوەکا شتێکی با بچووکیش بێ له بیر کردبێ که گوێمان له دەنگی کەڵه شێرو دواتر کەرو دوای ئەویش سەگ و که تەواو چووینه خوارەوه دەنگی خـەڵك ئەوەنـدەی تـر کاس بووین ئەمه چییه؟ ئەمه دنیایەکی تره ئەمه لـه دایـك بونەوەیـەکی تازەیـه بـه چاکی مێشك پێی ناوتوێ نەئەکرا چەند ساتێکی تەمەن کورت بوو بـەڵام چـێژەکەی زۆر بوو وا ئەهاته خەیاڵمانا له دەرەوەی ژیان بووینه وا ئێسته گەڕاینەوه ،بـەڵام بـه ڕۆحێکی تازەو دەسکەوتێکی مەعنەوی تازەوه ، چووینه ژێـر کـەپرێك دواتـر بۆمـان دەرکەوت ئەوه بارەگایەکی سەرەکی بو ئـەو کەسـەی لـه سـەر جیهازەکـه بـوو هـەر ئەویش خەریکی خزمەت کردن بوو وەکو هاوڕێ و خاوەن ماڵیش برادەرم بوو لەوەو پێش، یەکسەر پەیوەندی کردو وتی (بەچەها بەرگەشتەن ) له گەیشتنمان ئاگـاداری کردنەوه هەر چەند بڵێی ڕێزمان لێگیرا که تێکەڵ بـوو بـه پێسەرسـامبوون و خۆزگـه پێخواستن به بێ درکاندن تەنها به چاوا دیار بـوو ئێمـەیان زۆر بـه گـەورە ئـەبینی ، ئەوه یەکەمین جار بوو خۆر بکەوێ و هیچ خەمێکمان نەبێ و لـه دڵـه ڕاوکێـدا نـەبین تەماشا ئەم چەند کاتەکەمه نەك شتێ تازەمان دراوەتێ پێی مەمنونین بەڵکو خـەمی ئەوەمان نەماوه لێمانی بسێننەوه، بۆیه زۆر زۆر پێی ئەزانین ٠ ئەم بەیانییه جیا بوو لـه بەیانییـەکانی تـر هـەم چـاوەڕێی مـەرگی لـه ناکـاو ناکـەین هـەمیش خۆمـان دانیشتووین و خزمەت ئەکرێین بۆ قاوەڵتی ماستیان هێنا به نانی تیرییـەوه لـه گـەڵ چایی شیرین هەرچیمان ئەکرد هەر تێرمان نەئەخوارد شەهید حەمەڕەش هەر ئەیوت

(خالید تێی کە)ئەویش هەر سروشتی وا بو زۆر ڕووخۆش و بە ماریفەت بوو بێ ئەوەی هیچ بێزار بێ هەر چایی تێکردو نانی تەڕکردو ماستی تێکرد .

ئەوەی لای ئەو پێشمەرگانەی بلەکێ زۆر سەیر بوو ڕەنگ و ڕومان بوو، کە بیریان لەو ماوە دوور و درێژە ئەکردەوە کەلەو ژیانە دا بووینە نە خواردنی نە خەوتنی نە شەوی نە ڕۆژی ئاسایی بووە ،و کەچی وا ئەمانبینن نەك زۆر خراپیش نین بەڵکو تێمانا هەبوو لە بەشێ زۆری ئەوانیش جوانتر بوو ئەوەی شەهید مامە قالەی ئەبینی ئەگەر زۆر ئاگادار نەبوایە زۆر گران بوو بڕوا بکا ئەو ڕەنگە جوانە هی ئەو جۆرە ژیانە تایبەتە بێ . براکەم کە وتم دوای ڕاپەڕین کە گەڕاینەوە زانکۆی تەواو کرد هاتبووە (سەقز) بۆ هەواڵی ئێمە پێش ئەوەی خۆمان ببینێ لە هەموو شتێ زیاتر پرسیاری تەندروستی کردبووم لە پێشمەرگەیەکی بلەکێ ئەویش وتبوی ناشێ وات دانابێ تۆ لەو باشتری وەڵا ئەو حاڵی لە تۆ باشترە هەرکێ ئەهات هەستمان ئەکرد زۆر بە تامەزرۆییەوە دێ حەز ئەکا لە هەموو شتێکمان ورد بێتەوە وەکو ئەوەی شتگەلێ لە ئێمەدا هەیەو لەواندا نییە ئومێدیشیان نییە لەمەولایش ببێ و کارێکی وامان ئەنجام داوە لە توانای مرۆڤی ئاساییدا نییە، بە هەموو کەس ناکرێ ئەو تێڕوانینەی ئەوان وردە وردە لای خۆیشمان شتێکی لێ شین بوو خەریك بوو ئەگەیشتینە ئەو ڕادەیە لە ڕومان بێ بە خۆمان بڵێین مرۆڤی تەواو کوردی تەواو پێشمەرگەی تەواو لە ناخەوە هەستمان بە شانازییەکی زۆر ئەکرد ،بێئەوەی ئاشکرای بکەین زۆر خۆمان بە سەربەرز ئەزانی لەوەی توانیومانە خزمەتێکی شایستە بە نیشتیمان و نەتەوەو شۆڕش و گەرمیان و یەکێتی و بنەماڵەمان بکەین ،و ئەوە بسەلمێنین کە ڕۆڵەیەکی بە ئەمەکین و توانیومانە (کۆلێژی کەڵە پیاوان )بە پلەیەکی زۆر نایاب تەواو کەین . یەکێ لەو تام و چێژەی بۆ ئەو ڕۆژە لە هەموو شتێ خۆشتربوو ئەوە بو کە ئەمانوێرا ١- بە ڕۆژ ڕێبکەین ٢-نەترسین لە کەوتنی

شوێنپێ کە ئازارێکی دەروونی هەمیشەیی بوو لە گەرمیان زۆر جار بە هۆیەوە گەیشتووینەتە گوێی گۆڕ .

وا ڕێکەوت بە گەیشتنمان بە بلەکێ ڕێو ڕەسمی (عاشورا)ی یادی ئیمام حوسێنی شەهیدی بە بنەماڵەوە ئەنفالکراو بوو وەکو وتراوە هونەر بەلای ئێرانیانەوەیە مەگەر خۆیان بزانن چۆن ڕێز ئەگرن لە ڕابوردوویان لە هەست و بیریان لە کلتوریان لە هەر شتێ بۆ نیشتیمان و نەتەوەو مەزهەبیان پیرۆزو پێویست بێ ،و چۆن نەهێڵن تاوان و تاوانباران لە بیری ئەوەی نوێ بچێتەوە و هەمووساڵێ ئەو برینە هەزارو چوارسەد ساڵییە بکولێننەوە و بە تازەیی وگەرم و گوڕی ئەو ڕۆژگارەوە بیهێڵنەوە و یەکێتی بیرو کردەوەی پێدروست بکەن و بیکەنە هەوێنی دروست کردنی هێزێکی وا هەم بەرز ڕاگرتنی ڕۆحی لایەنگران و پەیڕەوکەرانی پێ دابین بکەن ،و هەم نەتەوەیەکی تەیارکراو بە ڕۆحێکی بێسنور لە خۆ بە قوربانی کردندا بە بێ حیساب کردن بۆ مردن و بە پێچەوانەوە شانازیکردن بەو مەرگەوە لە پێناوی یادی بەرزو پیرۆزی شەهیدانی ڕوداوی کەربەلادا بێ . ئەمەیەکەم جارم بوو ڕێورەسمی عاشورا ی ئێرانی ببینم لە شەستەکان هی عەرەبم بینی بوو ، ئەو پۆلیسانەی (قوەسیار)کە لە سەرقەلا بوون هەموویان لە ( اهل التشيع)بونَ بەلام ئەمەی ئەمان لە کوێ و ئەوەی ئەوان لە کوێ ئەمەی ئەمان لە پرۆڤەی فلیمێکی زۆر ئاست بەرزئەچوو ،کە دەرهێنەرێکی زۆر کارامەی بە ئەزموون کاری دەرهێنانی بۆی کردبێ .

پێشمەرگەکانی بلەکێ هەموویان هاتن بۆ لامان و ئەوەندەیش بۆیان لوا دەعوەتیان کردین گەرچی حاڵیشیان زۆر خراپ بوو ماوەی (١٠)ڕۆژ ماینەوە بەهۆی ئەوەوە (بەرگەی تەرەدود)یان بۆ نە ئەکردین لە دوا دواییەکەیدا بۆ ئەوەی لەو بێزارییەی ئێمە کەم کەنەوە گۆڵمەزێکیان ساز کرد ئێمە پرسیاری هاوڕێکانی خۆمانمان ئەکرد کێ چۆنەو کێ چۆن نییە بە چەند شیوەیەك هەواڵی ئەوانیان پێداین

کارەسات بوو، بەڵام پڕ لە پێکەنین وایان دانابوو یەکێکیان فیشەکێك هەردوو لێوی بردوە دەمیشی بنوقێنێ وەك ئەوە وایە پێبکەنێ هەموو ددانەکانی بە دەرەوەیە بە هەمیشەیی یەکێکی تریان کە برینی لاملیان دووریوەتەوە ئەوەندە پێستی ملیان ڕاکێشاوە شان و ملی زۆر لەیەکەوە نزیك بووەتەوەو بە یەکەوە وشك بونەو ئەبێ گشت جەستەی لە گەڵ ملیا بەیەکەوە بچەمینیتەوە و یەکێکی تریان فیشەك تەنها نەرمی گوێی هێشتوەتەوە درەنگانێ پێیان وتین گەمەیە بوو بە پێکەنینێکی خۆش.

(١٥)ی مانگ بە دوو لاندرۆڤەر لە بلەکێوە براین بۆ (بانە) بە ڕێی (سوراو)دا شۆفێرەکە باسی ستەمی ئاغایەکی کۆنی سوراوی بۆ کردین کە مرۆڤ لە ڕووی نایە باسی کا چونکە ڕەفتارێکە زۆر دوورە نەك لە ڕەوشتی جوانی کورد بەڵکو لەڕەوشتی هەموو نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتیش و هەروەها چایخانەکەی هونەرمەندی پایە بەرزی کورد ، موعجیزەی هونەری کوردی مامۆستا (حەسەن زیرەك)ی نەك ئەستێرە بەڵکو مانگی ئاسمانی کوردی نیشان داین لە پەنای کێوە سەربەرزەکەی (ئەربەبا) لەبانەوە بە ڕێگای (سەرشیوی سەقز)دا ڕۆیشتین هەمووی هەر پێچاوپێچ بوو ،هەموومان ئەوەندە ڕشاینەوە کەمجار لە ژیانمانا ئەوەندە ڕشاوینەتەوە لاندرۆڤەرەکەی تر پێش ئێمە گەیشتبوون کاتێ ئێمە گەیشتینە لایان چەند کاڵەکێکمان بینی لە ناو ئەو ئاوەدا کە لاماندابووە سەری لیرەیش بەزمێکی تریان سازاند وتمان ئەمە چییە وتیان ئەمە خۆی ئەگەیی و خۆی لە برکەکە ئەبێتەوە وخۆی دێتە خوارەوەو خۆی لە سەر ئەم ئاوە ئەوەستێتەوە ئەمەیان زۆری نەبرد زوو پێی زانرا تا ڕادەیەك زۆر ئاگامان لێ نەبوو چۆن گەیشتینە (کانی دینار) کە ماڵی هەموو خەڵکەکەی خۆمانی لێ بوو بەو هەموو پێشمەرگەوە بووینە میوانی ماڵی شەهید حەمەڕەش لە کاتێکدا هیچ خێزانی بە دڵی خۆی ژیانی مناڵەکانی خۆی پێ دابین نەئەکرا خۆ هەر ئەوە نەبوو هەر ئەمرۆ بێ و بڕێتەوە بەڵکو تا ماوەیەکی دوور و درێژ بووینە کوڕی ماڵ و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوویان خۆشتر ئەبوو ئەوە بە هەموو

کەسێك نەئەکرا باسی گەورەیی چاکەی ئەو ماڵە مەحاڵە بە مـن بـاس بکـرێ چـونکە قەدری زێڕ لای زێڕنگەرە و وەکو شـاعیر ئەفـەرموێ زانـای دورناسـی ئـەوێ هەیەکـە ئاواتی گەورەی خۆی هەیە منیش یەکێك لە ئاواتە گـەورەکانم ئەوەیـە خـوا بـۆم بکـا بەر لەوەی بارو بنەی یەکجاریم بپێچمەوە و ڕۆحـی پـڕ لـە تاسـەم بگاتـەوە خزمـەت ڕۆحە بەرزو شـکۆدارەکەی بەشـێکی زۆر کـەمی ئـەو قـەرزەم دابێتـەوە زۆر خۆزگـە ئەخوازم بمتوانییایـە وەسـفێکی وای شـەهید حەمـەڕەش و شـەهید کاکـە ئەحمـەدم بکردایە ڕۆحەکەیان لێم ڕازی بوایە .

هـەر بـە گەیشـتنمان خـەڵك و پێشـمەرگە سـەریان کـردەوە ڕێ وە بـەر ڕێبـوار نەئەکەوت هەروا لێشاوی ئازیزانی غوربەت بـوو ، ئێمـە بـۆنی وڵاتـی سـەتاومان لـێ ئەهات بۆنی خـاکی دیـل و چـاوەڕوان چـاوەڕوانی ڕۆڵـەکان بەشـێکیان لـە بیابـان و بەشێکیان لە ئێران کەی ببنەوە سۆمای چاوان بۆنی کانی وکاچ و هـەردە ، دەشـت و کۆل و بیر ، مەڕو کۆڕکردنی کاتی ڕادان ، دەنگی زەنـگ و پـوتی دوری نـاو ڕان ، دەنگی سوێسك و قەفەس بە دەسـتان ، قاسپەی پـۆڕی گوێچـەمی دەمـەو ئێـواران هەڵسانی ئاسك و کەروێشك و تەقەی ڕاوچیان ،کلاوێـن و کـۆڕی دیوەخـان ، چـایی و دۆینەو سەکۆی سێبەری عەسـران ، دۆی هـەس و تـۆزی سـەر خـەرمان ، سـەرەتای پایزو شەڕەقوڕی سواقدان ، ڕەشکەی داچۆڕاوو بەزمی کاکێشان ، کارو بەرخی تازە زاو و گۆشکردنی شوان .

لە ناو ئەو کەسانەدا کە هاتن شەهید ئاتیلا یەکێکیان بـو هـەر لـەڕیزەوە گرتـی بەکە یەکە تەوقەی ئەکرد کە نزیکی من بووە وە بەر لەوەی بگاتـە لام و تەوقـە بکـا وەکو ئەوەی تەنها لەمن چـاوەڕوانی کردبـێ بـە شـێوەی ئەوانـەی لـە کـاتی مـەرگی ئازیزێکیاندا کە یەکێکی زۆر نزیك لە خۆیان پێش ئەو کۆسکەوتنە دا ئەبینن و دڵیـان زۆر کوڵ تێرێ ئاوا بـە بـانگێ بـەرز وتـی (مـەلا ڕەحـیم خۆڵـت بـۆم هاوردییـە ؟) لـە ڕاستیدا وام زانی حاڵی دەروونی بـاش نییـەو ئاگـای لـە خـۆی نییـە و زۆریـش بـۆمن

ڕوگیری تێدا بوو ئەمئەزانی چۆن ڕەفتار کەم باش بوو ئەوەندە هاتمە دەم وتم خـۆلی چی ؟وتی (خۆلێ بنەکە ) ئەوسا زانیم نەك هەڵە بەلکو چی تاوانێکم کـردوە بـە هـۆی ئەو حاڵە نارەحەتەوە کە هەموومان تێیدا ئەژیاین بە ڕوزەردییەکەوە وتم نەوەلاّ کاك ئاتیلا هەر لە بیریشم نـەبوو بـەلاّم برینێکـی تـەواوی دروسـت کـرد لەسـەر پـەردەی هەستم بەلاّم تازە پەشیمانی چی دادێکم ئەدا بۆیـە لـە سـەر داوای ویـژدان و ڕۆحـی برینـداری لـە گـەلێ دەسـتەیەك پێشـمەرگەدا دوای ئـەو دیـدارە گەڕایـەوە بـۆ ولاّتـی کـەلاوەو چـۆڵەوانیی و کێومـاڵکردنی ڕۆژانـە ،بۆهەوارگـەی قیبلەکـەی دڵ گەرچـی ئەیشیزانیی  لە لەتەدیوار زیاتر جێژوان خەو وخەیاڵە کەچـی هـەر سـەرێکی دایـەوە لەو ولاّتە کە ڕۆژێك لـە ڕۆژان بـۆ ئـەو خۆشـترین بەهەشـتی ئـەم دنیایـە بـوو ،چرکە ساتێکیش هاتە پێشەوە چرکە ساتی دڵتەزێنی لێقەومان و خـەمباران و مـەرگباران و لێکدابڕان و گریان و قوڕپێوان و لەتبوونی تەنانەت بەردیش ،ئەو لەتبوونە کە دەنگی هەیە واتە ناڵەو هاواری هەیە ،ئەو وەرزە بو کـاروان کەوتـە ڕێ و هـەتا هەتایـە هـەر نەگەڕایەوە ئەوانەیش کە لە کاروان بە جێمان وەك پەیکەرێکی بێگیان بەدوای کۆچیا ئەیانڕوانیی تا لە چاو بزر ئەبوون، مرواریەکان بە هەناسەیەکی قوڵ و هەستێکی پـڕ لە ئاواتی تۆڵە سەندنەوە وتیان  نازانن چیمان پێکرا ،ئـەوەی بـە ئـەقڵتانا نایـە بـەو خەڵکـە دیلـە کـرا خـۆ ئـەوان مـوۆڤ نـەبوون، ئـەوان درنـدە بـوون ،ئـەوان لـە هـیچ کردەوەیـەکی نامەردانــە نەئەگەڕانــەوە، زۆریــش چــێژیان وەر ئــەگرت لــە هــەر نامەردییەك کە ئەیانکرد ،هەموو سنورەکانی نامووسیان بەزاند ،بەلاّم زۆر بـاش بـوو من لە بەر ئەوەی هەرچی جوانیم هەیە لە دڵێکی جێمتمانەدا بە جێم هێشـتبوو بۆیـە وەکو نازدارانی لە دیلیشدا هەر جوان لە بەرچاویان هیچم نەئەنوانـد زۆریـش هـاوارم کردو لە خوا پاڕامەوە هەرچی شێخ و مەلاو پیـاو چـاکان هەیـە هـەموویم بـانگ کـرد بەشـکو لـەڕەفتاری نامەردانـەیان بمپـارێزێ لـە دوای گشتیانیشـەوە هـاوارم کـردە ئیشقی پاك و بێگەرد ئیتر نازانم کامیان هاتنە هاوارمەوە لە حەنام چاویان کوێر بـوو

،ئای لەو سەفەرەی ئێمە کردمان ،سەفەر نەبوو هەموساتێکی مردنێ بوو ،زۆر بووین ،ئێجگار زۆر بووین ،لە ژماردن نە ئەهات ،هەرچەنێ بلێی ئەوەندە زۆر بووین ،تاکو چاو بڕکا مەکینەو عارەبانەی پڕ لە خەڵك بوو ،ئیڤاوزیلی پڕ لە داگیر کەر ،براین بۆ قۆرەتو لەوێشەوە بۆ تۆپزاوا و لەوێیشەوە بۆ بیابانی چۆڵ وسامداری ئەو خوارە ،کاتێ گەیشتین تا چاوبڕی کردایە چاڵ بوو هەڵکەنرا بوو و بەردەوام هەڵئەکەنرا بەرلە گەیشتنمان گوێمان لە هاڕەی دەسرێژ بوو کە خۆیشمانیان داگرت بوو بە هاڕە هەروا لاشە بوو بەسەریەکا ئەکەوت هەروا مێشك بوو لە گەڵ فیشەکا ئەپژا منالێکم بینی هێشتا فیشەکی بەر نەکەوتبوو گەیشتە لێواری چاڵەکەو پەنای بۆ یەکێ لە سەربازەکان هێنا ئەویش لەوە ئەچوو لەو دیمەنە حەپەسابێ و تۆزێ ویژدانی جوڵەیەکی کردبێ و وەکو سەری لێشێوا بێ و باش توانای نەمابێ لەوە زیاتر بەردەوام بێ ئەفسەرەکە بە تورەییەوە قیژانی بەسەریا و فەرمانی مەرگی ئەو منالەی دووپات کردەوە ئەویش پالێکی پێوەناو کەوتە ناو چاڵەکەوەو دایە بەر فیشەك و بەدەم هاوارێکی زۆر کاریگەرەوە کەوت بەسەر دایك و براکانیا و جۆگەلەی خوێن رچەی بەست و چاوی لێکنا و مەگەر خوابزانێ خەیالی لای کام لە بەرخەکان بێ ،بەتەمای کام یاری لە گەڵ کام هاوڕێیدا ،منالێکم بینی بوو کە شوشەیەکی بە دەستەوە بوو ،تەنانەت دوای ئەوەیش گیانی تیا نەمابو، توند توند گرتبووی بەو شێوەیە دەستی پێوە ڕەق هەلاتبوو تائێستەیش هەروایەو چاوەڕانە کەی بێن بەشوێنیانا خوی و بووکە شوشەکەی کە بەشە مالەکەیەتی بە یەکەوە بەرەو ولات بێنەوە بەلام دوچلێ ئێسکی بێ گیان ،دایکێك لەوەو بەر هەر هاواری ئەکردە خواو پیاو چاکان بەلام کە بینی لولەی کلاشینکۆف ڕووی تێکردن خۆی دا بە سەر منالەکانیا لە عەزرەتی جەرگیا چۆن کاتێ مریشك جوجکەکانی ئەخاتە ژێر بالیەوە بەلام کە فیشەکێك دای بە ناو چاوانیا لە چاوتروکانێکدا هەلیداو بە پشتا خستی و ڕووی کردە ئاسمان چۆن بلێی ڕووی لە خوا کردبێ و سکالا بکا منالەکانی هەر

بانگیان ئەکرد دایە گیان دایە گیان تا ئەوانیش یەك لە دوای یەك گولـەی بێبـەزەیی بۆ هەتا هەتایی بێدەنگی کردن بەسەر یـەکا کـەوتن و سـارد بونـەوە هەرچۆنێ بـوو مەرگی منالەکانی نەبینی ،کەمێ پێش تەقەکان گـوێم لـێ بـوو منالێـك هـەر ئـەیووت دایە نان ،دایە نان هەر داوای نانی کرد دایکەکەیش بێدەنگ بێدەنگ گریا تـا ڕزێکـی ترکرا و ئەمیش کەوت بەسەر ئەواو هـەردووکیان دەنگیـان لـە نـاو دوکـەڵی بـاروت و تۆزی بن چاڵەکەو هاڕەی کلاشینکۆفا بزر بوو ،مرواریيەکان وتیان کەسێکیش نـەبوو هەر بە دیارمانەوە بێ تا هیچ نەبێ تۆزێکی بۆ بانە ڕۆژ بگێڕێتەوە ، زۆر ماندو بووین زۆر تینـوو زۆر برسـی بۆیـە بەشـێکی زۆرمـان تەنانـەت نەیشـیان تـوانی هـاواری سـەرەمەرگیش بکـەن هـەر بـە بـێ دەنگیش مـردن . وتیـان مـن ڕاسـتگۆیی خـۆمم سەلماند کە کاتی خۆی وتم یان بۆ گڵ یان بۆ ئەو بڕوایش ناکەم من چۆنم ئـەویش وا نەبێ ،ئەگەر من ئەوم ناسیبێ ئەویش هەر وایە ،خۆ کاتی خۆیشی لـەو ئاواییانـە لـە وێنەی گوڵە ژاڵەو گوڵاڵەی بەهارو گولیلکەپایزەی جوان جوان زۆر هەبوون کە بە بـێ دەسکاری و جوانکاری خوا جـوان نەخشـاندبوونی بـەڵام ئـەو چـاوی هـەر وێنەیـەکی تێیا جێی ئەبوەوە ،خۆ ئەوسایش دایکـی کـراس کـەوە نـەبڕابوو ،ئـەویش پـەیمانی داتبوی (ئەگەر دنیا هەمووی گوڵ بێ تـەنیا گـوڵێ بەشـی منـە ،گوێ نادەمـە وتنـی خەڵکی مادام گوڵە بە دڵی منە ) ئـەو کەسێکی شـارەزاو شـاری بـوو دەسـتە پاچـە نەبوو زۆر شوێن گەڕابوو ئەوە نەبوو هەرلای ئێمەی دیبێ .

ڕاپەڕین وەڵامدەرەوەیەکی پڕ بـە پێسـتی ئـەنفال بـوو ،خۆزگـەم ئـەوە بـو دوای ڕاپەڕین ئەوە ببوایەتە باو لە سەر کەمەیەکی بێشکەی منالێ بنووسـرایە ئـەنفال و لـە سەر ئەوەکەی تریشی ڕاپەڕین ،وەکو چۆن بـرینپێچ کـاتێ دەرمـان ئەکاتـە برینـەوە یان پاکی ئەکاتەوە ئەیکولێنێتـەوە ڕاپـەڕینیش ئـاوا هـەم برینـی سـاڕێژ کـردو هـەم برینیشی کولاندەوە ،ڕاپەڕین زۆر کەسی بە یەك شاد کردەوە کە ماوەیەکی زۆر بـوو لە یەك دابڕابوون بەڵام هەرکەسەو بۆ یـەکێ چـاوی ئـەگێڕا ئـەو هـەر چـاوی خـەیاڵی

ئەگێرا دەنا ئەیزانی ئەوەی ئەو بووەتە بەشێك لە مێژو ، ئەو شادییە گەورەیەش نەیتوانی لە ژێر باری خەم تۆزی بیجولێنێ بە ئومێدی تەکاندنی ، ئەوەندە بە ئاواتەوە بود بۆ تۆڵەی پەنگخواردو لە دوژمن فریای وریایی و ئاگا لە خۆبونی نەکەوت و بەرلەوەی دوژمن هەواڵەی دۆزەخ کا دوژمن دەستی چەپەڵی خۆی لێ وەشاند وخوێنە ئاڵەکەی کردە هەوێنی لە دایك بونی گوڵاڵە سورەیەکی تر بەڵام کاتێ لە چاوەکانیان ورد ئەبویتەوە رقی پیرۆزو داوای تۆڵەی تێدا بە دی ئەکرا وئەوانەی لەو بوارەدا شارەزان ئەزانن لە چاویا چی پەیامێ ئەخوێنرایەوە کە پێمانی ئەوت رامەوەستن تا ئەگەینە ئەو خوارە و هەرکێمان لەو سەفەرە چەمەرییە نەگەڕاوەتەوە ئەیانهێنینەوە ،خۆ ناشیان ناسینەوە بەڵام دڵمان ئارام ئەبێتەوە ،لە چاوەڕوانی ئەکەوین ،دامەنیشن کاتی دانیشتن نییە ئەمە هەلێکە و هاتووەتە پێشەوە نابێ ئەمجارە وەکو گشت جارەکانی ترئەمیش لە کیسمان بچێ کێ ئەڵێ جارێکی تر دووبارە ئەبێتەوە ،لەمەوبەر گلەییان نەئەکرد چونکە ڕۆحیان لەوە ئاگادار بوو کە ئەوە لە توانای ئێمەدا نەبوو ،نەکەن خەریکی شڕەخۆری بن ،نەکەن شەهیدەکان و ڕەنجەجوانەکەی و خۆیشتان لە بیر کەن کە کاتی خۆی پارێزتان لە ئاوی شەوەسارە ئەکرد ،نەکەن بۆماڵی دنیا خۆتان عەیبدار کەن و ئەو ڕابوردوە جوانەتان لەکەدار بکەن کە نەك لەتێکی وڵاتی چوارمێخە کێشراو بەڵکو سەراپای نەتەوەیەك چاوی لە دەستی ئێوەیە ئەو یادگاری سەرکردەیەکی مەزنی وەکو شەرەفکەندی لە بیربوو کە زۆر لە ئێمە زیاتر گەشکە گرتبووی کاتێ کۆمەڵێ ڕۆیشتبوونە خزمەتی لە سەرەتای ڕاپەڕیندا هەر عەودالی هەوالی کەرکوك بوو کە خەریك بوو ئەگیرا ،کاتێ کە کۆمارە جوانەمەرگەکەی کوردستان پێی گرت ئەوە نەبوو بارزانی و پێشمەرگەکانی بارزان بوونە باشترین پشت و پەنا و هەر شەڕێك کە هەتا هەتایە مایەی شانازی کۆمارو کوردە هەر ئەو شەڕانەیە کە ئەوان کردیان ،ئەی ئەوە نەبوو خانەکەی شکاك لە ڕۆژی تەنگانەدا وەك مەردی مەیدان هاتە هانای

مەلیکەوە ،ئامان سەد ئامان نەکەن بە دەستی خۆتان ئاگر بنێن بە پووشی پاکژی چاك پارێزراوی خۆتانەوە چونکە نەك پووشی وشك بەڵکو دارستانیش کە گڕی گرت تەڕو وشك بە یەکەوە ئەسوتێ .

زۆربەی ولاٚتی کوردەواری دوای ڕاپەڕین هەناسەیەکی قوڵیان هەڵکێشا و بێخەم بون پاڵیان دایەوەو پێیان لێی ڕاکێشا تەنها گەرمیانی ئێمە نەبێ وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی ئەبێ بەر لە گشت لایەك شینی تێ بکەوێ و دوای هەموو لایەکیش خەندەیەکی کەم بە ڕێبواری ببێتە میوانی ،چۆن هیتلەر هەرچی ڕقی خۆی هەیە بە لایەنگرانی تەورات ڕشتی سەگە هاربووەکەی تکریت و عۆجەیش هەرچی ڕقی هەبوو لە کورد بە گەرمیانیەکان رشتی وەکو زالوو هەر تێر خوێن نەبوو بوو هەر ڕۆژێ بە بیانویەك پەلاماری ولاٚتی سەتاوو نەتەوەی بریندارى ئەدا تاکو ڕۆژی پێش داستانی تێشکانەکەی لە سەرقەلاٚ پەلاماری شاری کفری داو چەند شابازێکی پێکا کە یەکێکیان ئەم فەرهادە ڕەنجبێوەرە بوو( ئاتێلا) ،ئەو ڕۆژە بەدەم خەمە گەورەکەیەوە لە کاتی پەلاماری سەگە هاربووەکاندا بەرەو ئەو کەڵەکە بەردە ئەڕۆیشت کاتی خۆی بە دەووری خوێنەکەی تەیموری برایا کرابوو وادیارە هەستی پێی وتبوو ئەوە دوا ماڵئاواییەو ئەبێ خواحافیزی یەکجارەکی بکات زۆری نەمابوو بگاتە لای کەڵەکەکە گولەیەکی پیسی پڕ لە ڕقی ڕەشیان پێکای بە دەنگێکی پڕ لە ئیرادەو پەشیمان نەبوونەوە هاواریکی شکۆدارانەی کرد (کاکە منیش هاتم بۆلا٠٠٠٠٠٠٠٠٠ ت) و وەکو کۆشکێکی دێرینی سەردەمانی کۆن هەرەسێکی ناخ هەژێنی کرد و خەریك بوو چاوەکانی لێلاٚیی ئەهات بە سەریا لە گەڵ سۆزو خەیالاٚ بەرەو بیابان ڕۆیی بە چاوی خەیاڵی دڵی سەرگەردانی بینی لەوێ لە سەر یەکێ لەو سەدان چالاٚنە کە بە شۆفلْ دروست کرابوون ریزێك سەرباز پەنجە لە سەر پەلە پیتکە ڕاوەستا بوون ئەفسەرەکە فەرمانی پێدان و هەروا گولەی ڕۆحکێش بوو لە لولەی چەکەوە بۆسەری ئەوان دا ئەباری ،چاوی لێ بوو کۆترە باریکەیەکی

نەشمیلانەی چاو لە شێوەی چاوی باز ،چاونەترساو وبێباك و عاشقی فڕین بەلأم پێلە بەند لەو چرکە ساتەدا ئەیەویست بە جەلادەکان بڵێ قوڕبەسەرتان ڕۆژێك دێ ئێوەیش بکەونە بەرپلی ڕۆڵەکانی ئێمە وا ئێمە ڕۆیشتین بەلاّم لە شوێن هەوارا هەر یەکێ پەیدا ئەبێ تۆڵەمان لە ئێوە بکاتەوە گەرچی ترسیشم هەیە لەو دڵە پڕ بەزەیی و سۆزەی براکانمان ،خۆ ئێمە هەروا بێکەس نیمان ،ئێمەیش هەر ڕۆژێکمان ئەبێ ئەیویست ئەوە بڵێ کە تەنها شتێ کە ئارامی بە ڕۆحیان ئەبەخشێ تۆڵەیە تۆڵە . هاواری ئەکرد ،ئەچو بە گژ جەلادەکاناو سڵی لێ نەئەکردنەوە و جوێنی پێ ئەدان و ئەیوت بۆ کوێ ئەڕۆن لە دەس ڕۆڵەکانی ئەم ولأتە سوتاوە ،ئەی نازانن خاکی سوتاو تینو ترە لە خاکی نەسوتاو ،خەلکی ولأتەکەم لەمەو دوا ناهێڵێ وەکو جاران پێی لێڕاکێشن ،ئێوە کارێکتان کردوە کەس نەکەردەنییە ،ئەمەتان بە ئاسانی بۆ ناچێتە سەر ،ڕاستە ئێمە بێدەسەلأت بووین ،بێچەك بووین بەلأم ئەوانەمان کە جێماون تۆڵەمان یەك بە هەزار ئەکەنەوە ، ئەوا خۆشمان ئەکوژن ئەی چی لە ڕۆحمان ئەکەن ئەو ڕۆحە تورانەمان ئەگەڕێنەوە ئەچنە جەستەی پاشماوە داخ لە دڵەکانمانەوە و ئەوەنەی تر ڕقیان بەرانبەر داگیرکەران زیاد ئەبێ و ئیتر دوژمن هەر بەرگەیان ناگرێ ،چاوی لێ بوو دەسرێژێك تەواو پێکای و لە ناو تۆزو دوکەڵ و خوێنا بزر بوو جەستەی پیرۆز و ماندووی کەوت بە سەر کۆمەڵێکی ترا کە پێش ئەو بێ مۆڵەتی ئیزرائیل ڕۆحیان کێشرا بوو بۆ هەتا هەتایە دەنگی کپ کرا بەلأم لە ناخی فەرهادە ڕاستگۆکەیدا بووە ختوکەی ختوکەی ویژدان و دلێری و لە خۆ بوردویی و نەیهێشت دانیشێ تا ئەمیشی گەیاندە ئەو ئاکامە کە کاتی خۆی پەیمانی دابوو کە ئەبێ تۆڵەی ولأتەکەی نەتەوەکەی و تەیموری برای و قیبلەکەی دڵی بکاتەوە بەلأم سەد داخ مەچەکی ئەوان ئەستور تر بوو هێز نابەنبەر بوو گولە کوڕی ئازاو ترسنۆك نەناسێ ،پێکرا و پێکانەکەیشی کاریی بوو بە سوزی یا لەیلەوە هەر بانگی کاکی و قیبلەکەی دڵی ئەکردو وردە وردە تا ئەهات دەنگی کزتر ئەبوو تا لە دواجارا بە

تەواوی خـامۆش بـوو بـوو بـە هـەوێنی داسـتانی ڕۆژی دواتـر کـە لـە هـیچ زانسـت و ئاوەزێکی سەربازی و پێشمەرگانەدا چاوەڕوان ناکرێ کەتیایـدا تۆڵـەی ئـەو هـەزاران شەهیدی بە ئاوات نەگەیشتووە کرایەوە کە لە تەختاییەکی بانی سەرقەڵادا لە مایەی چل و پێنج تانك و زرێپۆش تەنها یەکێکیان توانی زۆر بە پەلەپرووزێ خۆی ڕزگـار کـا کە فەرماندە بێمێشکەکەیانی تێدا بوو کە ئەو داستانە بووە هەوێنی دروسـت بـوونی ئەم حکومەتەی هەرێم هەروەکو دانیشتنەکەی یامولکی لە تاقانە شارەکەی ئەوسـای گەرمیان ، شاری کفری ،شـاری ئـەم فـەرمادە عاشـقە بـووە هـەوێنی دروسـت بـونی حکومەتەکەی شێخ

(٦) لە زاری پێشمەرگەی پارتیزان (مەلا ڕەحیم ) ەوە وەرگیراوە .

## ئەو سەگەی من بینیم
## ((ئێسقانەکان کەشفمان نەکەن !))

ڕێکەوتی ١٦/٤/١٩٨٨ تێکرا خۆمان بەستبوو، هەموومان تەنها یەك بیرکردنەوەمان هەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر وریا بووین ، بەڵام هەر بەڕاستی هەستمان بەبەرپرسیارێتی ئەکرد ، ڕێگا پێچوو پلوچەکان کە بەنیگامان ئاشنا بوو، زۆر بەوردی هەنگاومان بۆ ئەنا ، ئێمەش لەسنووری تیرەی مامۆیەکانیین ڕێگا بە نێو هەردەو بنکاچ و کۆردەرەکاندا گوزەر ئەکا (گوندی تاڵەبان) هەر بەجارێ کاولە و هەموو جارێ ئەو ماڵەمان بوو ، ئێستا ئەوەش نەماوە.

لێرەدا یادگاری زۆرمان هەبوو خەڵکی بەئەمەك ..لێرەدا چی و چی .. دەرونمان ئەکولاً کەس نەئەوێرا ورتەی لێوە بێ ، چوون لەوانەیە گریان ڕێگا نەدا ، ئێمە ئەگەڕاین بەشوێن خۆراکدا لە پاشماوەی ئەو گوندە .. لەو کاتەدا لە بن کاچێکدا هەندێ کەل و پەلم بەر چاو کەوت ، بۆی چووین بەڵام لە پڕێکا لە بن کاچەکەدا سەگێکمان لێ پەیدا بوو ، سەگەکە زۆر بێ هێز و قارس و جاڕس نەی ئەتوانی لەبن کاچەکە دەرچێ حەپەی ئەهات ، بۆمان دەرکەوت ئەیەوێ پارێزگاری لەو کەل و پەلە بکات .

پاشان کۆبووینەوەو هەرکەس بۆچوونی خۆی هەبوو

- چەند بەوەفایە چاوەڕوانی خاوەنەکەی ئەکات .
- ڕەنگە تامردن لێرەدا چاوەڕوان بێ و جێی نەهێڵێت ! !

ئەمە هەندێ لەو بۆچوونانە بوو کە برادەران دەریان دەبڕی چووینە ناو کاچەکە ، کۆمەڵی بەتانی و جێگەو کەل و پەلی لێ بوو کە بۆ ئێمە زۆر پێویست بوو . ماوەیەك

لەناو ئەو هەرد و بن کاچانە خۆمان ئەشاردەوە هەر رۆژێ لە شوێنێ کانی ئاو و سەرچاوەکان شارەزابووین خۆراك و شتیشمان پەیدا ئەکرد .

لە مانگی ئابی ١٩٨٨ چووینە قۆپی قەرەداغ کە مەحمودی مامە عەزە و مامۆستا بەهادین نووری و عومەر غەریب و مامۆستا عەلا لەوێ بوون، هەندێ هەستمان بە ئارامی ئەکردو شوێنەکەش کەش و هەوای لە بار تربوو، مەلا ئەحمەد بڕیاری دا من و صدیق عەلی توفیق و مام بەکر ئالیاوایی و کەمالی بەلخە بچین بۆ ناو شاری دەربەندیخان بۆ دیدرای برادەرانی ڕێکخستن و چەند کارێك، بۆ کاری پەیوەندی کردن .

ئێمە بۆ کاری پەیوەندی لەگەڵ مەلا مەحمود و برادەران شوێنێکمان هەبوو نزیك (دێی دێوانە – چەمی دێوانە ) کە بەردێکی لێ بوو هەرچیمان پێویست بوایە لەسەر ئەو بەردە ئەمان نووسی بۆ برادەران ، ئەوانیش وەڵامێکیان بوایە بۆ ئێمەیان ئەنووسی و بۆمانیان بەجێدەهێشت. کە ئێمە گەیشتینە لای برادەران لە قۆپی قەرەداغ لە وێدا میوانی برادەرانی حزبی شیوعی بووین ، کە لێیان نزیك بووینەوە ئەو ئێوارەیە من بۆنی گۆشتی برژاوم کرد ، برادەرانی خۆمان باوەڕیان نەئەهات ،بەڵام کەچووینە لایان پێشمەرگەکان هەریەکەو لە شوێنێ بۆ خۆیان شوێنیان خۆش کردبوو ، ژیانیان هەندێ ئاسوودە بوو ،مامۆستا بەهادین نوری زۆر بەوردەکای هەڵسوکەوتی ئەکرد هەروەك سەرکردەیەکی پارتیزان لەو دۆخە تایبەتەدا .

مامۆستا عەلا و برادەران زۆر بە ئیلزامەوە هەڵسوکەوتیان ئەکرد ، شوێنی تایبەتی خۆی هەبوو لەو بن کاچ و بەردەدا ... رۆژنامەو گۆڤار و کتێب و هەموو کەل و پەلی چاپ و ئامرازی پەیوەندی و کەل و پەل و خواردن ..تاد هەبوو لە تێکەڵاویدا وردەکار بوو ؛ رۆمانێکی بەدەستەوە بوو بەناوی ( وێرانە) کتێبێکی عەدەم تەعەروزی لا بوو بۆ پێشمەرگەکان کاتێ کە ئەچوونە نێو شار دیار بوو پەیوەندیان

زۆر بەهێز بوو لە گەڵ شارو شارۆچکەکاندا ، چەك و تەقەمەنی باشیان لابوو ، خۆی دەمانچەیە تۆپڵی لابوو .

ئەو رۆژە ئێمە گەیشتینە لایان گۆشتی مانگایان ئەبرژاند ، و هەموو پێشمەرگەکان لە دەوری ئاگرەکە کۆبونەوە بە شێوەیەك بەڵکو ئاگرەکە دیار نەبێ ، مامۆستا بەهادین نووری زۆر کۆبوونەوەی پێ ئەکردین ، ئێمە (٣٠-٤٠) پێشمەرگە بووین، لەسەر بەردێك دادەنیشت و شەپقەیەکی لەسەر ئەکرد ، باقە گەڵا داری بەدەستەوە ئەگرد ، زۆر شتی بۆ باس ئەکردین، بەتایبەت ژیانی پارتیزانی و خۆپاراستن و خۆشاردنەوە و دەست وەشاندن بەپەلەو گەڕانەوە. جگە لە بابەتی هۆشیاری و رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و مێژوویی .

زۆر جار خۆی کارەکانی ئەکرد ، ئەو شەوەی کە گەیشتین بەیانییەکەی زمەی تفەنگەکانمانی کردبووە شیش بۆ گۆشت برژاندن هەر کەسەمان و شیشێك ، کە چووم کتریکە پڕبکەم لە ئاو پێی ووتم : وازی لێ بهێنەلێرە هەموو شتێ مەرکەزییە ، بۆ جاری یەکەم بوو ئەو وشەیە ببیستم !! گۆشتی مانگاکە زۆر بوو تەواو نەئەبوو ، بۆیە بە مانەوەی ئەگەنا ، و خراپ ئەبوو ، مامۆستا تەنەکەیەکی هێناو گۆشتەکەی کوڵاند و پاشان پڕی کرد لە ڕۆن بەو شێوەیە پارستی لە خراپ بوون رۆژانە سوودمان لێ وەرئەگرد ، ماوەیە لەوێ بووین کە تەمشیت و گەڕانی رژێم زیادی کرد دابەش بووین لە قۆپییەکاندا بۆ پاراستی خۆمان .

لە ١٩٨٨/٨/٢٩ لە رێگای برادەرێکەوە ئەوان ئاگادار کرابوونەوە کە ئێمە دێن بمانبەن بۆ ناوشار ئێمە (٤) پێشمەرگە بووین دوای ٧-٨ رێگا کە گەیشتینە بەردەکە وامان دانابوو نامەی برادەران لەوێدا بێ بۆ رێنمایی ،بەلأم کە بەرزمان کردەوە هیچ دیار نەبوو، ماوەیەك بیرمان کردەوە ... بۆ هیچ نەبوو . تووشی کێشەیەك نەبووبێتن ؟ هەندێ وەستاین ئیتر دوور کەوتینەوە و بەردەکەمان وەك خۆی دانا ، پاشان کاك صدیق پێی ووتین بابڕۆین خۆم شارەزام هەرچەندە ئەوە

ڕاست نەبوو ، چوون فەرمانکە وا بوو ئەوان ئێمە ببنە نێو شار ، کاك صدیق وتی من شوێنی تر شارەزام لەوانەیە لەوێدا بن .

ماوەیەك ڕۆیشتین جارێ دنیا هەر تاریك بوو لە شوێنێکدا وەستا، فیکەیەکی کرد و خۆی مات کرد، بەفیکە وەلاّم درایەوە بۆ مان دەرکەوت خۆیانن ، دوو تارمایی بوون بەرەو لامان هاتن ، مەلا مەحمود و دووکەسی تر پاش هەواڵ پرسین بۆمان دەرکەوت ئەوەی دووەم مامە حەمەی باوکی مەلا ئەحمەدە ، زۆر بەتاسەوە بوو بۆ هەواڵێ پێم ووت من پێشمەرگەم لە دەستەی ئەو ئەویش قەمسەڵەکەیەتی ناردویەتی ئێستا دنیا گەرمە بۆی هەڵگرن تاوەکو زستان ، هەندێ بۆنی پێوە کرد و دەستی بەگریان کرد ، وتی بۆنی خۆی لێ دێت ڕاستەکەی بەڕاستی سۆزی سەیر بوو

ئێمە زۆرمان برسی بوو هەستمان کرد پیارسکێکیان پێیە پێمان ووتن هیچ خواردن هەیە ؟ مەلا مەحمود پیارسکەکەی کردەوە فەرموون ، ئیدی مریشکی سورەکراو تەماتەو نانی شاری و شەربەتی نادر ، بۆی دانیشتین خۆمان بە میری میران ئەزانی هەر بەبۆن و بەرامەکەی سەرخۆش بووین ، ماوەیەك بوو لەو جۆرە خواردنانە بڕابووین ئێسقانەکانیش خوران بۆ گاڵتە ئەمان وت ئێسقانەکان کەشفمان ئەکەن ! هیچ بە جێ مەهێڵن ، سەرەتایە باش بوو .

مەلا مەحمود پێی ووتین باری ناو شار چاك نییە ، سەرباز و سوپایە زۆر ڕژاوەتە نێو شار دەرو بەری وەستانی شەڕی عێراق– ئێرانە واچاکە بگەڕێنەوە چیتان ئەوێ من بۆ تان ئەهێنم ، باتووشی بەلایەك نەبن کاك صدیق بەرپرسمان بوو ، سوور بوو لە سەر چوونمان بۆ نێو شار کاری زۆر گرنگمان هەیە ، بۆیە کەوتینە ڕێ لە دەوروبەری شار کەوتینە نێو سەربازگەیەکەوە بە حاڵی زۆر خراپ ئەجولاّین لە چاڵێکدا خۆمان مەلاّس دا ، حەرەسەکە دیار بوو لێمانەوە ، دنیاش مانگە شەو بوو ، بۆیە وامان بەباش ئەزانی دانیشین تاوەکو مانگ ئاوا ئەبێ .. لەو ماوەیەدا باوکی

مەلا ئەحمەد نووست ،کەویستمان بجولێین مامە حەمە پێی وتین ئێوە بڕۆن من نایەم وتمان وا چۆن ئەبێ ئەتگرن وتی مادام من هەواڵی مەلا ئەحمەد ئەزانم هیچ گرنگ نییە وتمان بۆئێمە زیانە وتی بی ٚخەم بن، چار نەبوو بە جێمان هێشت لەگەڵ گزنگی بەیاندا چووینە نێو شارەوە ، شارێ خامۆش و کپ بە کۆڵانی باریکدا ئەرۆیشتین، لەپڕێکدا لەسەر بانێکەوە میللی کلاشینکۆفمان لێ ڕاکێشرا ، نەجولێن کورە کوژراون ، کاك صدیق لە پێشەوە بوو پێی وت تەقە نەکەی کورە ئێمە چەکداری سالح خەیاتین لە ئێوارەوە کەمینین جەنابت تیر بۆی خەوتووی و ئەمان کوژی ، کابرا (جاشەکە ) داوای لێبوردنی کرد ، بەردەوام بووین بی ٚئەوەی کەس خۆی تێك بدات .هەر وەك ئەوەی کۆمەڵی جاش بین و لە کەمینەوە هاتووین ، بەرێ کەوتین بۆماڵی کاك صدیق ، دایکی دەرگاکەی کردەوە برینەکەی کولاوە چوون تازە کورێکی شەهید بوو لە سەرکردایەتی بەتاسەوە هەمووماني ماچ کرد.

لە ناوچەرگەی شاردا و لە ناوچەرگەی درندە ترین رژێم ، ئەگەر ئەو ماڵە نیشتمان پەروەر نەبن چۆن ئەم کارئەکەن لە بارێکی وا دژواردا ، لە ماڵی کاك صدیق ماینەوە دنیا زۆر گەرم بوو تەنها پەنکەیەکیان هەبوو بۆ ئێمە دایان نابوو ژوورەکەیان زۆر گەرم بوو ،پیاوی خاوەن ماڵەکە(مامی کاك صدیق ) لە گەرمادا خەوی لێ نە ئەکەوت ، نیوەڕۆ خۆی کرد بە ژوورەکەی ئێمەدا کە چاوی پێمان کەوت .. ریش و تاقم و چەك زانی ئێمە پێشمەرگەین ، هەرئەوەندەی نەمابوو لە هۆشی خۆی بچێت،ویستی بگەڕێتەوە کاك صدیق هێنایە ژوورەوە بەدەستی تەوقەی لەگەڵ کردین ، بەدەستەکەی تری ئەیدا بەسەری دا ، وتی صدیق تۆ نازانی سەدام چەند درندەیە ناترسی ماڵ و حاڵمان ویران بکەن هەر زوو شپرزە بوو .

کاك صدیق دڵناوایی کرد و هێنایەوە سەری خۆی پاشان لە ماڵێکی تر شوێنێکیان بۆ دابین کردین خەڵك سەردانیان کردین چ خزم و کەس و کار چ ڕێکخستن ، کاك عەلی عەبدوڵلا کەلۆش یەك لەوانە بوو کە زۆر پیاوانەو نیشتمان

پەروەرانــە پێشــوازی لێکــردین ، هــەموو هاوکارییــەکی پێشــنیار کــرد لــەو رۆژە سەختەدا، دیارە هاوکارییەکەی کاریگەری خۆی بوو لەو ماوەیەدا .

چـوار شـەو لـە شـاری دەربەنـدیخان ماینـەوە .. خـۆراکی چـاك ، خزمـەتکردن و پەیوەندی چاك پێش ئەوەی دەربچین لەشار چووینە مـاڵی پـوری کـاك صـدیق دوو کـوڕی گـەنجیان هـەبوو (عـەباس) لەگـەڵ کـاك صـدیق نێوانیـان خـۆش بـوو ، کۆڵەپشتەیەکی سەربازی تازەی بۆ هێنام زۆر دڵم پێی خۆش بـوو ، مـەتارەکانم پـێ دا پڕی بکات لە ئاوی سارد ، سـەیارەیە لانـدگرۆزیان هێنـاو سـوار بـووین و ، شـەو درنگە خەڵك وای ئەزانی جاشین لە نزیك چیای گوڵان دابەزین ، لە رێگـا تینـوم بـوو دەستم بـرد بـۆ مەتارەکـەم ئـاو بخـۆم بـۆم دەرکـەوت مـەتارەکانی پـڕ کـردووە لـە شەربەت کە ئەویش بەڵگە بوو بۆ خۆشەوستی ئەو کوڕە گەنجە بۆ پێشمەرگە .

بۆم ئاشکرابوو کە ئێمـە جـارێ لـە جـەماوەر دانـەبڕاوین ، کەخۆشەویسـتی هـەبوو سەرکەوتینیش بە دوایدا دێ ، زۆر دڵ خۆش بووم لەو رۆژانەش کە لەشـاردا بـووین ئەو خۆشەویستیەم لە نیگاکاندا ئەخوێندەوە .

شەوێکی درنگ گەیشتینە نزیك گوندی (تاڵەبان) لەوێدا خۆمان کردەوەو نووسـتین ، بەبێ ترس و بە ورەیەکی بەرزەوە، هەر ئەو شەوە بـۆم دەرکـەوت کـە ئێمـە چـەند ژیانێکی ئازاد و سەربەخۆ بەسەر ئەبەین ، لەگەڵ گزنگی بەیاندا خۆمان کۆکردەوە ، من لە دیوی گەرمیان چاو ساغیان بووم ، دیارە لەشـارەوە هـاتووین و بـارو کـەل و پەلمان پێیە ، بەتایبەت ئەو شتانەی بۆ ئەو جۆرە ژیانە گرنگ بوو .

توولە رێگاکەم گرتە بەر لە پێشەوە بە دۆڵ و هەردەدا بـرادەران بەدوامـدا نێوانمـان هەبوو،ئێمـە تـەنها لـە کـاتی نووسـتندا لـە وریـایی و ئامـادە باشـیدا هەنـدێ خـاو دەبووینەوە ئەگەر نا هەمیشە وریا و گوێ قولاغ بـووین هەمیشـە چـاومان گوێمـان هەستمان لەو پەڕی وریایدا بوو ، هەستم کرد دەنگـە دەنـگ دێـت ،وەسـتام تـاوەکو برادەران گەیشتنە لام بۆم دەرکەوت ئەو دەنگـە دەنگـی سـەگە ،و سـەگەکەش ئـەو

سەگەیە کە پارێزگاری لە کەل و پەلی بن کاچەکەی ئەکرد، لە گوندی تاڵەبان ، سەگەکەم بینی زۆر دڵ تەنگ بووم وەك بت وەستام ، کاك صدیق رایوەشاندم وتی شێخە گیان چیتە ؟

دواجار سەرگوزەشتەی سەگەکەم بۆ کاك صدیق و برادەران گێڕایەوەئەم سەگە ئەگەر لەم هەردە چۆڵەدا بمرێ لە پێناو مەسەلەیە کە خۆی باوەڕی پێ بووە بۆ خۆی، راستی کردووە لەگەڵ خۆی .. خۆ ئێوە چاوتان لەم وڵاتەیە چۆن وێران و خاپورە ئەگەر جاش و خۆ فرۆشەکان ئەوەندەی ئەو سەگە بە وەفا بوایان ، کار بەم دۆخە نەئەگەیشت ، ئەم ئاژەڵە زۆر زۆر لەو کەسانە پیرۆزترە کە لەبەر بەژەوەندی ناشەرعی و لەسەر حیسابی میللەت و هەژارەکان پلەو پایە پەیدا ئەکەن

من سەیلی چاوم بۆ ئەوەیە برادەران وەعد بێ لە گەڵ خۆم هەر رۆژێ دەسەلاتم بەدەستەوە بوو هیچ کات لە و خۆفرۆشانە خۆش نەبم ئەگەر دەسەلات لای خۆم بوو ، ئەگەر دەسەلات لای منیش نەبوو هەر دەسەلاتێك لەوانە خۆش بوو وەك ئەو خۆ فرۆشانە تەماشای دەکەم .

کاك صدیق پێ وتم بۆ کاك شێخ کەس ئەتوانێ تاوانی ئەوانە لەبیر بکات، ئەبێ دادگا لە گۆرەپانی شار پەتی سێدارەیان بۆ هەڵواسێت .... بۆ ئەوەی جارێکی تر کەس نەتوانێ خۆ فرۆشی بکات .

- بەکاك( صدیق)م وت چەند نانمان پێیە ؟
- وتی : (٣-٦) نان ..
- چی ترمان لایە ؟ ..
- وتی :بۆ برسیتە ؟
- نەخێر ئەگەر رازی بن (٣) نان بۆ ئەو سەگە دائەنین بەڵکو لە برسا نەمرێ

هەموویان رازی بوون  لەگەڵ ئەوەشدا ئەمان زانی پاش ٦-٧ سەعاتی تر ئەگەینە برادەران ، سێ نانمان بۆ سەگەکە بە جێ هێلا زۆر بە پەرۆشەوە پەلاماری دا هەندێ وەستاین  بە دیارییەوە ." ئێوە تەماشای سەگتان کردووە چۆن لە نێوان هەردوو دەستی نانەکە گیر ئەدا و ئەو کات دەستی پێ ئەکا "، بەڵام ئەو سەگە نەی ئەتوانی وابکات هێزی تێدا نەبوو نانەکەم بۆی ئەکردە لوقمەو ئەم کرد بە دەمییەوە ،کاک صدیق پێی وتم شێخە تۆ شێخی ئەو سەگە کلاوە .

تەواو تورە بووم  ئەی ئێمە باسی چیمان کرد . کاکە گلاو واتای چی ؟ ئەوەیان وانیە  ئێمەیان خراپ تێ گەیاندووە ، سەگ جۆرێ میکرۆبی هەیە ئەگەر ئەو نەخۆشییەی هەبێ زیانی بۆ تەندروستی هەیە بەڵام گلاو ؟ ئەی پیاوی درۆزن گلاو نییە، ئەی مرۆڤی داوێن پیس گلاو نییە ؟ ئەی خەڵکی خۆ فرۆش گلاو نییە ....تد

لەدوایشدا ملی رێگامان گرت  پاش ئەوەی سەگەکە هەڵسایەوە بە دومان کەوت بەڵام نەی ئەتوانێ  پێماندا بگات  پاش چەند رۆژێ دۆزیمانیەوەو لامان مایەوە ئەو ماوەیە لەگەڵ ژیانی پارتیزانیدا راهات .

(٧) لەزاری پارتیزان ( شێخ حسام ) وە وەرگیراوە

## گەڕانەوەی حەمە ڕەش وڕەتلەکەی بۆ گەرمیان
## ((پاترییەکەی ڕێکخراو شەحنی تێدا نەبوو))

لە مەڵبەند لە ( پاوە) بووین ،من فێری بە کار هێنانی جیهازی ڕاکاڵ بووم. لە پێشدا کارێکی سەخت بوو بەلامەوە .بەلاَم دواتر ڕاهاتم ، جارێکیان داوام کرد لە کاك عوسمان بۆ ئەوەی دابەزم لە گەڵی ڕازی نەبوو پێی ووتم : کارمان پێت هەیە.

لەسەرتایی ساڵی ١٩٩٠ لەسەر بڕیاری کاك عوسمان من سەرپەرشتی جیهازی ڕەتلەکانی گەرمیانم ئەکرد ، لەگەڵ کاك عوسمان و برادەران کەوتینە ڕێ دنیا ساردبوو بەفر ڕێگای نەدەداین ، جاری دووەم بەشاربازێڕو شارەزوور و قەرەداغ دا چووینە سەگرمە، لەوێ برادەران لە ئەشکەوتێکدا بوون تابڵێی شوێنێکی شاراوە بوو کەس شارەزای نەبوو ، من کە چووم جیهازەکەم لە م. یاسین وەرگرت ، پاش ئەوەی برادەران دابەزینە خوارەوە ، من لەگەڵ شەهید ڕەمەزان و عەلی فەقی مستەفا و شەهید حەمە ئاخە لەو ئەشکەوتەدا ماینەوە ، کاری پەیوەندیمان ئەنجام دەدا لە کاتە دیارکراوەکاندا پەیوەندیەکانیش هەموو بە جفرە بوو .

پاش ماوەیەك شوێنی جیهازەکەمان گۆڕی بۆ نێوان سپێ سەرو مەلا ئۆمەر لە (دەڵەکە) کە ئەشکەوتێك بوو ، شوێنی پارتیزانەکان بوو چووین بۆ ئەو شوێنەو جیهازەکانمان لە نێوان خۆماندا دابەش کرد نەوەك لە ڕێگا تووشی کەمین ببین و جیهازەکان لە ناو بچن .( هۆکاری جێگۆڕکێ کردن بە جیهازەکان لەبەر ڕەوشی ئەمنی بوو نەوەك ڕژێم لە پەوەندی نێوان بێ تەلەکان ئاگادار بێت ) .

ئەگەر هەر پەیامێك زۆر تایبەت بوایە کاك عوسمان خۆی جفرەیەکی لابوو. ئێمە هیچ ئامێرێکمان لا نەبوو بۆ شەحن کردنی پاتری ڕاکاڵەکان ، بۆیە داومان کرد لە ڕێکخراوی ناوشار پاتریمان بۆ بنێرین ، کەچووین پاتریەکە لای عەمودێك دانرابوو ،

دۆزیمانەوە و گەڕاینەوە لە کاتی دامەزراندنی جیهازەکە کاری نەکرد زۆر بێ تاقەت بووین پاتریەکەی ڕێکخراو شەحنی تێدا نەبوو ئەو چەند ڕۆژە پەیوەندی نەبوو هیچ هەواڵێکمان نەدەزانی . کاک عوسمان وتی پاتریەکە بگەڕێننەوە بۆ ڕێکخراوی شار تا بۆ مان شەحن بکەن .

بۆ شەوی دوای لەگەڵ کاک عوسمان و ملازم عەباس و شەهید رەمەزاندا چووین بۆ مەلجەئی هەیەرەسوور لە کاک عوسمان دابڕاین چوون ئەو کارێکی بوو ، ئێمە چووین بۆ مەلجەئەکە و لەوێدا نووستین ، کاتێ کاک عوسمان گەڕایەوە رادیۆی پێ بوو هەڵی ساندین ومزگێنی ئەوەی پێداین کە جەیشی عێراقی هێرشی کردوەتە سەر کویت و داگیری کردووە ، ئەو ڕووداوە بەلای کاک عوسمانەوە زۆر گرنگ بوو ، لەو دەروبەرە چەند کونێکی لێ بوو بەکارمان ئەهێنان بۆ خۆ شاردنەوە ئێمە ئازووقەو خواردنمان بوو، جگە لەوەی لە شارەوە بۆمان دەهات ، خواردنەکانمان لە شوێنە جیاجیا کان قایم کردبوو ، شەهید مەجید دووزی نانی بۆ ئەکردین کە بەراستی وەستا بوو لە نان کردندا .

هەواڵەکانی دنیامان لە ڕێگا ڕێکخستنەکانی ناوشارەوە ئەزانی، کۆمەڵێ کتێبمان لابوو لەوانە : ژمارەکانی کۆمەڵ و هەندێ گۆڤار و فەرهەنگ و ..تد . بەشەوان نەئەبوو ئاگرمان دەم بدایە ئەمەش لەبەر ئەوەی بەهۆی تیشکەکەیەوە ئاشکرا نەبین ، شەوانە هەمیشە لە کارکردندا بووین مەلجەمان چاك دەکرد هێنانی ئازووقە،چوونە سەر مەوعیدەکان ،کەم شەو بوولە شوێنی خۆمان بمێنینەوە،( بۆ گوێدرێژەکانیش کە دووان بوون شوێنمان بۆیان دروست کردبوو شەوانە بەرەلامان ئەکردن ..)

پاش داگیر کردنی کویت هەستمان کرد ئەو فشارەی لەسەرمانە کەم بووەتەوە ، وەکو جاران تەیارە و جەیش بۆمان دەر نەئەچوو ، جگە لەوەش هەواڵەکان زۆر دڵخۆش کەربوون ، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێمە وریابووین و بەوردی ژیانی

پارتیزانیمان بەرێ دەکرد ، مام جەلال ئەیووت ، هەریەك لەمانە ( پارتیزانەکان ) لە ئایندەدا دەبنە رابەرێك لە ناوچەکاندا بۆیە ئەبێ هەوڵدرێ خۆتان بپارێزن لە رووبەرووبوونەوە . لە مانگی ١١ ی ١٩٩٠ ئێمەلەسەر داوای سەرکردایەتی گەراینەوە بۆ سەرکردایەتی لە کاتی راپەرینیش گەراینەوە . ( ئەوکاتەی ئێمە گەراینەوە بۆ سەرکردایەتی کاك حەمە رەش و رەتلەکەی گەرانەوە بۆ گەرمیان ) ...

(٨) لەزاری پاتیزان ( نەوشیروان ئەحمەد حەسەن ) ەوە وەرگیراوە

# پەناگەی ( جان ئاغا )

## ((تەنانەت قسە خۆشەکانیش ناخۆش و سواو بوون))

لە ( بلەکێ ) بووین . کاك قادری حاجی عەلی لێپرسراوی مەڵبەندی (٢) ی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو. (١٢) پێشمەرگە ئەبووین ، لەگەڵ دەلیلەکان خۆمان ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە بۆ گەرمیان ، بۆ لای ئەو برادەرە پارتیزانەکانمان ( ئێمە دووەم مەفرەزە بووین بۆ گەڕانەوە ) پێش ئێمە مەفرەزەیەك گەڕابووەوە ، ئێمەش خۆمان ئامادە کرد بوو بۆ گەڕانەوە ، بەرێ کەوتین بۆ گوندی ( چەم پاراو ) گوندێك بوو لە نێوان سنووری عێراق ئێران .پاشان لەوێشەوە بۆ (سوورەبان ) و شاخی ( کەتوو ) لە شارباژێر .

ئێمە پێك هاتبووین لەم پێشمەرگانەی خوارەوە :

١- محەمەد مەحمود عەبدولکەریم .( حەمە چاو جوان )

٢- تەلعەت حەسەن عەلی .( شەماڵ)

٣- حەسەن ئیبراهیم . ( حەسەن شێخ لەنگەری )

٤- شەهاب حەسەن ئەحمەد .( شەهاب خانەقینی )

مەفرەزەی دووەم :

١- ماجد فەیلی .

٢- مەلا یاسین .

٣- ئازاد قەلەوەزی .

پێشمەرگەی موتەفەرەیقەمان لەگەڵ بوو لەوانە:

١- کاك هەڵکەوت .

٢- دکتۆر هاورێ .

دەلیلەکانمان ئەمانە بوون :

١- مام رەئوف ٢- فازیل شیرە مەڕی ٣- مەلا بەکر ٤- کەماڵە خـڕە ٥- هوشیار ٦- کامیل چاو شین ٧- رزگار .

لە چیای ( کەتوو ) ئەو شـەوە رۆژمـان بەسـەر هـات بۆیـە بـەوناوەدا بلاوەمـان لێ کردو خۆمان حەشـاردا ، لـە چـەمی ( مـۆن بـرەو مامـە خـەلان ) یـان (سـوورەبان ) سەعات (١١) کۆمەڵێ جاش و جەیش لەو چەمەدا بلاوەیـان لێ کردبـوو ، تەمشـیتیان ئەکرد ، بەلام دوور بوون لە ئێمـەوە . کـە شـەو داهـات بـەرەو (کـورە داوێ ) بـەرێ کەوتین لەوێشەوە بەرەو ( پووشـین ) کـاك سـوهاد و حەمـە سیاسـی چـاوەڕوانمان بوون ، دێی پووشین هەمووی وێران بوو ، حەوزێکی ئاوی لێ بوو لەوێدا پشـوومان دا تـاوەکو نیـوەڕۆ ( کـاك شـێخ کـەریم و هاوڕێیـانی گـەرمیان ) گەیشـتنە لامـان لـە گەرمیانەوە هاتبوون ئەچوون بۆ پشوودان .

لەوێدا گەنجێکمان بینی بە ناو گۆڕستانەکەدا ئەسوڕایەوە ئەمە بەلامانەوە زۆر سـەیر بوو چونکە ئەو ناوچەیە قەدەغـە بـوو ، دیـاربوو هـاتووەبۆ سـەر گـۆڕی براکـەی کـە لەشـەڕی ئێـران عێراقـدا کوژرابـوو ، داوامـان لـەو گەنجـە کـرد هەنـدێ موعەلـەباتی سەرەگاکەمان بۆ بێنێ ، بۆ بەیانییەکەی (١٠) دانەی بۆ هێنایـن ، هەر لەوێدا ماینەوە شوێنێکی تاڕادەیەك ئارام بوو ، ئێوارەی ئەو رۆژە لە کلکە گوێژەوە بەرەو عەربـەت و جادەی سلێمانی بەرێ کەوتین لە رێگـا کەوتینـە نێـو بۆێسـانێکی دەیمـی کاڵـەگی چاکی لێ بوو ، بۆ بەیانیەکەی گەیشتینە ( هەرەسەکە ) خۆمـان حەشـاردا لـەو نـاوە بەراستی رۆژێکی سـەخت ودژوار بـوو، بـەدووربین تەماشـای ناوچـەکەمان ئـەکرد بـۆ شەوێ دەرچووین بەرەو بەیان گەیشتینە گوندی کۆشك رژێم تەمشیتی ئـەکرد ئێمـە لەسەر کانی ئاوەکەی نزیك گوندەکە بلاومان لێ کرد، لە نێو ئەو زەل و ژاژانە خۆمان حەشار دا.

نیوەڕۆ نان و چامان لەسەر کانییەکە خوارد ، چاومان لێ بوو (٣) جاش بەرەو کانییەکە هاتن ، ئێمەش بڵاوەمان لێ کرد نزیك بوونەوە لە حەسەن شێخ لەنگری و شەماڵ خۆمان ئامادەکرد ، یەکێکیان بانگی کرد : ئەوە وردە نان و گەڵای چایە دیارە خەڵك لێرە بووە، ئەوی تریان وتی : وەرە ڕێبوار بوو ئێستا لێرەدا بوون گەڕانەوە.

لەقۆپییەکەی سیوسێنان بووین لە شاخی زەردە مامۆستا نەجم بە جیهاز بانگی ئەکرد شاهۆ ( شاهۆ ناوی جیهازەکەی من بوو ) لەیەك ئاشکرابووین یەکمان گرتەوە، ئەو گوێ درێژێکی پێ بوو، ئێمەش (٢) سامی دژە فرۆکەمان لا بوو بارمان کرد .شەوەکەی لە زەردەلیکاو بووین کاك حەمە پاریزۆڵە و شەهید ئەحمەد مەنجەڵێ برنجیان لێ نابوو، پاش نان خواردن لە تەنیشت کانییەکە حەساینەوە، م. نەجم و کاك سوهاد (٢سام ) و دەماننچەکەیان برد لە ئەشکەوتێ شاردیانەوە.

بەردەوام پەیوەندیمان بە هاوڕێیان سەنگاوی و ئەحمەد حاجی ڕەشیدەوە ئەکرد بۆ ئاگادار بوون لەیەکتری شایانی باسە ئەو جیهازانە زۆر بەکەڵك بوو بۆ ئێمە لەو کاتەوە لە سنوور جولآینەوە ئاگادرای یەك بووین ، بەیانییەکەی ٩,٣٠ خولەك کاك شوکر قەرەبلآخی ئاگاداری کردین کە بڕۆین بۆ لای سەنگاوی لە ئاشداخ . لەوێدا بووین بە دوو دەستەوە من و حەمە سیاسی و سوهاد و دکتۆر هاوڕێ کە دکتۆری مەفرەزەکەمان بوو جولآین بۆ لای سەنگاوی و کاك حەمەڕەش ،ئەو ڕۆژە تەمشیت بوو لە ناوچەکە لە خواری دێ ( تەپەگەڕوس ) تەقەیان لێ کردین بەرەو گوندی ( براوەل) بۆخۆشاردنەوە، هیچ بڕیاری ڕوو بەڕووبوونەوەمان نییە ، شەوێ هەڵگەڕاینەوەبۆ گوندی ( مەسۆیی ) لەوێدا دوو پێشمەرگە چاوەڕوان بوو . کاك شێخ مقداد و ئیبراهیم دیسکۆ ، هەر ئەو شەوە گەیشتنە لای کاك حەمە ڕەش هەموو برادەران یەکمان گرت ئەحمەدی حاجی ڕەشید و شوکر قەرەبلآخی و مەلا ڕەحیم و مامە قالە و عەلی مامە نورە ، کامەرانە ڕەش . دوو دوو لە بن کاچ و ئەشکەوتەکانی

ئاشداخ خۆمان حەشاردا .. دەستمان کردە حکایەت و گفتو گۆ دەربارەی ژیانی پارتیزانی و .....تد .

پاش ماوەیەك لە گەڵ مەحمود سەنگاوی دابەزین بۆ لای عوسمانی حاجی مەحمودلە ناوچەی کفری پەیوەندیمان هەبوو لە گەڵ برادەران لە گۆبان (٢٩) پێشمەرگە هاتنە پیریمانەوە ( حەسەن حەمید ، مەجید دووزی ) ئەوان دەلیلمان بوون بۆ شوێنی حەوانەوەمان لە ( سێ قازان ) لەپشتی چیای باوە شاسوار کە ناوچەرگەی رژێم بوو دوژمن باوەڕی نەبوو لێرە پارتیزان هەبێ ! !کاك مەحمود شەوێك و دوو رۆژ لەوێدا مایەوە و دواتر هەندێ ئازووقەی لە گەڵ خۆی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ لای برادەران لە ئاشداخ .

من لای کاك عوسمان مامەوە و چاوەڕوانی برادەرانی خۆم بووم کاتێ من هاتم بۆ لای کاك مەحمود و کاك حەمە رەش ئەوان چوون بۆ لای برادەرانی تیپی ٥٣ ی سەید محەمەد بڕیار وابوو کاك عوسمان بگەڕێتەوە بۆ پشوودان من لەجێگاکەی بمێنمەوە ، بۆیە ئەو رۆژانە لەگەڵ کاك عوسماندا مەشغوڵی رێنمایەکانی بووم ، پاش پشوویەك لەگەڵ کاك عوسمان دەرچووین بۆ سەرقەڵا لەلای قەڵاکە لە ناو ناعورێکدا لەگەڵ م .محەمەد ئەمین و فائق حاجی حەسەن ئەوانی پێم ناساند پاشان لە چەمی شەرەف خۆمان حەشاردا و گەڕاینەوە بۆ لای برادەران، لەو سنوورە چەند شوێنێ بوو بۆ حەوانەوە و شاردنەوەی چەك و ئازووقە لە وانە شەقی شەریف تەیکەکان کەلهەر ..تد

ئێمە مەلجەئەکەمان ناوی ( جان ئاغا ) بوو نزیك شاری کفری لەگەڵ رێکخراودا پەیوەندیمان هەبوو ، شوێنی بەیەك گەیشتنمان ( دەواجنەکەی ئیبراهیم مەلا بانزین ) بوو دوو گوێدرێژمان بوو بە کارمان ئەهێنا بۆ ئەو مەبەستە ،ئەو برادەرانەی پەیوەندیمان بوو لەگەڵیان بریتی بوون لە ( عەزیز و ئەبو عەلی (سوپا) .) ئەو

ڕۆژانەی مەوعیدمان نەبوایە دوو سێ پێشمەرگە دەر ئەچووین بۆ گوندەکانی بەلەگە . ئۆمەر مل . گۆبان ..تد بۆ ئیشو کاری پێویست .

ڕژێم هەستی کردبوو پێشمەرگە لە ناوچەکەدا هەیە ، بۆیە تووشی نارەحەتی بووین ، ڕۆژێکیان مەلجەئێکیان تەقاندەوە . بۆیە کاك مەحمود بە جیهاز ئاگاداری کردینەوە بگەڕێنەوە بۆ لایان ، ماوەیەك لای کاك کوردۆ و حەمە پاریۆڵە بووین پاشان گەڕاینەوە بۆ ( دێی وریلە ) لە وێدا کونێکمان دۆزییەوە پێیان ئەوت ( کونە سوچەڕەکە ) لەوێ ڕەوشمان زۆر خراپ بوو ، جۆرە ( گەنە) یەکمان لێ پەیدا بوو زۆر ئازاری ئەداین ، ناچار بووین ئەو شوێنە بەجێ بهێڵین . مەلجەئێکی تر دروست بکەین بۆ خۆمان. من تووشی نەخۆشی گرانەتا بووم ، کاك کوردۆ هات بۆ لام ماوەیەك لامان مایەوە ، سەیر لەوەدا بوو پاش چاك بوونم حەزم لە گۆشت ئەکرد ، ئیتر کاك کوردۆ پێشمەرگەی نارد (٢) (سوێسکەیان ) بۆ کوشتم دەستم کرد بە گۆشت خواردن ...

دوای چاك بوونەوەم گەڕاینەوە بۆ ناوچەی کفری بۆ (کەڵ هەر ) ماوەیەك لەوێ بووین لە مەوعدێکدا برادەرانی ڕێکخستنمان بینی ، دواتریش گەڕاینەوە بۆ مەلجەئەکانی هەردەو جەوەڵەکانی هۆمەرمل لەوێدا هەندێ چەکمان بوو وەکو بی کەی سی و قەناس و چوار کلاشینکۆف.ئەوانەمان بە گوێدرێژ گواستەوە زۆر بەنارەحەتی چوون دنیا تاریك بوو باران دەباری ، گەڕاینەوە بۆ هەردەی ( جوامێر ئاغا ) تەواری هاتبوونە ناوچەکە چەند تەقەیەکیان کردو ڕۆشتن ئێمەش بۆ لای برادەرانی ( کەڵ هەر ) جولاین پێیانمان ڕاگەیاند کە تەواری لە ناوچەکەدا هەیەو ئاگادار و وریابین چاکە ، ڕۆژێ بۆ سەر مەوعید ئەچووین کاك مەحمود جیهازی بۆ کردین ئاگاداری کردین کە حەمە سیاسی و هاوڕێ یانی دابەزیون ، لەگەڵ فەخرەدین گیراون ئاگاداربن .ئێمەش شوێنی خۆمان گۆڕیوە .

ئێمە ئەو شەوە چووینە مەلجەئی ( جان ئاغا) دووباری جۆراو جۆر ئازووقەمان بارکرد ؛ رۆژمان لێ بووەوە لە مەلجەئەکەی ( دەڵەکە ) بۆیە نەمان توانی بجوڵێین ، بۆ شەوی دوایی دیسان بارمان کردو کەوتینە رێ بەرەو ( دەرزیلە ) کاک مقداد و کاک حەمە ئاخە چاوەڕوان بوون ، پاشان چووین بۆ قەلآی تەپەگەڕوس بۆ لای کاک مەحمودو برادەرانی .

ئێمە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووین چۆن پارێزگاریێ لە خۆمان بکەین و بەردەوام بین لە ژیانی پارتیزانی ، لە سایەی هەتاوی قارسی گەرمیان و ژیانی سەخت و دژواردا ، گرفتێکی تری ئێمە ئەوەبوو جاری وا بوو ٤ مانگ دوو یان سێ پێشمەرگە بەیەکەو ئەوبووین بۆیە قسەکردنمان هەمووی دووبارەو شەش بارە بوو جاری وابووە رۆژ تائێوارە قسە نەئەکرا چونکە بەراستی هیچمان پێ نەبوو بۆ وتن !! تەنانەت قسە خۆشەکانیش ناخۆش و سواو بوون .ماوەیەك بەو جۆرە ژیانمان بەسەر برد پاشان کاك مەحمود گەڕایەوە پشتی قەلآی تەپەگەڕوس، کاك کوردۆ گەڕایەوە بۆ تیپی (٥٣) ئێمەش گەڕاینەوە ( کەلّ هەر ) بۆ نێو گوندەکانی کانی عوبێد و هەوارە رەقە ... پاش ماوەیەك بروسکەمان بۆ کرا بڕۆین بۆلای کاك مەحمود سەنگاوی و کاك عوسمان و رەتلەکەی گەڕاونەتەوە بۆ پشوودان

(٩) لە زاری پارتیزان ( حەمە چاو جوان) ەوە وەرگیراوە .

# بەرەو ئاش داخ

## ((کاک مەحمود سەنگاوی وەسیەتی کرد بە جلەکانییەوە بینێژین ))

بە کۆڵە پشتەکانمانەوە رێگا سەختەکانمان گرتە بەر بەدەم گفتوگۆوە یەک بەدوای یەکدا ، هەوڵمان دەدا شوێن پیێ کانمان بەدیار نەکەوێ . ئاش داخ بۆ ئێمە شاخێکی بەئەمەك و پاسەوان بوو، ئەڕوانێتە گەرمیان و لوتکەو چیابەرزەکانی قەرەداغ و ناوچەکەی لێوە دیارە.پیێ دەشتی گەرمیان لە ژێر چاودێری ئەو دایە . بنکەی سەرەکی پارتیزانەکان لەوێدا بوو( ئاش داخ ) .

رێکەوتی ٥/٧/ ١٩٨٩،ئەو پۆلە پارتیزانە گەیشتنە ئاش داخ کاکە حمە رەش و شەهید حەمە ئاخەو هاوڕێیانی لەوێدا بوون، دیارە ئەیانزانی ئێمە بۆ لای ئەوان ئەچین ، جیهازە راکاڵە گەورەکە لای ئەوان بوو ئاگاداریان کردبوونەوە مەحمود سەنگاوی کوردۆ قاسم و چەند پێشمەرگەیەکی تر .. بە هاتنی ئەم هاوڕێیانە ئەگەڕینەوە بۆ بارەگاکانی دواوە بۆ پشوودان .. لە دوورەوە بارەگاکانی رژێم دیار بوون ..لەو ناوەدا (٥) بنکەی پارتیزانی هەبوو هەریەکە نێوانیان ٥-٦ کیلۆمەتر بوو، شوێنی یەکەم ناوی هەژار ئاوا بوو ، شوێنێکی ئێجگار سەخت بوو بە خەیاڵدا ناچیێ ژیان لەوێدا هەبیێ ، کاک حەمە رەش لەو شوێنەدا بنکەیەکی دیاریکردبوو جیهازە راکاڵەکەش لەوێدا بوو، بۆ پەیوەندی کردن بە سەرکردایەتی و بنکەکانی خوارەوە ، بنکەی دووەم ( شەقەکەی حەمە ئاخە ) بوو ئەمەیان شوێنێکی خۆش بوو بۆ ئارامی پاتیزانەکان ، شوێنی سیێ یەم ( کونی فاصولیاکە ) و چوارەم ( کونی بزن و کارەکە ) و پێنج ( کونە ساردەکە ).

ئەو چەند رۆژەی لەلای برادەران بووین هێدی هێدی ئاشنایەتیمان پەیدا کرد،لە جۆری ژیانی ئەوان و هەڵسوکەوتیان، کاک حەمە رەش زۆر رێنمایی دەکردین ئەو

شارەزاو لێپرسراو بوو  لە رێکەوتی ١٩٨٩/٧/١٤ ئەو برادەرانە بەرێ کەوتین بۆ سەرکردایەتی .. ئێمە ماینەوە لە شوێنەکانیان ئەو بنکانەی باسم کردن هەموویان لەپشتی دێی پێنج ئەنگوست و شاخی ئاش داخ دا بوو ، ئێمە زۆر جار گوێبیستی دەنگی سەرباز و جاشە کوردەکان ئەبووین .

لەو ماوەیەدا سەنگاوی و برادەران بە جەولە دەرچوون بۆ لای برادەرانی خوارەوە لە بنکەو شوێنەکانیان  سەردانمان کردن بۆ ئاگاداربوون لە جۆری  ژیان و دەنگ و باسی ناوچەکە پاشان گەڕاینەوە شوێنی خۆمان .لە ١٩٨٩/ ٨/١ کاک عوسمانی حاجی مەحمود  بە جیهاز ئاگاداری کردین کە سەید محەمەد کە یەکێ لە سەرکردە پارتیزانەکانە  لە قۆڵی کەلار – گەرمیان دەست گیر کراوە..(کە بەمەبەستی دروست کردنی پەیوەندی نێوشار لەشاری کەلار دەستگیر کرابوو ) دیار بوو ئەو کەسانەی کە پەیوەندیان لەگەڵ کردبوو خەڵکی خۆفرۆشیان تێدا بوو .

کاک سەید هەموو شتێکی دەربارەی پارتیزانەکان دەزانی چ لەبارەی شوێن و بنکەو بارەگاکان، ئەمەیان زۆر جێی نیگەرانی و ترس بوو . تەنها شتێك کە هەندێ ئێمەی لە دڵە راوکێ بەدوور دەگرت ئەویش ئەوە بوو کاک سەید خەڵکی قارەمان و خۆڕاگر بوو ، بە ئاسانی تووشی هەڵەنابێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویست بوو ئاگاداری خۆمان بین .

ئێمە یەکەم مەفرەزە بووین گەڕاینەوە بۆ گەرمیان ، بە نارەحەتیەکی زۆر ، تووشی رووداو بووین ، رێگاکرایەوە بۆ گەڕانەوەی پێشمەرگەی تر بۆ گەرمیان مەفرەزەیەکی تر  کە کاک حەمە چاو جوانی کفری سەرپەرشتی دەکرد گەشتە ناوچەکە، و لەگەڵ خۆیاندا چەکی سامیان هێنابوو لە گەڵ چەند فیشەکێ کە بەراستی ئەرکێکی گران بوو ، لە دڵی خۆمدا وا بۆی ئەچووم برادەران بیانەوێ چالاکی ئەنجامبدەن ، رەنگە پەیوەندی بەگرتنی کاک سەید محەمەدەوە بێت ! .

بەهاتنی ئێمەو مەفرەزەی دووەم ، ژمارەی پارتیزانەکان زۆر بوون بۆیە پێویستمان بە بنکەو ئازوقـەی زیـاتر بـوو ، بۆیـە داوامـان کـرد لـە رێکخـراوی نـاو شـار ئازوقـەو کەلوپەلی زیادمان بۆ پەیدا بکەن. بڕیاریشدرا ئەو مەفرەزە تازەیە لە دیوی قـەرەداغ شوێنیان بۆ دابین بکرێ بۆ ئاسانکردنی کاری پەیوەندی .

رێکەوتی ١٩٨٩/٨/١٧ سـەنگاوی و کـاك سوهاد و بەنـدە بـەرەو شـاخی سـەگرمە بەرێ کەوتین هەم بۆ ئاگاداری ناوچـەکەو هـەم بـۆ سـەردانی برادەرانـی زەردەلیکـاو تەپە گەروس لەو جەولەیەدا شـوێنی زۆر چـاکمان دۆزییـەوە ، کونێکی گـەورە مـان بـەدی کـرد لـە دوو لاوە نیمچـە دەرگـای هـەبوو ، دەرگایـەك بـە ڕووی شـاخەکەوە دەرگایەکیشی بـەڕووی پانتـای گەرمیانـدا ئـەیڕوانی .هـەر لەبـەردەم دەرگاکـەدا دار هەنجیرێکی گـەورەی لێ بـوو ، هـەروەها سەرچاوەی ئـاوی لیْ بـوو .پـاش گفتـو گۆ دەربارەی ئەو شوێنە کە تاڕادەیەك ناوەنـد بـوو بـۆ گـەرمیان و قـەرەداغ و سـەنگاو دەربەندیخان و شارەزوور . لەو شوێنەدا بە تەڵـە ( دەڵەکەیـەکمان ) گردبـوو ، بۆیـە ناوی ئەو شوێنەنرا کوونە ( دەڵەکە ) .

پـاش گفتـو گـۆ بڕیـار درا بێنـە کونـە ( دەڵەکـە ) جیهازەکـەشمان هێنـابوو ، شوێنەکەمان چاك کرد ، ژوورێکی چاکمان بـە نـایلۆن دروسـت کـرد ، کـەل و پـەل و بەتانی و راخەمان تێدا دانـا و شـوێنی بـاش بـوو ، ئێمـە زۆربـەی کـات بـە رۆژ لـە ژوورەوە دەبووین . ئێمە ئازوقەمان لە کفرییەوە بۆ دەهات ( کـاك سـوپا، ئەبوعـەلی کەسێکی زۆر لێ هاتوو بوو لەو ڕووەوە ) کـاك کـوردۆ قاسـم هیمـەتی چـاکی ئـەکرد ئازوقـەی ئەگەیانـە عـەلیانی گـەرمیان . پاشـان دابەشـی ئـەکرد بەسـەر بنکـەکانی سنووری چالاکیدا، ئێمە بۆ ئەوەی ئازوقە بگەیەنین هەشت رۆژی پێ ئەچوو ( کەرە گوێ لەق رۆڵی چاکی هەبوو لەو رووەوە) .

هاوکاری کردنـی برادەرانـی نـاو شـار بـۆ ئێمـە رۆڵـی چـاکی بـوو . جگـە لـەوەش یارمەتیەکی مانگانەمان هەبوو لە کـاتی خۆیـدا پێمـان دەگەشـت هەرچـەندە ئێمـە

پێویستمان به پاره نەبوو، بۆیه ئەو پارەیه دەمایەوه تاوەکو ئەگەڕاینەوه بۆ پشوو . زۆر ماوەیەك بوو خۆم نەشۆرد بوو . هەر ئەوه نەبێ جلەکانمان ئەگۆڕی کە لە ڕێکخراوەوه بۆمان ئەهات ، هەستم ئەکرد گیانم زۆر داگیراوه ، خۆشۆردنیش کێشە بوو، چوون ئێمە لەسەرچاوەی ئاوەوه دوور بووین ئەو ئاوەی دەمان هێنا هەر بەشی چێشت لێ نان و حاجەت شۆردنی ئەکرد ، بەزۆریش نەمان ئەتوانی لەسەرکانیەکان خۆمان بشۆرین . پاش ماوەیەکی زۆر لە ١٩٩٠/٣/٢٣ دوای شەش مانگ پێم نا بەجەرگی خۆمدا و لە شاخی سەگرمە هاتمە خوارەوەو چوومە بن کاچێ دەستم کرد بە خۆ شۆردنم و پاش ئەوەی چەند جامی ئاوم بە خۆمدا کرد زۆر بەلامەوه غەریب بوو، زۆر خۆش بوو بەلامەوه بۆنی سابوون.

دوژمن زۆر بەدوای ئێمەدا ئەگەڕا زۆر چاك دەیزانی پێشمەرگە لەم ناوچەیەدا هەیە ، بەڵام ئێمە بەوریاییەوه شوێنەکانمان هەڵبژاردبوو ،زۆریش بەوردی ئەجولاین ، زۆر جار دوژمن بە شەو ڕۆژ ئەمانەوه و ئێمەش نە ئەجولاین .. هیلاکی و کەم خواردن و کەمی خزمەت بووه هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لەنێو پێشمەرگەکاندا ، ئێمە دکتۆرمان لابوو ،بەڵام هیچ جیهازێکی پزیشکیمان لانەبوو بۆ پشکنین ، تابتوانرێت لەرێگایەوه نەخۆشیەکان دیاریبکرێت .

سەنگاوی تووشی ئەو نەخۆشییە بوو ( لەرزوتا ) زۆر بێ تاقەتی کردبوو .مانگی ٢/ ١٩٩٠ نەخۆشی هێندە بێ تاقەتی کردبوو ، وەسێتی بۆ ئێمە کرد ، ئێمەش زۆر بێ تاقەت بووین ، ئەو کاتەلە ناوزەنگەنە بووین لە کونی (دەڵەکە) ئەم کونە کونێك بوو دەڵی تێدا تەرەکی بوو ، ئێمەش شوێنەکەمان داگیر کرد ، سەنگاوی پێی ووتین : کەس بەمنەوه خۆی هیلاك نەکات ، کەمردم شوێنێکی دیاریکرد وتی هەر لەوێدا بمنێژن بە جلەکانە وە ، بەڵام دیاری بکەن بۆ پاشە ڕۆژ ئەم قسەیە زۆر بێ تاقەتی کردین لە گەڵ دکتۆر هاوڕێ و کاك حەمە ئاخە دا قسەمان کرد چی بکەین ، دکتۆر وتی لیستی دەرمانتان ئەدەمێ بڕۆن لە ڕێکخراو لای هاوڕێ سوپا بهێنن .

هەر ئەوشەوە لەگەڵ کاك حەمە ئاخە بەری کەوتین و دەمەو بەیانی گەیشتینە گەرمکی نێو داودە لە ئەشکەوتێ ماینەوە ( کەرە گوێ لەق چوار پەلمان بەستەوەو خواردن و ئاومان بۆ دانا ، ئەو رۆژە ئیسراحەتمان کرد ، شەوی دووەم چووین بۆ لای هاورێ سوپا و کاك عەزیز ناوێکی لەگەڵ بوو لیستی دەرمانەکەمان پێ دان ،هەروەها داوای برنج و رۆن پاتری و هەندێ شتی ترمان لێ کردن . بۆ شەوی دواتر چووینە سەر مەوعید هەموو شتێکی هێنابوو ..ئیدی گەڕاینەوە بۆ لای برادەران شەوێ سەعات ١٠–بۆ ١١ ی شەو بوو گەیشتین ، دکتۆر هاورێ دەرمانەکانی دایە سەنگاوی و زۆر تەشجیعمان کرد بۆ خواردنی ئیتر باش بوو رۆژ بەدوای رۆژ کاك سەنگاوی چاکتر دەبوو ، مەترسی لەسەر نەما ،مامۆستا یاسین بە تەنیا لە کونە دەڵەکە بەجێمان هێلا بوو لای جیهازەکە .( مامۆستا یاسین پیاوی شاری بوو ، بەلام تاوەکو بلێی پیاوێکی بە هیمەت بوو زیرەکانە سنگی دابووە بەر پارتیزانی زۆر بەداخەوەشەهید بوو ) پەیوەندی پیوە کردین کە کاك نەوشیروان دەیەوێ لەگەڵ سەنگاویدا قسەبکات ، سەنگاوی ئەگەر چی هێشتا بەتەواویی چاك نەبووەوە بەلام بریاری جولانەوەی دا .ماینێکی شەلەمان پێی بوو سەنگاوی سواری بوو ئێمە (٦) کەس بووین بەرێ کەوتین شەوی یەکەم گەیشتینە کونە فاصولیاکە چەند رەبایەیەك نزیك لەو ناوە بوو، ئێمەیان بینی راستە دەنگیان نەکرد بەلام لە چەمی کانی کەوە تووشی کەمین بووین ، من و کاك حەمە ئاخە لە پێشەوە بووین حەمە ئاخە وتی : بۆنی گاز دێ بۆیە هەندێ سلّمان کردەوە تەماشامان کرد ئیڤایەك وەستاوە جاری هەر گەرمەو خۆیان چوونەتە شوێنێکی تر دیاربوو خۆیان مەلاس دابوو ، بۆیە بەپەلە گەڕاینەوە برادەرانمان ئاگادار کردەوە .پاشان بەرێ کەوتین زۆر ماندوو بووین پاش ١٢ سەعات رێگا کاك مەحمودیش بەو نەخۆشییەوە کە گەیشتینە لای مامۆستا یاسین لە کونە دەڵەکە بەیانی زوو بوو لە دەرگای کونەکە دانشتبوو چاوەڕوانی ئێمە بوو .مامۆستا یاسین بە گەیشتنی ئێمە زۆر دڵ خۆش

بوو ، ماوەیەك لەوێداماینەوە بڕیاردار بە گۆڕینمان بەلاّم كەس ئامادەنەبوو بێتە شوێنەكەمان( ئەتوانم بڵێم رەنگە باوەڕیان بە مەسەلەكە نەمابوو) پاش ماوەیەك كاك عوسمانی حاجی مەحمود پەیوەندی كرد ئاگاداری كردین هەر خۆی و هەمان مەفرەزە دائەبەزن بۆ گۆڕینمان .

٢/٤/١٩٩٠ پاش دیاریكردنی مەوعید لە گەڵ سەنگاوی و مامۆستا یاسیندا پێشوازیمان لە عوسمانی حاجی مەحمود و برادەرانی كرد شەوەكەی خۆمان گەیاندە (هەرەسەكە) پشتی ( ویلەكە ) لەوێدا پاش پشوویەك شەوێكی خۆشمان بەسەر برد لە نێو ئەو تاوێر و بەردانەدا ئەوان تازە گەڕابوونەوە ١٠ كەس ئەبوون ئێمەش ٣ كەس رۆژی دوایی دنیا زۆر تەم و مژبوو . دیسان بەیانییەكی هەر تەمو مژ بوو ، بۆیە لە شوێنەكەمان جولاّین بەرەو دێی نەوتی بەلاّم لە ناوەڕاستی رێگا ئەو تەم و مژە نەما دنیا رۆشن بوو ، ئێمەش لە ناوەڕاستی رەبایەكاندا بووین ، ئەوان ئێمەیان ئەبینی بەلاّم قەد بە ئاوازیانەوە نەئەچوو ئەمانە پێشمەرگە بن خۆمان بۆ هەموو رووداوێك ئامادە كرد ، ئەو بارودۆخە لە فلمێكی ئامادەكراو ئەچوو پاش ئەوەی كە دەربازبووین بەباشی رێگامان بڕی كەوتینە پشت دێی نەوتی پاش رۆژێك گەیشتینە بارەگاكەی خۆمان لەشاخی سەگرمە پاش چەند رۆژێك پشوو هەموو شتەكانمان تەسلیم دەستی برادەران كرد ، واتا كاك عوسمانی حاجی مەحمود ، ئێمەش ( كاك مەحمود و كاك كوردۆ ئەو برادەرانە لە ١٢ /٤/١٩٩٠ گەڕاینەوە بۆ سەركردایەتی بۆ پشوو، كاك عوسمان ئەو كاتە لێپرسراوی یەكەمی سیاسی و عەسكەری ئەو بنكەو بارەگایانەی گەرمیان بوو هەربەڕاستی ژیانێكی دژوار وسەختمان بینی بەلاّم مرۆڤ ژیانی چەند نارەحەت بێ هەر ئەوەندە گرنگە كە رابێی لەسەری ئەگەر هیمەت و باوەڕ هەبێ زوو هەڵدەكرێت .

(١٠) لەزاری پارتیزان ( مقداد بەهادین محی دین ) ەوە وەرگیراوە

# پرۆژەی رزگارکردنی شاری کفری

## (( بەڕاستی کاک حەمە رەش پارتیزان بوو ))

کۆمەڵێك پێشمەرگە بووین ژمارەمان ( ٣٠-٤٠ ) پێشمەرگە ئەبوو ، هەموومان گەرمیانین و مەشقمان کردووە لەسەر جۆرەکانی چەك ، ئامادەی گەڕانەوەین بۆ گەرمیان . ئازووقەو کەلوپەلمان زۆرە ، لە (پاوە) دوولۆریمان بەکرێ گرت بۆ گواستنەوەی کەلو پەلەکانمان ، کاک حەمە رەش پێشمەرگەکانی جیاکردەوە بۆ دوو وەجبە ، کۆمەڵێك بۆ قەرەداغ و کۆمەڵی دووەم بۆ گەرمیان . بەمن و کاک حەمە پاریزۆڵە وکاک نەجات بایاد و دووکەسی تری وت ، ئێوە وەرن کۆبوونەوەم لەگەڵتان هەیە ، ئێمەی تووشی سەرسورمان و پرسیار لە خۆکردن کرد ئاخۆ بۆ ئێمەی جیاکردەوە ؟

کاک حەمە رەش ، پێی وتین : ئەوە هەندێ پارەیە (١٠) هێستر بکڕن و پاش سەعاتی (٧) ی شەو ئازووقە ئەگوێزنەوە بۆ چەمی خورخور و لەوێدا ئەیشارنەوە ، هەر بەشەویش ئەگەڕێنەوە، ئیتر ئەوان رۆشتن، ئێمە ماینەوە ( هەموو جولآنەوەکانی ئێمە بەشەو بوو ) ساڵی ١٩٩٠ مانگی (٩) بوو ئێمە بۆ رۆژی دوایی چووینە گوندی (رێژاو ) ئەو ژمارە ولآخەمان کڕی و گەڕاینەوە ، ئیتر هەموو شەوێ لە کاتژمێری (٧) ی شەو کاروان ئەکەوتە رێ ، شەوان کاتژمێری ١١ ئەگەیشتینە چەمی( خور خورە) و ئازووقەکانمان لە شوێنی دیاری کراو دائەنا ، بەوشێوەیە هەموو شتەکانمان گواستەوە. ئیتر ئێمەش بەرێ کەوتین، ئەوان جێگایان بۆ دیاریکردبووین لە بەرامبەر ( باوەنوور ) بە هێسترەکانەوە بەرێ کەوتین ، کاك ئەحمەدی حاجی رەشید لە گەڵ مەفرەزەکەی هاتبوون بۆ پێشوازیمان ، ولآخەکانمان دابەدەم ئاوەوەو خۆشمان بە بەلەم کە دروست کرابوو بۆ پەڕینەوە چووینە پاریزۆڵە لای کانی ئاوێك لامان دا ، پشوومان داو نان و چامان خوارد(یەکێ

له هێسترەکان ، زۆر هیلاك و سەرمای بوو بوو خۆی له قەڵوەزێکەوە خستە خوارەوەو خۆی کوشت).

ماوەیەك بوو لەم ولاتە دابڕابووم ، کاتێ ئێمە لێرە بووین ولات ئاوەدان و پڕاو پڕ بوو لە خۆشەویستی ، لێرە بەئازادی ئەسوڕاینەوە، کۆمەڵێ پێشمەرگە هاتبوونە پێشوازیمان وێڵی هەواڵی تازە بوون ، زۆر دڵخۆش بوون بە هاتنی ئێمە بۆ ئەو ناوچەیە.

پاشان بەرێ کەوتین بۆ مەلجەی ( کونە بەران) شوێنی تایبەتی کاك ئەحمەدی حاجی رەشید و مەفرەزەکەی بوو ، من و رزگار رەئوف بێگەر دانرابووین بۆ مەفرەزەیە لە دەوروبەری هۆمەر مل ، ئەبوایە بەرێ بکەوین . پاشان بەسێ قۆڵی لە گەڵ کاك حەمە رەشدا بەرێ کەوتین ، بەنێو ئەو هەردو بن کاچانەدا زۆر بەوریاییەوە ( هەربەراستی کاك حەمە رەش پارتیزان بوو ، زۆر وریا و وردە کاربوو ) کاتژمێر ١١،٥ ی ئەو رۆژە گەیشتینە چەمی سەرکەل هەرچەند رۆژ بوو بەلام شارەزایی کاکە حەمە رەش وای کرد بگەینە شوێنی دیاریکراو .

که گەیشتین زۆرمان برسی بوو ، کاك حەمە رەش وتی :ئێوە برنج لێ بنێن ، منیش پووش و پلاش کۆ دەکەمەوە، ئێمە مەنجەڵی بچووکمان بوو بۆ ئەو مەبەستە . پاش کاتژمێرێك بەرێ کەوتین بەرەو گامەخەڵ من لە پێشەوە بووم ، لە ملەیەك سەرکەوتین هەستم کرد تیشکێ بریقەیەك بەر چاوم کەوت ، لەلای گامەخەڵەوە، زۆر بانگم لە کاکە حەمە رەش کردو خۆمم دا بەزەویدا ئەویش بە پشت کۆماوی خۆی گەیاندە لام ، پێم وت : تیشکێ دیارە بەدووربین کەوتە تەماشاکردن ، جاش و جەیش پڕ گامەخەڵە ئەبێ رێگامان بگۆرین بۆیە بریارماندا بچین بۆ گلاڵ کەوەی ناو زەنگەنە ، هەموو گوندەکانی ئەو ناوە پڕ بوو لە جاش و جەیش .

تەمشیت دەستی پێ کردبوو لە دێکانی (سەرەکش .کانی عوبێد .عەلیان . قولیجان ) . پاش بیرکردنەوە دیسان رێگامان گۆڕی چووین بۆ مەلجەئی (کەڵ هەر) زەل و

قــەرەمێکی زۆری لێ بــوو لەوێــدا خۆمــان حەشــاردا ، لــە ملەیەکــەوە موتابەعــەی ناوچەکەمان دەکرد ، عەسرێکی درەنگ جەیش گەڕایەوە ، ئێمەش جـولاین کاتـژمێر ۱۰،٥ گەیشتینە عەلیانی کۆن ، ئەوەندە هیلاك بووین ، شوێنەکەم لە بیر چوو بـوو ، شەوی پاشتر کاتژمێری (۱) ی شەو لە بنەکەی خەپە کـوێر بـووین ، دوو پێشـمەرگە چاوەڕوانمان بوون بە جیهاز ئاگاداری یەکتر بووین ، بە لایت یەکمان دۆزییەوە ، هەر بەیەك تیشك هەرچەندە ئەو کارە لەڕووی سەربازییەوە هەڵـە بـوو ، بـەلام چـارەیەك نەبوو ؛ ئەو دوو پێشمەرگەیە ( عەلی فەقێ مستەفا و کەسێکی تر بوو ) پاش بەیـەك گەیشتن بەرێ کـەوتین بـۆ پـیرە مـونی لەوێـدا ئـەو برادەرانـە پەناگەیـەکی باشـیان هەبوو شارەزایش بوون کە گەیشتینە ئەوێ زۆر هیلاك و ماندوو بووین ئێمـە ۳ کـەس بووین ئەوانیش دوو کەس .

کاتژمێر (٤) ی بەیانی دیسان بەرێ کەوتین چـووینە ناوچـەی داودە ، بـۆ مەلجـەئی (گەرماوڵە ) لای کاك سەید جەوهەرو مەفرەزەکەی کە ژمارەیان (۸) کـەس بـوون . جێگاکەیان باش بوو ، بۆماوەی چەند رۆژێك لای ئەو برادەرانە ماینەوە ، کاك حەمـە رەش و کاك موکەڕەم و کەسێکی تر دوو ولاخیان لەگەڵ خۆیان برد و چوون بۆ لای برادەرانی رێکخستن لە کفری بۆ هێنانی ئازووقەو زانینی هەواڵی ناوچەکە .

ئەو رۆژانە بۆ من زۆر جێی تێڕامان و بیرکردنەوە بوو . ولاتێك وێران و چۆڵ و هۆڵ ، جگـە لـە رابـردوو و قسـەی بـرادەران نـەبێ هیچـی تـر نییـە !! ئـەو قسـانەش لـە جیهازەوە وەرئەگیرا ، ئێمە بێ ئاگا بووین لە شتە نهێنیەکان ، راسـتیەکەی مـن زۆر بێزار بووم ، چوون هیچ لە کەس و کارم نەمابوون و هیچ دڵێکم بە ژیان خۆش نەبوو. پـاش سـێ رۆژو سـێ شـەو کـاك حەمـە رەش و ئـەوان گەڕانـەوە لـە گـەڵ کۆمـەڵێ ئازووقەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو ئەمە زۆر دڵخۆشـی کـردین . ( لەهـەمووی خۆشـتر پرتەقاڵ و لیمۆیان هێنابوو ) پاش چەند رۆژێك کاك حەمەرەش گەیاندمانیـە شـوێنی خۆمان لای شەهید عەلی سوور ئەوان مەفرەزەیەك بوون پێك هاتبوون لەم بەرێزانـە (

کامەرانە ڕەش . مام سابیر . عەلی مامە نورە ) هەر لەگەڵ چوونم بۆ لایان بیرمان لەوە کردەوە مەلجەئێ بۆ خۆمان دروست بکەین ، بیرمان لە شوێنی گونجاو ئەکردەوە ( لە دێی عەزیز قادر لە ناو ئەرزەکەی عەمین عەلی سەفەر ، لەنێو تاوێرو بەردەکاندا ژوورێکمان دروست کرد ٣م ×٤م ) بە هەموومانەوەکارمان تێدا کرد .پاشان بۆ ئەو ژوورە کونێکمان بۆی دروست کرد ، بۆ چوونە ژوورەوە ، بەشێوەیەك دروستمان کردبوو تا بتوانین هەندێ جار چێشتی تێدا لێ بنرێ . مام سابیر لەورووەوە لێپرسراو بوو ئێمەش هاوکاریمان ئەکرد و ڕێزمان لێ ئەگرت و خۆشەویستی هەموان بوو . کاك عەلی سوور لێپرسراوی مەفرەزە بوو من وەکو جێگر کارم دەکرد، و جیهازی بچووکمان لابوو بۆ پەیوەندی رادیۆو هەندێ جاریش کتێب .لەو ڕۆژانەدا هەست ئەکرا بەراستی ڕێکخستنەکان پەرەی سەندووە .

جارێکیان بۆ ماوەی هەفتەیەك من وکاك عومەر بەتەنها ماینەوە لە مەلجەئەکەمان ئەو ماوەیە هەر بەگۆرانی و شمشاڵ و جوزەلە لێدان تەواو بوو، زۆر جاریش قسەی خۆش ، ماوەیەك گواستمانەوە بۆ مەلجەئێ لە چیای مازوخ ، لای برادەرانی حزبی شیوعی هەر بەراستی شوێنێکی گونجاو بوو ، سێ پێشمەرگە بووین خۆم و مام سابیرو کاك عومەر ، ئازووقەو شتمان لابوو ، بەیانییەکی زوو مام سابیر چووە دەرەوە بانگی لێ کردین کوڕینە وەرنە دەرەوە تەماشای ئاسمان بکەن چۆن دوکەڵ داگیری کردووە.

ئەو کات بۆمان دەرکەوت ئەمریکا لە عێراقی داوە ، ئێمە هەندێ شتمان ئەزانی کە ڕژێم هێرشی کردوەتە سەر کویت و داگیری کردووە، بەڵام کەس ئەم ڕووداوە گرنگەی بۆ ئێمە شی نەکردەوە .

دەوروبەری ١٩٩١/٣/٥ کاك عوسمانی حاجی مەحمود هات بۆ لامان لە گەڵ کاك حەمەرەشدا دابەزین ، بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵکی شارو شارۆچکەکان ، ئەوکات

بەتەاویی گرنگی رووداوەکەم بۆ دەرکەوت ، کەباس هاتە سەر دابەزین بۆ شارەکان و لاوازی رژێم ، بیرم بۆ لای درەندەیی رژێم و هێزە زەبەلاحەکەی ئەچوو .

هەربۆیە لەبەرواری ١٩٩١/٣/٥ لەگەڵ کاك عوسمانی حاجی مەحمود و عەلی سوور و عوسمانی مەلا جەمیل بەسەرپەرشتی کاك عوسمانی حاجی مەحمود دابەزین بۆ کفری بۆ دیداری شێخ عەتای تاڵەبانی ، کاتژمێری ١٢ ی شەو ئێمە لەچاوەڕوانیدا بووین ، سەیارەیەك هات بۆ چرکەیەك وەستا و کەسێ دابەزی ، لەگەڵ کۆمەڵێ خواردندا هات بۆلامان . پاش ئەوەی گفتو گۆ کرا پرۆژەو پلان دانرا ، تاوەکو کاتژمێری ٤ ی بەیانی قسە کرا پاشان گەڕاینەوە ، رێکەوتی ١٠/٣١١/ ١٩٩١ بەرنامە خرایە کارەوە و پاش رزگاکردنی زۆربەی شاروشارۆچکەکانی کوردستان کە چووینە نێو شاری کفرییەوە بەشەو و رۆژەکەی کفری ئازاد کرا .هێزەکەمان پێك هاتبوو لەنزیکەی ٤٠ پێشمەرگە بەسەرپەرشتی کاك عوسمانی حاجی مەحمود و کاك شەهید حەمە رەش .کاتژمێری ١١ ی شەو گەیشتینە سەر پردی کفری کە دەروازەی شارەکەیە ، زۆر هیلاك بووین چونکە زۆرباران دەباری هەموو گیانمان ئاو بوو لەسەر جادەکە دانیشتین کاك عوسمان بەمن و شەهید کامەرانە رەشی وت : بەدووربین تەماشا بکەن بزان کەمین هەیە ، ئێمەش چووین سەیرمان کرد بینیمان دووسەیارەی گەورە وەستاوە هەموویان جیش شەعبین کەمینیان دانابوو ، ئێمە گەڕاینەوە لای برادەران وتمان کەمین هەیەو زۆرن لەم کاتەدا دەنگێك هات لە ملەکەی ناساڵحەوەنزیك بوو لێمانەوە بینیمان ٤ جەیشی شەعبی عەرەب بوون نوقتەی ناساڵحیان چۆڵ کردبوو هاتبون بۆ ناو ناری کفری . دواتر ئێمە لە خوار پردەکەوە دامان لە ئاوەکە ، ئاو زۆر هاتبوو لەوێوە چووینە گەڕەکی ئیشتراکی چووینە ماڵی کاك سەلامی پورزای کاك شەهید عەلی سوور تا کاتژمێری ٤ ماینەوەپشوومان داو دواتر کەوتینە رێ بۆ لای بارەگاکانی بەعس لەشار دواتر هێزەکەمان بوو بەدوو بەشەوە بەشێکی بۆ پۆلیسی کفری و بەشێکی تری بۆ سەر

ئەمنی  کفری بەشێکی بەسەرپەرشتی کاك عوسمانی حاجی مەحمود بۆ سەر پۆلیس و حزب بەشی دووەمیش بەسەر پەرشتی شەهید حەمە رەش بۆ سەر ئەمن و دەزگاکانی تر ئێمە لەگەڵ شەهید حەمە رەش و شەهید کامەرانە رەش و عەبدولخالق بووین چووینە سەر ئەمنی کفری نزیکەی (٥) کاتژمێر شەڕ بەردەوام بوو.........

[١١] لە زاری پاتیزان ( نازم محەمەد شەریف )ەوە وەرگیراوە

## رۆژمێری هاوسەر

## ((مەلا سەعید ژمارەی ئۆتۆمبێلەکەی دزراوە))

مەلا سەعید پارتیزانێکی تری ئەم مەملەکەتەیە مەملەکەتی رووبەرووبوونەوەو خۆبەدەستەوەنەدان مەملەکەتی داستان و نەبەردی ..ئەو مەملەکەتەی پێ دەوترێت گەرمیان .

له دووتوێی رۆژمێرێکدا بەناوی ( رۆژمێری هاوسەر ) مەلا سەعید بەم شێوەیەی خوارەوە خۆی دەناسێنێت .

- ناو و ناز ناو : سەعید ئەحمەد محەمەد ناسراو بە( مەلا سەعید )
- پێشە : نازانم . پاتیزان
- شار : جاران کفری بوو .
- گەڕەك: روخاوە .
- شەقام : لا رێ دەگرین .
- ژمارەی تەلەفۆن : شکاوە .
- ژمارەی خانوو : رووخاوە.
- ژمارەی ئۆتۆمبێل : دزراوە .
- جۆری خۆین : +O

کاتێ رۆژمێرەکەی مەلا سەعیدی پاتیزانم خوێندەوە بەڕاستی منیش ئاوێتەی روداو و رۆژە سەختەکان بووم . چەند جوانە مرۆڤ سەرەڕای سەختیەکانی ژیان ، هەردەم بیری لای تۆمارکردنی مێژوو بێت تا وەك دۆکیومێنتێك بیخاتە بەردەستی نەوەی دوای خۆی و پێیان بڵێی ئەو دەستکەوتەی ئێستا بەری رەنجی ساڵەهایە له خەبات و نەسرەوتنی پاتیزانەکان .مەلا سەعید کۆمەڵێك رووداو ساتەوەختیی له دوو توێی

ڕۆژمێرەکەیدا تۆمارکردووە . منیش بەباشم زانی وەك خۆی و بەبێ دەستکاری هەندێك لەو تۆمارانە بخەمە سەر بەرهەمەکەم و لە ڕێگای ( ژیلەمۆی گەرمیانەوە ) بە خوێنەرانی ئەشنابکەم :

١١ / شوبات ١٩٩٠ شەممە

– ئەم بەیانییە لە سنەوە چووینە بانە لەوێشەوەگەیشتینە سەردەشت ئینجا قاسمەڕەش ، لە سەرکردایەتی چاوم کەوت بە ئەبو عەلی و کاك بەهروز .

– ١٨/ شوبات١٩٩٠ یەك شەممە

کاك نەوشیروان و کاك ملازم عومەر و کاك کوسرەت کۆبوونەوەیان پێ کردین .

– ٢١/ شوبات ١٩٩٠ چوارشەممە

بەیانی کەوتینە ڕێ هاتینە سنە ئینجا هاتینە کانی بنارو شەو لەوێ بووین .

– ٢٩/ ئازار پێنج شەممە

دوای نیوەڕۆ من و کاك عوسمان و ... جەمال و ملازم و کامەران و نەوشیروان و صباح و حەسەن و مەجید و ڕەمەزان لە سەقز هاتینە بلەکێ ئێوارە کەوتینە ڕێ بەرەو کوردستان شەو .......... پشووماندا .

– ٣١ / ئازار ١٩٩٠ شەممە

لە دۆڵە تووەوە کەوتینە ڕێ شەو گەیشتینە وێڵە لە ناو کانیاوەکەدا پشووماندا و دوو پیاوی خەڵکی ئەو ئوردوگانەشی لێ بوو مام ساڵح و مام ڕەحیم .

– ٦/نیسان ١٩٩٠ هەینی

لە کونە هەنجیرەکە بووین کاك کوردۆ و کاك سوهاد و حەمە چاو جوان شەو هاتن بۆ لامان .

– ١٧/ نیسان سێ شەممە

لە کونە هەنجیرەوەکەوە هەموومان هاتینە دەرەوە ، ڕەمەزان و حەمە ئاخە چوون بۆ ئەولا ئێمەش هاتین لە تەنیشت مەسۆیی و مراوە ......

- ٢٧/ نیسان هەینی

بەیانی زوو لە دوڕاجیەوە کەوتینە ڕێ نیوە ڕۆ هاتینە بەلگەی خوارووو تا ئێوارە لەوێ بووین ، شەو گەیشتینە شەق شەریف لای کاك عوسمان و سەباح ... حەسەن و هەردوو جەمال .

- ٧/ ئایار ١٩٩٠ دووشەممە

دوای عەسر چووینە رەحیم وەرقە نانی ئێوارەمان لەسەر ... خوارد ئێوارە چووینە سەر شەکەرەکە ....

- ٨/ ئایار ١٩٩٠ سێ شەممە

بەیانی تائێوارە لەو دەروبەرە بووین ئەو چووینە سید حوسێن شەو چووینەوە بۆ عەولاّ قووت لە ناو جۆگەکە ....کرد

- ٢٤/ ئایار ١٩٩٠

شەوی ٢٤ لەسەر ٢٥ چووینە مەوعیدەکە من و هەڵکەوت و کاك فائق شەو گەڕاینەوە ماڵەکان .

- ٥ حوزەیران ١٩٩٠ سێ شەممە

لە گەرماوە من و حەمە ئاخە دوای نیوەڕۆ هاتین بۆ ئەوبەر ئاوەسپی و ئاسکێکمان کوشت و هاتین شوێنەکەیان ناو نا ئاسکەکە.

- ١٣ / حوزەیران ١٩٩٠ چوارشەممە

لە ئاسکەکە بووین شەوی ١٢لەسەر ١٣ حەمە ئاخەو رەمەزان چوون بۆلای برادەران.

- ١٧/ حوزەیران ١٩٩٠

شەوی ١٧ لەسەر ١٨ من و کاك عەلی و سەباح چووین بۆ کونی ئاخە و ئێمە لەوێ چاومان بە ملازم عەباس کەوت و گەڕاینەوە بۆ ئاسکەکە.

- ٢١ / حوزەیران ١٩٩٠ دووشەممە

ئێوارە من و کامەران چووینە سەید حوسێن و شەو گەڕاینەوە حەسەن ئاوا .

- ٢ / تەمموز ١٩٩٠ دووشەممە

یەکــەم رۆژی جــەژن لــە عــەلیاوا بــووین مــن و کامــەران ، رۆژنامــەو کتێبمــان ئەخوێندەوە ، چووینە چەمەکە دەمەو ئێوارە خۆمان شۆرد .

- ٧ /تەمموز دووشەممە

سەعات ١١ لە کونە کەمتارەکە وە چووین بۆ عەلی ئاوا ئێوارە چووینە پاشا کوژراو سەعات ٦,٣٠ کەوتینە رێ لە جادەکە پەرینەوە....

-٢/ ئاب ١٩٩٠

رۆژی داگیر کردنی کویت .... هەتا ئەمرۆ ٣٠ رۆژ لە خوارەوە بووین ، ئێوارە من و هاورێ هەڵکەوت چـووینە خـوار تلیشـان و دواتـر گەڕاینـەوە پاشـا کـوژراو ، شـەو گەڕاینەوە .....

- ٦/ ئاب ١٩٩٠ دووشەممە

ئێوارە هەر چوارمان چووینە ئاوایی سەیدە گەڕاینەوە حەسـەن ئـاوا ، دوای ئـەوە چـووینە زەرداو شـەوی ٦ لەسـەر ٧ بڕیـاری ٦٦١ ی ئەنجوومـەنی ئاسـایش بـە ١٣ دەنگە موافقەو ٢ دەنگ مواقتە مقاتعەی ئابوری و بازرگانی خرایە سەر عێراق .

- ٢٥ / ئەیلول ١٩٩٠ یەك شەممە

عەسر بوو من و نەوشیروان و دکتۆر ئاتیلا و رەمەزان کەوتینە رێ شـەو سـەعات ١ گەیشتینە شەقی شەریف لەوێ ماینەوە ...

- ٢/ تیشرینی یەکەم ١٩٩٠ چوارشەممە

یەکگرتنی هەردوو ئەڵمانیا ، هەتا ئێوارە لە نـاو دارەکـان بـووین ، نیـوەڕۆ دایکـی دکتۆر ئاتیلا هاتە لامان هەتا ئێوارە لامـان بـوون ، دواتـر رۆشـتن ئێمـەش ئێـوارە هاتینە رەحمان ئاوا شەو لەوێ بووین .

- ٤/ کانوونی یەکەم ١٩٩٠ سێ شەممە

لە بنکەکەی کاك حەمە بووین ( حەمە پارێزڵە )

- ٥ / کانوونی یەکەم ١٩٩٠ چوار شەممە

بەیانی سەعات ٣ حەمە رەش و مامۆستا سەلاح و مامۆستا جەلال برای حەمـە رەش و کاک ئاوات و حەمە چاو جوان... شێخ لەتیف .. سەیوان ... تـائێوارە مـن و کـاک عوسمان و کاک یاسین هاتینە سەر ئاو چاومان کەوت بـە مـام سـابیرو نـازم و عـەلی سوور و عەلی کامەران ..هەندێ لەبرادەرانی تر لەگەڵ کاک حەمە پاریۆڵە شەو بەرەو ئێران ..

- ٢١ / کانوونی یەکەم ١٩٩٠ هەینی

بەیانی من و کاک عوسمـان و کـاک جـەبارو کـاک کـوردۆ هاتینـە سـنەو ئینجـا کـانی دبنارو شەو لەوێ ماینەوە .

- ٢٤ /کانوونی یەکەم ١٩٩٠ دووشەممە

لەبەیانی زووەوە بەفر باری و نەیکردەوە ، چوومە مەریوان و گەڕاینەوە کانی دنبار .

[11] لە ڕۆژمێری هاوسەری مەلا سەعیدەوە وەرگیراوە

# مژده بۆ چەند تابلۆیەکی تراژیدی

-١-

لە گەرمیانی زینانەدا

لە ملوانکە دێی

دوو کەناری ئاوی چەمدا

لە داوێنی سنوورەوە

لە گوندی یەكماڵەی دوورەوە

لە دێیَ گۆبان ، لە دێیَ حەسیر

تا گۆپتەپەی خنکاوی ناو دووکەڵی سیر

هەر شوێنێکی ئەم بەهەشتە

دەستی بەعس پێگەیشتە

تۆبڵێی تۆ ..

گەڵاو چڵی درەختەکان

رەنگی خۆڵیان داوە لە خۆ

قەدو لقیان ، تەپ و تۆزی گوندی روخاو ، هەڵدەدەنە

سەری خۆیان .

-٢-

کانی باجگەی چاو قرژاڵی

زینوی هەورازی سەگرمە

هەردوو دەستی ئامێزی چاوەڕوانی

رەپ بووە ، بۆ مژینی لێوی وشکی

رێبوارێکی دۆڵی قەراخ

دەشتی گەرمیان و حەمرین

شێروانەکەم

بێ ئۆقرەیە و ماوەیەکە نەنووستووە .

-٣-

لووتکەی زەردە

ئەو سۆمایەی هەموو ڕۆژێك

خۆی لایەدا لەسەر تیشکی

زێڕینی خۆر ، چمکی پەردە

ئێستا ، چاوی کزو لێڵە

بە چوار لادا سەرنج دەدا

بەدوای بەژنی بازدا وێڵە

تەراویلکە بەدی دەکا

-٤-

کارێلەیەکی ، بەجێماو

بەردەستی تالآن نەکەوتوو ، وێڵ و داماو

لە برساندا ، هەڵدەمژێ

چڕ دووکەڵی

کێڵگەی سووتاو .

-٥-

ساوایەکی ، تەمەن منداڵ

یەك تا دوو ساڵ ، لەتەمێکی بۆن گەنیودا

لەزەویەکی ڕووت و بێ ئاوا ، کەوتووە

مژی ماچێکی درێژو هەردوو دەستی

لەگەردنی گیرکردووە

لە تەنیش و سەرچاوا
گوڵاڵە سوورە رواوە .

-٦-

باوکی ئاشتی [1] ، شێرکۆ [2]، سامان [3]
چارەنووسیان ..
نادیارە و لە قورگی نەهەنگدایە
من نازانم
ئێستا کامیان ماون و
کامیان گیانیان لەبەردایە
مژدە ، مژدە
ئەی درەختی قژ خۆڵاوی
لووتکەی شەیدا
کانی روونی ئامێز واڵا
ساوای خنکاو لە بۆن سێوا
ئەی کاریلەی بی زمانم
براکانم : کوردستانم
منی پێشمەرگەش
ئێستا لەسەنگەری لوتکەیەکدا
لە گەڵ هاورێیانی خەبات
لەسەر سێرەی چەکە چاوم
بۆ دوا رۆژی گەش دەروانم
هیوا و خەونی
ئێوەو هەموو چەوساوەکان

تین و تاون بۆ هەنگاوم

تین و تاون بۆ هەنگاوم

مژدە مژدە

بازەکانیش هێلانەی ماڵە جوتیاری

بێ سەرو شوێن نەماوە

بۆیە رەوی گەرمی خوار ژووریان

وا بێ تاوە .... هەڵدەفڕێ

یەك یەك ،دوو دوو ، سێ سێ

چاوی رۆژم کەم دەیانبینێ

بە شاباڵیان

تۆز و گەردی لقێ چڵێ

قەوزەی ، کوێر ئاوی کانی یە

رادەماڵن ، رادەماڵن

۱. ۲. ۳ سێ برای پێسمەرگەم بوون لە ئەنفالدا شەهید بوون

شیعری پارتیزان ( اکرام) رەواندز – گوندی گەرەوان [۱۲]



مەریوان/ ساڵی ١٩٨٩

لەراستەوە: مامۆستا جەلال شێخ کەریم- نەناسراوە- شەهید حەمە دوزی-
مەحمود سەنگاوی- نەقیب محەمەد- مەلا ئیبراهیم



دۆڵی خانەقا سەرەتای مانگی ١٩٨٨/٥

لەنزیکەوە بۆ دوور لای راست: جەلال جەبار- ئیبراهیم محەمەد (دیسکۆ)- لای چەپ ئەبو
قەیس پشتی لێمانە، ئیبراهیم بوقەیی- دوورەکان محەمەدی مالیە- ئەوانی تر ناناسرێنەوە



دێی ورتێ ۱۹۸۸/۵/۱۱

لەراستەوە: شەهید سالح بوقەیی- جەلال شۆراوەیی (دانیشتوە) نەناسراوە ( پشتی لێمانە )

جەلال جەبار- شەهید ئەبو قیس



دێی دەرموار ۱۹۸۸/۱/۷

لەراستەوە: صەمەد کەرکوکی- عادل شوکر- مامۆستا جوامێر – محەمەدی مالیە



مەلبەندی سێ پشتی کۆیە- ١٩٨٨/٤/٢٥

لەراستەوە: مەحمود سەنگاوی- عومەر سەنگاوی- محەمەدی مالیە ( ئەوەی جگەرە دادەگرسێنێ )

- جەلال جەبار ( پشتی لێمانە )



شاخی شێرێ ١٩٨٨/٤/٢٨

لەراستەوە: جەلال شۆراویی- محەمەدی مالیە- سالّح بوقەیی (لەدواوە)- ئیبراهیم بوقەیی



دێی ورتێ ١٩٨٨/٥/١١

لەراستەوە: شەهید سالح بوقەیی- جەلال شۆراومیی (دانیشتوە) نەناسراوە (پشتی لێمانە)

جەلال جەبار- شەهید ئەبو قیس



دێی دەرموار ١٩٨٨/١/٧

لەراستەوە: صەمەد کەرکوکی- عادل شوکر- مامۆستا جوامێر – محەمەدی مالیە



مەڵبەندی سێ پشتی کۆیە- ١٩٨٨/٤/٢٥

لەراستەوە: مەحمود سەنگاوی- عومەر سەنگاوی- محەمەدی مالیە ( ئەوەی جگەرە دادەگرسێنێ ) - جەلال جەبار ( پشتی لێمانە )



شاخی شیرێ ١٩٨٨/٤/٢٨

لەراستەوە: جەلال شۆراوەیی- محەمدی مالیە- ساڵح بوقەیی (لەدواوە)- ئیبراهیم بوقەیی



دۆڵی قاسمه رەش ١٩٨٨/٥/٢١

لە پێشەوە: شەهید ئەبو قەیس- شەهید ساڵح بوقەیی ( لای چەپ )-

ئیبراهیم بوقەیی ( لای راست )



بناری قەندیل: سەرەتای مانگی ١٩٨٨/٥

لەناوەراست: شەهید ئەبو قەیس ( لای کردۆتەوە )- لەراستەوە ئیبراهیم بوقەیی- جەلال شۆراوەیی- محەمەدی مالیە- جەلال جەبار- شەهید بوقەیی- کەریم برای مەحمود سەنگاوی



بارەگای مەڵبەندی سێ/ ١٩٨٨/٤/٢٩

لەراستەوە: کەریم برای مەحمود سەنگاوی - جەلال شۆراوەیی - ئیبراهیم دیسکۆ -
عوسمان برای مەحمود سەنگاوی



دێی کونە فلوسێ ١٩٨٨/٥/١٠

یەکەم/ ئیبراهیم بوقەیی - جەلال شۆراوەیی - ساڵح بوقەیی



دێی دەرەوار/ ١٩٨٨/١/٧

لەراستەوە: عوسمان برای مەحمود سەنگاوی- مام ساڵح- سەمەد کەرکوکی-

شەهید عومەر کوڕی مام ساڵح (ئەنفال بووە)



لەنێوان زەردەوا وتیلاشان/ مانگی ٩/١٩٩٠

رەتڵی پارتیزانەکانی گەرمیان لای راست/ شەهید ئاتیلا- نەوشیروان ئەحمەد

لەنگەری- شیخ حەمیدی- جەمیل حسین شیخ لەنگەری



**گەرمیان/ ١٩٩٠**

**لای راست: شەهید مەجید دوزی- شەهید مامۆستا یاسین- کاك مەحمود سەنگاوی- کاك عوسمان حاجی مەحمود- کاك کوردۆ قاسم- کاك سواد- سەباح شێخ حەمیدی**



**شاری سەقز ئێران/ مانگی ٢/١٩٩٠**

**رەتڵی کاك عوسمانی حاجی مەحمودو رەتڵی کاك مەحمود سەنگاویو کاك کوردۆ یان کۆری راگەیاندنی (ی.ن.ك) لای راست: شەهید مەجید دوزی- فەرهاد سەنگاوی- سەمەد سایق- جەمال مەلا ئومەری- عوسمانی حاجی مەحمود- شەهید کامەران مامۆستا هیدایەت- شەهید بابا سەید- عەلی فەقێ مستەفا- شەهید رەمەزان کولەجۆیی- سەباح شێخ حەمیدی- نەوشیروان حاجی ئەحمەد- مولازم عەباس- مەلا سەعید- جەمال شێخ حەمیدی**



لەسەر ئاوەسپی لەبەرامبەر خۆر نەوەزان- ساڵی ١٩٩٠
لای راست؛ نەوشیروان ئەحمەد- کاك مەلا سەعید- کاك کوکزی



بناری شاخی تپە گەروس/ مانگی ٤/١٩٩٠
رەتلی پارتیزانەکانی گەرمیان لای راست؛ شەهید حەمە ئاغا- نەوشیروان شێخ لەنگەری -
حەسەن ئومەرملی



کەلوەزی خۆر نەوەزان/١٩٩٠

لای چەپ کاک عوسمان حاجی مەحمود- سامان ناسراوە بەرمیس- نەوشیروان ئەحمەد



لەبناری شارباژێر ١٩٩٠

لای راست لەسەرەوە؛ جەمال شێخ حەمیدی- نەوشیروان ئەحمەد-

شەهید کامەران هیدایەت- لای راست خوارەوە- شەهید مەجید دوزی-

شەهید رەمەزان کوڵەجۆیی -- شەهید عەلی فەقێ مستەفا



لەشارباژێڕەوە بەرەو گەرمیان

لای سەرەوە: نەناسراوە- جەمال مەلا ئۆمەری- شەهید مەجید دوزی- مولازم عەباس- نەوشیروان ئەحمەد- شەهید کامەران هیدایەت- کاك عوسمانی حاجی مەحمود- کاك مەلا سەعید- لای خوارەوە: عەبە رەق- نەناسراوە- شەهید رەمەزان- جەمال شێخ حەمیدی- شەهید عەلی فەقێ مستەفا- نەناسراوە



لەگوێزێ کە ئەکەوێتە پشتی قەندیلەوە ١٩٨٩/١٠/١٩

لای راست: نەوشیروان ئەحمەد- شەهید عەلی سوور- جەمیل حسێن- ئەحمەد سوور- حەسەن کولەجۆیی



هەڤاڵ (نەوشیروان)و پۆلێك لە پێشمەرگە پارتیزانەكانی گەرمیان



ناوچەی بالایەتی/١٩٨٨

هەڤاڵ جاسم كولۆجۆیی و هاورێكانی



دۆڵی جافایەتی/ ١٩٨٨

لای ڕاست: هەڤاڵ جاسم کۆڵۆجۆیی- کاک نازم کەرکوکی-

کاک عەدنانی جیهاز- کاک عومەر بنکەیی



شاخی قەندیل/ ١٩٨٨

لای ڕاست: شەهید ئەحمەد زەرداوی- مەلا سەعید- جاسم کۆڵۆجۆیی



قاسمه رەش/ ١٥/١٠/١٩٨٨

لای راست: شەهید خەلیل بیکەیسی- حەبیب تۆپخانە-

سەلاح فەتاح- شەهید سەباح- فەریق دانیشتوە



قۆپی قەرداخ-١٩٨٥

لای راست: سەردار محەمەد -عوسمان- هەردی محەمەد



**قەندیل/ ١٩٨٨**

**لای راست: مامۆستا سۆران- حەبیب تۆپخانە- نەجم مام وەلی**



**زەردە/ ١٩٨٤**

**لای راست: حەبیب بیانی ناسراو بە ( حەبیب تۆپخانە )**

**شێخ عمین شێخ محەمەد**



گوندی یاخسەمەر/ مانگی ١٩٨٦/٤

لای راست سەرەوە: حەسەن- نوری مەسوێی- ئامیق زەنگابادی- ئەجیب زەرداوی- برایم چاوجوان- مەحمود چاڵە رەش- شەهید مەحمود زەنگابادی- عەلی گەڵاڵی:

لای راست خوارەوە: برایم یارەمەریی- مەلا عیرفان- بەکر چاوشین- شەهید مەحمود



لەکەلوەزی خورنەوەزان/ مانگی ١٩٩٠/٨

لای راستەوە: ئەوشیروان ئەحمەد شێخ لەنگەری- سەباح شێخ حەمیدی- شەهید هەڵکەوت ئەحمەد غیدان- شەهید دکتۆر ئاتیلا- حەسەن ئومەریلی



زەڵی ١٩٨٩

مەلا جەمال- مەلا رەحیم- شوکر- رەحمان- حەمە شازینی



تاهیر سابیر جومعە محەمەد ناسراو بە (مامە تەها)



١٩٨٥/١٠/٥

ئەمین عەبدولعەزیز فەقێ محەمەد ناسراو بە حاجی ئەمین



دۆڵی گوێزێ مانگی ئایار ١٩٨٨

مەلا رەحیم- مولازم عەباس- حەسەن هۆمەرملی- عوسمان مەلا جەمیل



**گوێزی حوزەیرانی ١٩٨٨**

**دانیشتوەکان: صەمەد تەختە میتایی- عەلی هۆمەرملی- حەسەن هۆمەرملی- بورهان تووکنی**

**راوەستاوەکان: مەلا رەحیم، نەناسراوە**



دەربەند دزلی ١٩٨٠ - ئێران

لەراستەوە: سەلامە رەش- شەهاب خانەقینی- مامۆستا نەجم-

محەمەد چاو جوان کفری- ئەحمەد دەکەیی



دانیشتوەکان لەراستەوە: محەمەد چاوجوان کفری- لوقمان حسێن- نازم وستا شەریف
راوەستاوەکان لەراستەوە: عەباس حاجی فارس- شەهید حسین حریتە- محەمەد چاو جواد
دووز- یوسف برای شەهید نەجات- جەلال جەبار- ئازاد حەمە تەنەکەچی... دزلی ١٩٨٨



دێی سۆفی رەحیم ژمارەیەك لە پارتیزانەکانی گەرمیان



مامۆستا نەجم لەگەڵ حەمە چاو جوان کفری

دێی گاپیلۆن ناوچەی جافایەتی



ژمارەیەک پارتیزانی گەرمیان- بلەکێ سەر بەشاری بانە

مانگی ئاب ١٩٨٩



دۆڵە ئاو    ئێران ١٩٨٩

دانیشتوەکان لەراستەوە: نازم وەستا شەریف- مامۆستا نەجم- ئەحمەد دەکەیی

راوەستاوەکان لەراستەوە: محەمەد جوان کفری- قاسم کاکەیی- حەسەن شێخ

لەنگەری- شەهید ئاتیلا- شەهاب خانەقینی- ئازاد بان سنووقی



دزلی ١٩٨٨

لەراستەوە: محەمەد چاو جوان کفری- شەهید عەلی سوور



کەلار ١٩٨٤

لەراستەوە: حەسەن عەلی جاف- شەهید قاسم وستا شەریف-

محەمەد چاو جوان کفری- نازم وستا شەریف- نەناسراوە



بێوران لای قاسمە رەش ١٩٨٨

لەراستەوە: محەمەد چاو جوان کفری- مامۆستا نەجم- ئەحمەدە سوور-

وریا شەهید ئەحمەد حاجی سەمین کفری



گوێزێ حوزەیرانی ١٩٨٨

مەلا رەحیم- حەمە رەشید تووکڵی- حەسەن هۆمەرملی-

عوسمان مەلا جەمیل- مولازم عەباس



محەمەد سەعید ئەمین

ناسراوە بە حەمە باوای

# پرۆفایلی پارتیزانەکانی (ژیلەمۆی گەرمیان )

## بەرگی پێنجەم

١- پرۆفایلی پارتیزان حەمە سۆران

ناو :سۆران غازی محەمەد

ساڵی لەدایك بوون : ١٩٦٨ کفری

ساڵی ١٩٨٤ پەیوەندی کردووە بە رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە.

ساڵی ١٩٨٨ پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کردووە.

---

٢- پروفایلی پاتیزان : هاوڕێ سوپا

ناو :هاوڕێ سوپا ، ئەبو عەلی

ساڵی لە دایك بوون : ١٩٥١ کفری

ساڵی ١٩٧٨ پەیوەندی کردووە بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی وردستانەوە.

ئێستا جێگری سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیانە .

---

٣- پرۆفایلی پارتیزان : حاجی ئەمین

ناو: ئەمین عەبدولعەزیز فقی

لەدایك بووی ١٩٦٥ قەرە حەسەن -کەرکوك

ساڵی ١٩٨١ پەیوەندی کردووە بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە

ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندی کردوە بە هێزی پێشمەرگەوە لە تیپی (٥٨) ی سەگرمە .

---

٤- پرۆفایلی پارتیزان حەمە پاریۆڵە

ناو : محەمەد عەبدولرەحمان محەمەد جوامێر

لەدایك بووی ساڵی ١٩٥٠ خورخوڕ – مەیدان

ساڵی ١٩٨٠ پەیوەندی کردووە بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە.

ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندی کردووە بە هێزی پێشمەرگەوە.

ئێستا خانەنشینە

---

٥- پرۆفایلی پارتیزان: مامۆستا نەجم

ناو : نەجم عەبدوڵلا عەباس

ساڵی لەدایك بوون : ١٩٦٥ جەلەولا

ساڵی ١٩٨١ پەیوەندی کردووە بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانەوە

ساڵی ١٩٨٣ پەیوەندی بە تیپی (٥١) گەرمیانەوە کردووە

---

٦- پروفایلی پارتیزان : مەلا رەحیم

عبدلرەحیم رەشید محەمەد

ساڵی لەدایك بوون: ١٩٦٠ – قولیجان – سەرقەڵا

ساڵی ١٩٧٨ پەیوەندی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانەوە کردووە

ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندی بە مامۆستایانی شاخەوە کردووە لە گەرمیان ؛ یەکەم قوتابخانەی لەشاخ دروست کردووە ، پاشان پەیوەندی کردووە بە تیپی ( ٥١) ەوە

---

٧- پرۆفایلی پارتیزان : شێخ حسام

ساڵی ١٩٦٩ له دایك بووه

١٩٨١ پەیوەندی به ریزەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە

ساڵی ١٩٨٨ بووه به پێشمەرگه

ئێستا له هێزی پێشمەرگه ێرینەکانی کوردستانه

---

٨- پرۆفایلی پارتیزان :

ناوی تەواوی (نەوشیروان ئەحمەد حەسەن) ه

ساڵی ١٩٦٤ لەدایك بووه .

ساڵی ١٩٨٣ پەیوەندی کردووه به کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە.

ساڵی ١٩٦٨ بووه به پێشمەرگه له گەرمیان

پلەی خوێندن : پەیمانگای تەکنیکی .

عدد جیهاز بوو له رەتلی پاتیزانەکانی گەرمیان لای ( عوسمانی حاجی مەحمود )

---

٩- پرۆفایلی پارتیزان : حەمه چاو جوان

ناوی تەواوی ( محەمەد مەحمود عەبدولکەریم ) ه.

نازناو : حەمه چاو جوان

له دایك بووی ١٩٦٢ گوندی ئۆمەرمل کفری .

ساڵی پەیوەندی کردنی بەریزەکانی کۆمەڵەوە ١٩٧٩

ساڵی پەیوەندی کردنی به هێزی پێشمەرگەی قەرەداغەوە ١٩٨٢

ئێستا خانەنشینه .

---

١٠- پرۆفایلی پارتیزان : مقداد بەهادین

ناوی تەواویی (مقداد بەهادین محی دین ) ە.

لەدایك بووی ١٩٦٦

ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندی کردووە بەهێزی پێشمەرگەی ( ی. ن .ك) .

پلەی خوێندن سێ یەمی ناوەندی .

فەرماندەی کەرت - لێپرسراوی رەتل

---

١٠- پرۆفایلی پاتیزان : نازام وەستا شەریف

ناوی تەواویی . نازم شەریف محەمەد رەحیم .

ساڵی ١٩٦٥ لە کفری لەدایك بووە .

ساڵی ١٩٨١ پەیوەندی بەکۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوەکردووە.

لەساڵی ١٩٨٣ بووە بەپێشمەرگە لە تیپی (٥١) ی گەرمیان .

دووجار بریندار بووە

لە شاڵاوی ئەنفالدا ( دایك و براو خوشك و دووبرازاو براژنی بەر ئەو شاڵاوە بەد ناوە کەوتوون .

رێکەوتی ٢٠٠٧/٧/٢ برایەکی بەناوی مقدەم ( جاسم محەمەد شەریف ) فەرماندەی فەوجی (٢) ی پاسەوانی سنوور بەدەستی تیرۆریستان شەهید بووە .

---

١١- پرۆفایلی پارتیزان مەلا سەعید

ناو : سەعید ئەحمەد محەمەد ناسراو بە( مەلا سەعید )

ئێستا سەر پەرشتیاری ئیدارەی گەرمیانە

---

١٢- پرۆفایلی پارتیزان: ئەکرەم

ناو : ئەکرەم عەلی ئەمین

ساڵی ١٩٥٦ لە دایك بووە

ساڵی ١٩٧٨ پەیوەندی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانەوە کردووە

ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندی بە تیپی (٥١) وە کردوە - کەرتی رێکخستنی دوز - کفری

## سوپاس و پێزانین :

زۆرسوپاسی هەموو ئەو بەرێزانە دەکەم کە هاوکارم بوون لە بەچاپ گەیاندنی ئەم کتێبە ..

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا :

## سەعید شاکەلی



- لە ساڵی ١٩٥٥ لە دێی (سەیدە) ی ناوچەی شاکەل لە دەڤەری گەرمیان هاتووەتە دنیاوە.
- بەشی بەڕێوەبەرایەتی تەواو کردووە لە زانکۆی سلێمانی .
- خاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ ) و گۆڤاری (دژنبشت ) و ڕوێژکاری گۆڤاری ( بانە ڕۆژ) ە
- ئەندامی کارای ڕۆژنامەنووسان و کۆمکاری زیندانە سیاسیەکانی کوردستانە
- بەم بەشەوە پێنج بەشی مێژوویی و بیرەوەری ڕۆژە سەختەکانی شۆڕش و مێژووی پڕ لە بەرخودانی گەرمیانی لە دوو توێی ژیلەمۆی گەرمیاندا بەچاپ گەیاندوو
- دامەزرێنەری بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبختنە گشتیەکانی کوردستانە .
- ئێستاش بەڕێوەبەری گشتی ڕۆشنبیری و هونەری سلێمانی و گەرمیانە ( وەزارەتی ڕۆشنبیری ).

لە جەرگەی تاریکی و خامۆشی شەوە زەنگەکان جموجۆڵی پێشمەرگە..لە جاسم دوە بۆ خەلیل ، لە مەلا ئەحمەددوە بۆ عوسمانی حاجی مەحمود لە حیسامەوە بۆ شوکر ، لە مەلا ڕەحیمەوە بۆ...بۆ.. لە ئەبەردوە بۆ بورهان لە سۆرانەوە بۆ هەموو جیهان، ئێمە چەند پێشمەرگەیەکین پاش شاڵاوی ئەنفال لەم پێ دەشت و هەردانەدا ڕێگەی مردن و هات و نەهات هەڵدەبژێرین و مردنمان لە ژیانی ژێر دەستەیی زۆر لاباشترە بەردەوام ئەبین لە خەبات و خۆ بەدەستەوە نەدان.

ئەم کاروانە لە هەردەکانی گەرمیان و پێ دەشتەکانیەوە بەرەو هەموو کوردستان بەڕێ ئەکەوێ، هەروەکو چۆن شێخی ئەمر لـە دیوەخانەکەی موحسین ئاغا دا ناوجەرگەی گەرمیاندا بانگەشەی بۆ مەملەکەتی کوردستان کرد.



2009
چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
نرخی 3000دینارە